# ڕشتەبەندی بەها باڵاکان

## یەکخواناسیی تەزکییە ئاوەدانکاری



نووسینی: فەتحی حەسەن مەلکاوی
وەرگێڕانی: ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٦٤)

فەتحی حەسەن مەلکاوی
ڕشتەبەندی بەها باڵاکان
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# ڕشتەبەندی بەها باڵاکان

## یەکخواناسی ـ تەزکییە ـ ئاوەدانکاری

نووسینی: فەتحی حەسەن مەلکاوی
وەرگێڕانی: ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# ڕشتەبەندی بەها باڵاکان

یەکخواناسی ـ تەزکییە ـ ئاوەدانکاری

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی ژمارە ( ٦٤ )

- نووسینی: فەتحی حەسەن مەلکاوی.
- وەرگێڕانی: ڕێدار ئەحمەد
- بابەت: ئاینیی
- دیزاین: ڕەوشت محەحەد.
- چاپ: یەکەم. ٢٠١٨. ناوەندی ڕینوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٢١٠ )ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.

**پێشکەشە بەمامۆستا تەها جابر عەلوانی**

وەک پێزانین و رێز چونکە لەوەوە فێربووم، کەچۆن زانا لەهەر دەرفەتێک کەبۆی بڕەخسێت دەکرێت تا دوا چرکەساتی تەمەنی فێرخواز بێت.

## ناوەرۆك

# پێشەکی

لەوانەیەکی پێشوەختە سەبارەت بە سیستەمی مەعریفەی ئیسلامی، نووسەری ئەم دێڕانە هەوڵیدا پێکهێنەرەکانی ئەم سیستەمە مەعریفییە دیاری بکات و لەم گەڕانەدا بەدوای پێکهێنەرەکانیدا ئیجتیهادی کرد لەوەڵامە ئیسلامییەکان دەربارەی پرسیارە کۆتاییەکان سەبارەت بەخودا، گەردوون و مرۆڤ، ئیجتیهادەکەی کەلەو کاتەدا خستیە ڕوو ئەوە بوو تێکڕای پێکهێنەرەکانی سیستەمی مەعریفەی ئیسلامی لەکۆتایی شیکردنەوەکەیدا لەم سێ وەڵامەو لقەکانیدا چڕ بووەتەوە:

- باوەڕبوون بەتاک و تەنهایی خودا، کەتەنها ئەو بەدیهێنەری کارڕێکخەرەو بەدیهێنان و فەرمانی بەدەستە.
- باوەڕبوون بەوەی ئەوەی لەگەردووندایە خودا دروستی کردووەو وای کردووە ئاوەدانی و ئەوەی تێیدا ڕوو دەدات بەپێی ڕێساو یاسایەکە کە تێگەیشتن و دۆزرانەوەی لەتوانای مرۆڤدا هەیەو بەپێی ڕێنوێنی خودای تاک و بێهاوتا مرۆڤ جێنشینیەتی لەئاوەدانکردنەوەیدا.
- باوەڕبوون بەوەی کە بەئاوەدانکاری گەردوون و هەڵگرتنی سپاردەی جێنشینی تێیدا لەلایەن مرۆڤەوە بەپاکژکردنەوەی دەروونی مرۆڤ و سیستەمی کۆمەڵگا بەدی دێت[1].

ئاسانە لەیەکچوون لەنێوان ئەم ڕشتەبەندە ئیمانییە و ئیجتیهادەکەی مامۆستا عەلوانی[2] لەڕوانینی بۆ ڕێنوێنی قورئانی و ئەو بنەما مەزنانەی کەئەو

---

[1] ملکاوی، فتحی. بابەتێک بوو بەسەر خوێندکارانی بابەتی پرۆگرامی توێژینەوە لەپەروەردەی ئیسلامی لەبەرنامەی ماستەری پەروەردەی ئیسلامی لەکۆلێژی شەریعەی زانکۆی یەرمووک لەخولی یەکەم ١٩٩٢-١٩٩٣ دابەشکرا.

[2] مامۆستا تەها جابر عەلوانی لەپایزی ساڵی ١٩٧٩ لەمیانی یەکێک لەسەردانە پێشوەختەکانی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناسیم، پاشان لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٧ەوە ئەوکاتەی بووە سەرۆکی پەیمانگای جیهانی فکری ئیسلامی ناسینەکەم زیاتر بوو، وەک ڕاوێژکاری ئەکادیمیی پەیمانگا لەئوردن دیاری کردم، پاش ئەوە لەئامادەبوون و نەخشەڕێژی بۆ زۆرێک لەکارە زانستیەکان لەگەڵیدا بەشداربووم کەهەندێکیان لەشێوەی پرۆژەی توێژینەوەو، ڕێکخستنی کۆنگرەو بەڕێوەبردنی خولی ڕاهێناندا بوون و، لەزۆر گەشتیشدا بۆ ئەمریکاو ئەوروپاو ئەفریقیاو ئاسیا

ڕێنوێنییە دەگرێتەوە، هەر ئەوەش وایکرد ئەوە دابڕێژێت کەناوی ناوە "ڕشتەبەندی بەها باڵادەستەکان – منظومة القيم الحاكمة-" و پێکهێنەرەکانی لەسێ چەمکی بەهاداری مەزندا دیاری بکات کە ئەمانەن: یەکخواناسی، تەزکییە و ئاوەدانی، وایدەبینێت کەئەو سێ بەهایانە پێکەوە مەرجەعیەتێکی مەقاصید بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی خوا لەبەدیهێنان و ڕشتەبەندێکی پێوەرکاری بۆیان ڕوون بکاتەوە کە تێکڕای بەها سەرەکی و ناسەرەکییەکانی لەئاییندا لێ دەبنەوە، بەڵام ئەم ڕشتەبەندەی بەها لەهەمان کاتدا گوزارشتکارە لەحەقیقەتەکانی کاروبارو ڕووداوەکانی و شتێک نییە لێیان بەدەر بێت یاخود بەسەریاندا سەپێنرابێت.

کاتێ ئەم سێ بەهایە بە "ڕشتەبەند-منظومة" دادەنێین ئامانجمان جەخت کردنەوەیە لەپەیوەندی بەتینی نێوان سێ پێکهێنەرەکەی ئەو ڕشتەبەندەو یەکتر تەواوکردنیەتی لە لەخۆگرتنی ئەو بوارەی کاری تێدا دەکات، هەرچەندە کەیەکخواناسی (التوحيد) لەبیرکردنەوەی ئیسلامیدا سەری کاروبارەکانە و کرۆکی ئەزموونی ئاینییە -بەپێی دەربڕینی خوالێخۆشبوو ئیسماعیل فاروقی- و بنچینەی بونیاتنانە لەشارسانێتی ئیسلامیدا، ئەوا بەهاکەی -لەژیانی مرۆڤدا- لەوانەیە بەداڕنینی فیکری و تێڕوانینی غەیبی سنووردار بمێنێتەوە ئەگەر تەزکییە لەدڵ و هەست و مامەڵە و شێوازەکانی ڕەفتارەکانی مرۆڤدا ڕەنگ نەداتەوە، ئەوا ئەم تەزکییە دەبێتە دونیانەویستی (زهد)یەکی نەرێنی وپاشەکشە لەژیانی گشتی، کەواتە لێکەوتە کرداریەکانی یەکخواناسی و تەزکییە

---

هاوڕێیەتیم کردووەو، زۆر ئەزموونی باش لێیەوە فێربووم، بەتایبەت لەویستی فێربوون لەهەر دەرفەتێک کەبڕەخسایە و، لێوەشاوەیی ڕەخنەیی و، کەسایەتی سەربەخۆی و، زۆر لێیەوە فێربووم، لەخودای گەورە داواکارم لەشساغی بکات و بەرەکەت بخاتە تەمەن و زانست و کاریەوە (دیارە ئەم کتێبە پێش وەفاتی دکتۆر تەها جابر عەلوانی نووسراوە، کەلەتەمەنی هەشتاو یەکساڵیدا و هەمان ڕۆژی لەدایکبوونی واتە ٣/٤ ساڵی ٢٠١٦ کۆچی دوایی کرد -وەرگێڕ-).

مامۆستا ساڵی ١٩٣٥ لەشاری فەلوجە لەعێراق لەدایکبووە، دکتۆرای لە پسپۆڕی (أصول الفقه) لەئەزهەر بەدەستهێناوەو، وەک مامۆستای زانکۆ لەو پسپۆڕیەدا وانەی وتووەتەوە، پاشان بۆ ماوەیەک سەرقاڵ بووە بەکاری گشتی لەفیکری ئیسلامیدا، دواتر گرنگی بەتوێژینەوە ڕەخنەییەکان لەزانستەکانی فەرمووده داوەو، لەساڵانی کۆتایشدا خۆی بۆ لێکۆڵینەوە قورئانیەکان یەکلا کردبووەوە، بۆ زیاتر ئاشنابوون بەژیان و کارە زانستیەکانی دکتۆر تەها جابر عەلوانی دەتوانن سەیری پێگەی تایبەت بەخۆی لەتۆڕی ئینتەرنێت بکەن بەم ناونیشانە: www.alwani.net/cv.php.

یارمەتیدەر نەبوو لەبونیاتنانی کۆمەڵگاو ئاوەدانی (عمران)ی شارستانی و بەدیهێنانی جێنشینی مرۆڤ، کە خوای گەورە بۆ ئەم جیهانە وای ویستووە.

کاتێک باس لەڕشتەبەند دەکەین، جەخت لەخەسڵەتەکانی پەیوەستی و یەکتر تەواوکاری نێوان پێکهێنەرەکانی ئەو ڕشتەبەندە دەکەینەوە، ئەگەر یەکخواناسی پێکهێنەری بنەڕەتی بێت لەسیستەمی گشتی بیروباوەڕ (النظام العام الاعتقادي)و لێکەوتە مەعریفیەکانی، ئەوا تەزکییەش نیشاندانی کرداریی کەسێتی مرۆڤ و لێکەوتە دەروونی و عەقڵیەکانی دەبێت و ئاوەدانی (عمران)ش وێنەی گشتی سیستەمی کۆمەڵایەتی (النظام الاجتماعي) و لێکەوتە ئابووری وسیاسیەکانییەتی، ئێمە لەم ڕشتەبەندەدا لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ و ئەو شێوانەی چالاکی مرۆیی کەئەنجامی دەدات کۆمان کردووەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باس لە هاوتایی نێوان پێکهێنەرەکانی ڕشتەبەندەکە ناکەین، چونکە هەندێک بنەڕەت لقی لێ دەبێتەوەو داڕشتنەوەی کەسێتی مرۆڤ بەتاک و کۆمەڵ بەئاراستەی تەزکییە و بونیاتنانی پەیوەندییەکان و سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا لەبنەمای یەکخواناسیەوە سەرچاوە دەگرێت، بەوپێیەی کە خاڵی دەستپێکی هەر بیرکردنەوە یاخود هەر کارێکەو داڕشتنەوەی کەسێتی و بونیاتنانی پەیوەندیەکانیش درەوشانەوە کرداریەکانی ئەم بنەمایەیە.

ڕاستیەکەی ئیسلام بیروباوەڕو پەرستش و سیستەمە، یەکخواناسیش بریتییە لەبنەمای یەکەمی بیروباوەڕی ئیسلامی، ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە، پایەی یەکەمیان بریتییە لە: شایەتومان (أن لا اله الا الله وأن محمدا رسول الله)، لەبەر ئەوە ئەو یەکخواناسیەی کە لەو شایەتومانەدا خۆی دەنوێنێت، بەهایەکی باڵای لەسەر دامەزراوە و تێکڕای پایەکانی دیکەش ڕێک دەخات و ئەو پایانەی تر دەکاتە هۆکار بۆ تەزکیە و پاکبوونەوە و ئەو بەرزبوونەوەیەی کەتاک و کۆی مرۆڤ پێویستیەتی.

بۆ نموونەی نوێژ هۆکارێکە بۆ ڕێگری لەخراپەو قەدەغەکراوەکان، زەکاتدانیش هۆکارە بۆ پاککردنەوەی کۆمەڵ و پاکژکردنەوەی، ڕۆژوویش هۆکارە بۆ بەرزبوونەوەی پلەی تەقوا، ئەنجامدانی فەرزی حەجیش بۆ ئەوەیە جۆرەها سوودو قازانجیان دەست بکەوێت، نەک خوا پێویستی بەشتێک بێت کە

لـه مرۆڤـی وەربگرێـت، هـەر یـەکێک لـەو پەرستشـانە لەسـەربڕینی ئـاژەڵ و پەرستشەکانی تر خێرو بێرو فەڕو تەقواکەی تەنها بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە.

ئەگـەر بـەهابالاکان پێوەری ڕێککردنـی ئـەوە بـوون کـە لەبـەها لاوەکییـەکان (قیم فرعیـة) دەکەوێتـەوە، ئـەوا دەبینین کـەڕووکاری ژیانی مـرۆڤ لـە دونیـادا لــە هــەموو بوارەکانــدا پێکــەوە گونجــاون، ئەمــەیش بــۆ ئــەوە دەگەڕێتــەوە کـە لەهـەمان سـەرچاوەوە هـاتوون، هـەروەها بەیەکـەوە لهڕەنگدانـەوە و ئـەو ئومێدەی کەدەیـەوێت لـەرۆژی قیامەتدا پێی بگـات گونجـاون، چونکـە خـوداو پێغەمبەرەکـەی خۆش دەوێت و حـەزی بـەکاری چاکەیە و هەست و مامەڵـەی لەگـەڵ خەڵکدا پـاکژ دەکاتـەوە، تـەنها خێرو خۆشـی دەوێت بۆیـان، ڕاسـتگۆ و سپاردەپارێز و بەئەمەکە و هـەموو ئاکارێکی پەسـەندی تێدایە، لەهـەمان کاتـدا، دڵسـۆزە لەکارەکەیـدا، ئـەرکی سەرشـانی بـەجێ دێنـێ، مـافی کەسـانی دی دەپارێزێت، دادپەروەرە، دژی ستەمە، تەنها بۆ خۆی ناژی و هـەواو ئارەزووی خۆی ناپەرستێ.




لەڕاستیدا ژیان لە جیهانێکی ئاوەهـادا کـە ئـەو بەهایانـەی لـەخۆ گرتبێـت، ئـەوا تەنها سەقامگیری و ئارامی دەروونـی بـۆ تاکەکانی فەراهەم ناهێنێت، بـەڵکو لەسـەر بونیـــاتی کۆمـــەڵگای مرۆڤایـــەتیش ڕەنگدانـەوەی دەبێـت و وادەکـات لـەناو خۆیدا یەکگرتوو و بەسۆزو بـەهێز بێت، خـــۆڕاگرو چەســـپاو و ڕێگـــر بێـــت لەبەرانبـەر هـەر هێزێکـدا کـە بیـەوێت لەدەرەوە بەرەنگاری ببێتەوە، مێژوو فێری کردووین کۆمەڵگا هەتا ئەو بـەهاو ئاکارانـەی پاراسـتبێت بـەتین و خـۆڕاگر بـووە لەبەرانبـەر هێرشـی دەرەکیـدا، هەوڵەکانی موژدەدەر (التبشیر)و داگیرکاری لـەمێژووی هاوچەرخدا لەبنەڕەتدا ئـەم بـەها بالایانـەیان کـرد بـووە ئامـانج، ئەمـەش بەمەبەسـتی لاوازکردنـی کۆمەڵگای ئیسـلامی لەناوەوە لـەڕێگای برەوپێدانی وێنەیـەکی دیکـەی ژیـان تـا جێگای ئەم جۆرە ژیانە بگرێتەوە، کەئەو ژیانـەش خـۆی لەدەسـتکەوتی ماددیدا

ببینێتــەوە وەک پێوەرێــک بــۆ شارســتانیبوون و پێشــکەوتن، کەســانێکیش لەکۆمــەڵگا ئیســلامیەکاندا پلــەی ســەرکردایەتیان گرتــە دەســت کەلەســەر ڕشتەبەندی بەها ئیسلامیەکان پەروەردە نەبووبون و تەنها ئەوەیان بەڕێگە چارەی بونیاتنانی کۆمەڵگا دەبینی کە لەکۆمەڵگای رۆژئاوادا بۆیان خرابووە ڕوو لەوێوە جیهانی شتەکانیان دەهێنا و لەگەڵیدا ئەوەی پەیوەست بوو پێیەوە لەجیهانی بیرکردنەوە و ئەوانەی کە ئەو فیکرانە دروست دەکات لەجیهانی کەسەکان دەیانهێنا و دیارە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا –بەپێی سروشتی خۆی- سیستەمی کارگێڕی و پەیوەندییەکان و ئەو بەها و بۆچوونانەی لەخۆی دەگرێت، لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

لەگــەڵ بڵاوبوونــەوەی ئــەم وێنــە جێگرەوانــە و پــەروەردەکردنی نــەوە تازەپێگەیشتووەکان لەسەری و پەیوەستکردنی خەونی گەنجەکان پێیەوە، ڕشتەبەندی بەهاکان کەچاوگەی بۆچوون و ئاکارەکان بوو لاسەنگ بوو تێڕوانینەکانی خەڵکیش گۆڕانی بەسەردا هات و کۆمەڵگا ناسنامەی خۆی لەدەستداو بووە شوێنکەوتەیەک کە بەشوێن سەرابێکدا لەهەڵەداواندا بوو! نە توانی بناغەیەکی شارستانیەت و پێشکەوتنێکی ماددی دابمەزرێنێ لەگەڵیدا ناسنامەو بەهاکانی بپارێزێت، نەبەو ڕادەیەش بە بەشدار بوو لەبونیات و بەدەستهێنانی شارسانیەتدا، کە پێگەی باشی لەنێو کۆمەڵگاکاندا پێببەخشێت، بەڵکوو وەک گەنجینەیەکی ئاشکرای کەرەستە سەرەتاییەکان مابوویەوە کەدزەکان لێی ببەن و بازاڕێکی کراوە بوو بۆ بەکارهێنانی کالاو بەها و سیستەمی ئەوان بەهەموو دژیەکیەکانیانەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ویست و حەزانەیان بۆ زاڵبوون بەسەریاندا.

پێدەچێت بەئاسانی بتوانین، کە سوودی کەڵەکەبووی لەسەر کۆکردنەوەی پێکهێنەرەکانی ئەو ڕشتەبەندە و گرنگیەکەی لەڕوونکردنەوەی پەیوەندی قوڵی نێوان ئەو پێکهێنەرانەدا پوخت بکەینەوە: یەکخواناسیی، تەزکییە، ئاوەدانکاری، یەکخواناسیی حەقیقەتێکی ڕەهایە، ڕامان و بیرکردنەوەو عاقڵمەندی دەمانگەیەنێت پێی و مرۆڤ لەحاڵەتەکانی سەراسیمەبوون و دوودڵی و سەرلێشێوان دەرباز دەکات، کەهەر تێڕوانینێکی دیکەی جگە لەیەکخواناسی گیرۆدەی ئەوانەمان دەکات، تەزکییەش بریتییە لە کردەی بەرزبوونەوەی

بـــەهای دەروونـــی مرۆڤایـــەتی و بـــاڵابوون و پاکژکردنـــەوەی کۆمـــەڵگای مرۆڤایـەتیی لەڕەنگـە جیاوازەکانی گەندەڵی و لادان و پاککردنـەوەی سـامان و گەشەسەندنی و دەستاودەستکردنی لـەنێوان خەڵکیدا، بەمـەش ئارامی دەروون و سـینەپاکی فەراهـەم دێـت و ئاماژەکـانی بەرپرسـیارێتی و دەسـتەبەری کۆمەڵایـەتی پتـەوتر دەکات، ئـەوەش کۆمەڵگایـەکی یـەکگرتوو و پێکـەوەگونجاو لـەبونیات و سیسـتەمدا لەسـەری دادەمـەزرێت، ئاوەدانکاریش هەوڵدانی مرۆڤـە بۆ خستنەگەڕی وزەکانی لـە بونیاتنانی ژیانێکی پڕ خێر و خۆشی، هێنانـەدی مەبەسـتەکانی جێنشـینبوونی لەسـەر زەوی و ئاوەدانکردنـەوەی و دەرهێنـانی وزەکـانی و بـەکارهێنانی بـۆ ئاسـانکردنی ڕێگـەکانی ژیـان و گەشـەکردنی شارسـتانیەتی مـرۆڤ و ڕێنـوێنیکردنی. بـەمجۆرەش ئـەم ڕشـتەبەندە لـەم سـێ پێکهێنـەرەدا تێڕوانینـی جیهـانی بـەپێی بۆچـوونی ئیسـلام لـەوەی پەیوەنـدارە بەخوداو مرۆڤ و گەردوون، تەواو دەکات.

گومـانی تێـدا نییـە کـەبیروباوەڕی ئیسـلامی وادەکـات یەکخواناسـی ببێتـە حەقیقـەتی هەرەمـەزن لـەم بوونـەدا، ئـەوەش حەقیقەتێکـە بەهاکـەی لـەخودی خۆیەوە وەردەگرێت و حەقیقەتـەکانی دیکـەی جگـە لـەم لەمـەوە وەردەگیـرێن و تێکڕای گەردوون بەفیترەت ملکەچە بۆ ویستەکانی یەکخواناسی، ئەگـەر مـرۆڤ ویستی لەگەڵ فیترەتی گەردووندا بگونجێت ئەوا دەبێت بەپەرستش خـۆی پاکژ بکاتـەوە، ڕووبکاتـە خـوای گـەورە، چونکـە تـەنها ئـەو " الـه النـاس-خواوەنـدی خەڵکـە" (پەرسـتش تـەنها بـۆ خودایـە- توحيد العبوديـة-)، هـەروەک چـۆن "رب الناس-پەروەردگاری خەڵکییە —توحيد الربوبية-" و "ملک الناس- فـەرمانڕەوای خەڵکییـە" (—توحيـد الحاكميـة-)، بابـەتی تەزکییـەش مـرۆڤ کراوەتـە جێنشـین، بەهـەمان شـێوە بابـەتی چاکسازیشـە لـەواقیعی مـرۆڤ، بـەپێی ئـەو ڕێنماییـەی پەروەردگاری بەدیهێنـەری لـەچاودێریکردنی دروسـتکراوەکانی و بـەڕێوەبردنی کاروبارەکانیـان ڕێنـوێنی بـۆ کـردوون، پاشـان تەزکییـە ئامـانج و هۆکـاری ئاوەدانییە (عمران)و دەچێتە کرۆکی بونیاتی کۆمەڵایەتی و ئاوەدانی مرۆیی.

ئەم کتێبە لەسێ بەش پێکهاتووە، لەهەر بەشێکدا باسی سێ ڕشتەبەندی بەها باڵاکان کراوە، تێیدا نووسەر لەسەر بنەمای پشتبەستن بەقورئانی پیرۆز وەک سـەرچاوەی بنـەڕەتی بەرنامەیـەکی دیـاریکراوی پـەیڕەو کـردووە

لەباسـکردنی هەریەکەیانـدا، لەگـەڵ هێنـانی چەنـد فەرموودەیـەکی پێغەمبـەر (درووودی خـوای لەسـەر بێ)، بەتایبـەت ئـەوەی لەهـەردوو صـەحیحی بوخـاری وموسـلیمدا هـاتوون، زۆر بەدەگمـەن لەکتێبـەکانی تـر فـەرموودەی وەرگرتبێت، ئەو وەرگرتنەش بەجۆرێک بووە لە واتای فەرموودەکاندا کێشە نەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا گونجاو بوو کـەئاوڕ لەهـەوڵ و کۆششـی هەندێک لـەزانایان بداتەوە لە باسکردنی ئـەو بەهایانـەدا، ئامـانج لەپشـت بەسـتن بـەقورئانی پیرۆز وەک سەرچاوەی بنەڕەتی بۆ تێگەیشتنمان لەڕشتەبەندی ئەم بەهایانە بریتییە لەجەختکردنــەوە لــەوەی کەئــەم ســەرچاوەیە بەســەو بەشــی پێوســت بــۆ خستنەڕوو چارەسەری تێدایە.

لەچەنـد جێگایەکـدا ئاماژەمـان بـۆ ئـەوە کـردووە کەئـەو سـێ بـەها باڵایـە: یەکخواناسـی و تەزکییـەو ئـاوەدانی، بناغـەی هـەموو بـەها لاوەکیـەکانی دیکـەن لـەبواری بـاوەڕ و بیروبـاوەڕو پـەروەردەی دەروونـی و بونیاتنـانی کەسـێتی مرۆیی و سیستەمی ژیانی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و سیاسـی و لەپەیوەندییە نـاوخۆیی و دەرەکیـەکانی کۆمـەڵگای موسـڵماندا، لەگـەڵ ئـەوەی کەئـەم سـێ بەهایە لەئیسلامدا بەهای باڵان، لەهەمان کاتدا بـەهای مرۆیی جیهانیشـن، ئیدی لــە بــاوەڕی بــاوەڕداران بــەخودای تــاک و تــەنهاوە ســەرچاوەی گرتبێــت کەشـوێنکەوتووەکانی پەیامـە ئاسـمانیەکانن، یـاخود لـەلۆژیکی بانگەشـەکارانی پێشـکەوتن و هەسـتانەوەی شارسـتانیەتەوە، لەسـەر ئاسـتی کۆمـەڵگاکانی مرۆڤایەتی بێت، یاخود لەمەیدانی جیهانیداو جەختکردنەوە لەخەسڵەتی مرۆیی جیهـانی ئـەم بەهایانـە ئـەوە ڕەت ناکاتـەوە، کەبەهـەر شـێوەیەک بێـت لای شوێنکەوتووانی ئایینەکانی دیکەو شارستانیەتەکان بەڕەنگی ئەو تێڕوانینانـەی کەئـەو ئـاین و شارسـتانییەتانە پشـتی پـێ دەبەسـتن ڕەنگرێـژ دەبێت، لەگـەڵ ئەوەی کە ئاییني گاورو جولەکە لەو ئایینانە دادەنرێن کەیەکخواپەرستن، لەگەڵ ئـەوەدا یەکخواناسـی تێیانـدا تێکـەڵ بـەجۆرێک لەهاوبـەش بڕیـاردان بـووەو خەسـڵەتی وا دەدرێتـە پـاڵ پـەروەردگاری مـەزن کەشـیاو بـەزاتی ئـەو نییـە، هەرچەندە هەندێک لەئاماژەکانی تەزکییەو ئاوەدانی لەشارستانیەتەکانی دیکەدا دەبینـین، لەوانـەش شارسـتانیەتی هاوچـەرخی ڕۆژئـاوا-لەوانەیـە پێویسـتی

بەچەندان ناونیشان بێت- ئەوا تیۆرە دەروونی و پەروەردەی و کۆمەڵایەتییە بڵاوەکان ئەو ئاماژانەیان بەڕەنگی لادان و لایەنگری خراپەکاری پیس کردووە.

شایانی باسە کەهەندێک لەبڕگەکانی ئەم کتێبە لەبەشی بنەما مەنهەجییە ئیسلامیەکانی کتێبی "منهجية التكامل المعرفي" خستووەتە ڕوو لەوێدا لەبواری ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوان بنەماکان (المبادیء)و بەهاکان (القیم)و خستنەڕووی یەکخواناسی و تەزکییە و ئاوەدانی وەک بنەمای باڵادەست لەبیرکردنەوەی مەنهەجی و توێژینەوەی مەنهەجی و هەڵسوکەوتی مەنهەجی خراونەتە ڕوو. بەڵام لەم کتێبەدا وەک ڕشتەبەندێک هاتووە لەپێوانەکاری لەپێکهێنانی تێڕوانینێکی هەمەلایەن کە یەکدی تەواو دەکەن لەئەنجامدانی ئەرکی جێنشینی لەسەر زەوی کە بوونی مرۆیی بەڕێوە دەبات، هەر ئەم پێوەرانە هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان بەتاک و کۆمەڵگاکانەوە ئاراستە دەکەن و شارستانییەتی مرۆڤایەتی لەلایەنە ماددی و مەعنەویەکانیەوە بونیات دەنێن و بەڕێنوێنی وەحی پەروەردگارو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ڕێنمونیان دەکەن. لێرەدا لەشێوەی چەند بەشێکی زیاتر درێژو فراواندا هاتووە کەدەگونجێت لەم کتێبەدا بیخەینە ڕوو پێشکەشی دەکەین بە مامۆستا تەها جابر عەلوانی، بەوپێیەی – ئەوەندەی ئێمە ئاگادار بین- یەکەمین کەس بووە کەئەم ڕشتەبەندەی لەسەر ئەم شێوە تەواوکارییە دارشتووە، لەگەڵ ئەوەی ئاسانە کەبەرانبەریەکی تەواو لەنێوان ئەم ڕشتەبەندە سیانییەو سێ پێکهێنەرە سەرەکیەکەی سیستەمی مەعریفی ئیسلامیدا بکەین: خودا (الله)و گەردوون (الكون)و مرۆڤ (الانسان)، هەروەک پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد. بەمجۆرە ئەو سێ بەها باڵا باڵادەستە بریتیین لە: یەکخواناسی (توحيد الله)و ئاوەدانی گەردوون (عمران الكون)و تەزکییەی مرۆڤ (تزكية الانسان).

لەڕاستیدا ڕشتەبەندی یەکخواناسی و تەزکییەو ئاوەدانی –وەک ئەوەی مامۆستا تەها جابر عەلوانی دەیبینێت- ڕشتەبەندێکی مەقاسیدییە پێش ئەوەی ڕشتەبەندێکی بەهایی (منظومة قيمية) بێت، ئەو وەک ڕشتەبەندێکی باڵادەست بەسەر هەموو ئەوەی کەدەکرێت بکەوێتە سایەی فیقهی ئیسلامی و فیکری ئیسلامی سەیری دەکات، چونکە ئەگەر وانەبێت ئەوا فیقهـ و فیکرمان ئیسلامی نابێت. مامۆستا عەلوانی بەعەقڵیەتە شەرعبینە ڕەخنەگرەکەیەوە دەیەوێت ئەم

ڕشتەبەندە دەروازەیەک بێت بۆ هەوڵەکانی بژارکاری کەلەپووری ئیسلامی لەوەی کە لە کەلەپووری شوێنکەوتووانی ئایینە ئاسمانییەکانی تر لەکاتێکی زوودا تێکەڵی بووە، پاشتریش لەکەلەپووری وڵاتانی دیکە تێکەڵی بووە. هەروەها دەیەوێت دەروازەیەکی مەقاسیدی بێت بۆ پێداچوونەوەی زانستە نەقڵیەکان و پرسە مێژوویی و جوگرافییەکان، پێش ئەوەی دەروازەیەکی بەها ئیسلامیەکان بێت لەحوکمدان بەسەر زانستە هاوچەرخەکان و هەڵسەنگاندنیاندا.

لەگەڵ ئەوەشدا قسەکانی مامۆستا عەلوانی سەبارەت بەم ڕشتەبەندە قسەکردنە لەبارەی " مەقاسیدە قورئانییە باڵا حوکمکارەکان (المقاصد القرانية العليا الحاكمة)... بەو جۆرەی کەبەهای باڵاو بنەمای حوکمکار بن، تەنها بابەتە تەکلیفیە شەرعیەکان و حوکمە بەشەکیەکان نەگرێتەوە، یاخود تەنها چارەسەری مەقاسیدەکان بکات بەوشێوەی کە دەروازەیەکی گرنگ بێت لەدەروازەکانی ئوصولی فیقە، بەڵکو ئەوە تێبپەڕێنێت بەرەو ئەوەی ببێتە ئیلهامبەخش بۆ گوتاری قورئانی لەخستنەڕووی مەبەستی ڕاستەقینەی دروستکردن (الخلق)و تێگەیشتنی ڕەفتاری مرۆیی و پەیوەندییان بەگوتاری مەقاسیدییەوە[١].

ئەو وایدەبینێت کەئەم "مەقاسیدە باڵا باڵادەستانە دەکرێت -هەروەها- یارمەتیدەر بێت بۆ گەشەسەندنی بیردۆزە مەعریفییە گشتییەکانی تێکڕای زانستە شەرعییەکان، بەهەمان شێوە لەزانستە کۆمەڵایەتییەکاندا..." [٢] هەرئەوەش هەمەکییە قورئانییە مسۆگەرکارەکانە بەخستەگەڕی تەواوی ڕشتەبەندەکانی... فیقهی و یاساییەکان و بونیاتنانەوەی کەسێتی ئیسلامی تاکی و کۆمەڵایەتی و گۆڕانی بۆ نموونەیی و نموونەی ڕێگاخۆشکار بۆ جیهانێتی ئەو ئیسلامەی بەڕێوەیە بەویستی خوا و دەرکەوتنی بەسەر هەموو ئایینەکاندا،

[١] العلواني، طه جابر. من التعليل الى المقاصد القرانية العليا الحاكمة، اسلامية المعرفة، ژمارە ٤٦ -٤٧، پایزو زستانی ٢٠٠٦-٢٠٠٧، ل٦ .

[٢] سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

چونکــه مەقاســيدە بــاڵا باڵادەســتەکان دەکرێــت بەهەموويانــەوە يــاخود بەهەندێکيانەوە بەلانی کەم ببێتە هاوبەشە مرۆييەکان[1].

لەشوێنێکی دیکەدا بەوجۆرە مامەڵەمان لەگەڵ ئەم ڕشتەبەندە کردووە [2] کەڕشتەبەندێکە لەمەقاسید و بەها و پەرەنسیب (المبادیء) لەیەک کاتدا، چونکە ئێمە لەهەر کاروبارێکدا لەخاڵێکی دیاریکراوی دەستپێکەوە دەست پێ دەکەین و لەجوڵەماندا وا پێویستە لەسەرمان مەنهەجێکی هاوسەنگ و ڕێگایەکی میانڕەوانە بگرینە بەر تا بگەینە ئەو مەبەستەی کەئامانجەو ئەو ڕووگەیەی کەدەمانەوێت پێی بگەین، بەیەکداچوون لەڕشتەبەندی ئەم سێ چەمکەدا: مەقاصید و بەهاو بنەما، بریتییە لە بەیەکداچوونی تەواوکار بەجۆرێک، کە هەریەک لەو چەمکانە دوو چەمکەکەی تر دەخوازێت، ئەمەش تەواوکارییەکی ڕێکخراوی ڕێککراوە، پێگەی هەر چەمکێک لەگەڵ دوو چەمکەکەی تر دیاری دەکات و بابەتی قسەکردن لێرەدا بریتییە لەکردە مرۆييەکان، لەکاتێکدا مرۆڤ کارێکی دیاریکراو ئەنجام دەدات، ئەوا –کاتێ دەست بەکارەکە دەکات- پێویستە پێوەرو پێودانگە باڵادەستەکانی سەلامەتی دەستپێکردن و سەلامەتی ڕۆشتن بەو ئاراستەیەو سەلامەتی مەبەستی کارەکە لەبەرچاو بگرێت، تا بگاتە ئەو ئامانجە.

لەپاڵ هەبوونی تێبینیمان سەبارەت بەیەکداچوونی نێوان مانابەخشین (دلالات)ی سێ چەمکەکە لەبەکارهێناندا، دەکرێت تێبینی لەیەکچوون بکەین لەناسناندنیاندا، چونکە ئێمە مەقاصید بەوە پێناسە دەکەین کە مەقاصیدی باڵادەستە (مقاصد حاکمة)و بەهاکانیش وا دەناسێنین کە بەهای باڵادەستن (قیم حاکمة) و بنەماکانیش بەوەی بنەمای باڵادەستن (مبادیء حاکمة)، چونکە هاوبەشن لەوەی کە کردەی مرۆڤ لەسەرەتاو ئاراستەو مەبەستیدا بەگوێرەی ئەو بێت. لەهەمان کاتدا ڕشتەبەند وا پێناسە دەکەین باڵایە: ڕشتەبەندی مەقاسیدە باڵاکان و ڕشتەبەندی بەها باڵاکان و ڕشتەبەندی بنەما باڵاکان. هیچ

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

[2] ملکاوی، فتحی حسن. منهجیة التکامل المعرفي: مقدمات في المنهجیة الاسلامیة، هیرندن: المعهد العالمي للفکر الاسلامي، ٢٠١١م.

شتێک نییە کە لەو باڵاتر بێت، هەریەکەشیان هەیانە کە لەو نزمتر بێت و لەو بوو‌بێتەوە.

لەڕاستیدا بابەتی ئەم بەشە لەبنەڕەتدا پەراوێزن لەسەر ڕوانینی دکتۆر تەها عەلوانی سەبارەت بە ڕشتەبەندی بەها باڵاکان: یەکخواناسی و تەزکییە و ئاوەدانی، کەلە زۆر نووسینیدا دووبارەی کردووەتەوە، بەڵام بەدرێژی لەسەری نەدواوە کە تینوێتی بشکێنێت. لەبەر ئەوە، دوای فەزڵی خوای گەورە، وروژاندنی ئارەزووکردنی نووسەر  بۆ بیرکردنەوەو نووسین لەسەر ئەم بابەتە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نووسەر بانگەشەی ئەوە ناکات کەبەزاری مامۆستا عەلوانییەوە بدوێت، یاخود بەپێنووسەکەی ئەو بنووسێت، یان قسەی یەکلاکەرەوەی هێنابێت، یاخود بابەتەکەی  تێر کردبێت. لێرەدا وادادەنێین دەروازەکە بەکراوەیی دەهێڵینەوە بەمەبەستی زیاتر ڕوونکردنەوەو خستنەڕوو و پێداچوونەوەو ڕاستکردنەوە، لەوانەیە گرنگترین نمونەی پێویستی لەمجۆرە چارەسەرە بەراوردکاریانە بۆ دەرشتنەوەی هەڵوێستە جێبەجێکراوەکان و هێنانی نموونەی کرداریی کە ئەرکی پەروەردەیی بەجێ دەهێنێت و خزمەتی مەبەستی فێرکاری دیکەش دەکات.

هیواخوازین کەئەم کتێبەمان پێشەکی کتێبێکی گەورەتر بێ کەلەسەر بابەتی "ڕشتەبەندی بەهاکان لەتێڕوانینی ئیسلامدا" کەلەئامادەکردندایە و تێیدا بەفراوانتر باس لە چەمکی بەهاو گرنگییەکەی و خەسڵەتەکانی و ڕیزبەندی بەهاکان بەپێی پێوەرە دیاریکراوەکانی ریزبەندیکردن دەکەین.

خوای گەورە پشتیوانەو هەر ئەو بۆ ڕێی ڕاست ڕێنوێنیمان دەکات.

**فەتحی حەسەن مەلکاوی**

**دەستپێك:**

ڕشتەبەندی بەها باڵا باڵادەستەکان، بەپێی تێڕوانینی دکتۆر تەها عەلوانی سێ بەهای بنچینەیی دەگرێتەوە، ئەوانیش: یەکخواناسی و تەزکییە و ئاوەدانکاری، ئاینی خودایی بەبێ یەکخواناسی بەدیهێنەرو تەزکییە مرۆڤی بەدیهێنراو هیچ واتایەکی نییە، تابتوانێت سپاردەی جێنشینی لەگەردوونداو ئاوەدانکاری ئەم گەردوونە و بونیاتنانی شارستانیەت تێیدا بگرێتە ئەستۆ، لەبەدیهێنەری تاك و بێهاوتایەوە سروشی بۆ هاتووەو داوای لێکراوە باوەڕ بەیەکخوایی بهێنێت و بڕیار لەسەر پەرستنی بدات و هەموو توانایەکی زانستی و کرداریی خۆی بۆ ئاوەدانکاری زەوی و پەرەپێدانی ژیانی مرۆڤ لەسەریدا بخاتە گەڕ، بەمەش مەبەستی تەزکییە دەهێنێتە دی: بەپاکبوونەوەو گەشەپێدانی دەروون و سامان و پەیوەندییەکانی.

دەتوانین لەم ڕشتەبەندە کەبەیەکخواناسی بەدیهێنەر دەست پێدەکات، پاشان بەدەروونسازی مرۆڤ و ئاوەدانکاری گەردوون، هەموو بەهاکانی دیکەی لێ وەربگرین، چونکە کاتێ مرۆڤ باوەڕ بەتاك و تەنهایی خودا دەهێنێت دەبینێت یەکخواناسی و پەرستش دووکاری تەواوکاری یەکدین، پەیوەندی ڕاستەوخۆیان پێکەوە هەیەو پێکەوە مرۆڤ وابەستەی ڕێنماییەکانی سروشی قورئان دەکەن کەتەقوادار بێت و کۆمەڵگایەکی دادپەروەر و برایەتی مرۆڤایەتی دابمەزرێنێت و ئەرکی جێنشینێتی بەجێ بگەیەنێت و هەموو تواناکانی بۆ ئاوەدانکاری گەردوون و بونیاتنانی شارستانیەت بخاتە گەڕ.

لەڕاستیدا مامەڵەکردن لەگەڵ پێکهێنەرەکانی ڕشتەبەندی: یەکخواناسی و تەزکییە و ئاوەدانی، بۆ جەختکردنەوە لەیەکتر تەواوکردنیان و پەیوەندییان بەیەکەوە، ئەوە ناگەیەنێت کەلەڕووی ئاستی بەهاو گرنگیەوە وەک یەک بن، چونکە یەکخواناسیی وەک لوتکەی هەموو کارەکانە لەئیسلامدا دەمێنێتەوە، بەهای هەوڵ و کۆششەکانی مرۆڤ لەدونیا و پاداشتی لەرۆژیی قیامەتدا بەگوێرەی ئەوە، چونکە یەکخواناسی هەردەم بناغەی ئایین بووە لای خودای گەورەو پەیامی پەروەردگار بووە بۆ تێکڕای پەیامبەر و نێردراوانی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ {الانبياء:٢٥}

واتـه: (بـەر لـە ئێـوە هـەر پەیامبـەرێکمان ڕەوانـە کردبێـت سروشـمان بـۆ ناردووە کە هیچ خوایەک نییە جگە لەمن و دەبێت هەر من بپەرستن).

لەڕاسـتیدا گـوتنی شـایەتومان: "لا الـه الا اللـه، محمـد رسـول اللـه" دەروازەی چوونـە نـاو ئیسـلامە، بـۆ دەسـتپێکردنی بونیاتنـانی " پێنج پایەکـەی ئیسـلام"و بەدیهاتنی ئیسـلام وەک: بیروباوەڕ (عقیدة)و خواپەرسـتی (عبـادة)و سیسـتەمی ژیـان و ، بـەناوەرۆکی شـایەتومانیش تـەواوی "شـەش پایەکـەی ئیمـان" دیـاری دەکرێت و گەشەی پێ دەکەن تا توانا فیکری و ویژدانییەکانی مرۆڤ بخەنە کارو دەربازی بکەن لـەکۆت وبەنـدی مـاددە، تـا لەئاسـۆکانی هاوسـەنگی نێوان ماددەو رۆحدا بـەرز ببێتـەوەو لەبەندیخانـەی دونیـا دەربچێت و لەئاسمانەکانی دونیاو رۆژی دواییدا پەرواز بکات و لەخەیالاتی بێبنەما رزگاری ببێت و بەرەو دڵنیـایی بـڕوات. لـەکاتی هاتنـەدی پێویسـتییەکانی پایـەکانی ئیمـان برایـەتی بڕوادارانـە دروسـت دەبێـت لـەبونیاتنانی یـەک ئومـەت و بەشـداری دەکـات لەرێنمونی هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ هێنانەدی جێنشینیی و ئاوەدانی.

مانابەخشینی یەکخواپەرستی تەنها لەسەر بەدیهاتنی پێویستییەکانی ئیسـلام و ئیمـان راناوەسـتێت، بـەڵکوو ئـەو دووانـە تێدەپـەڕێنێت بـەرەو پلـەی ئیحسـان، بـــەجۆرێک کـــە لەعـــەقڵ و دڵ و ئەندامـــەکانی جەســـتە لەپلـــەکانی تەزکییـە و دەروازەکـانی چاکـەوە دەسـت پـێ دەکـات تاپـاکی بکاتـەوە لـەگومانی هاوبەش بڕیاردان لەبیروباوەڕ یاخود ڕەفتاردا.

لـەم بەشـەدا هەڵوێسـتە لەسـەر بابـەتی یەکخواناسـیی دەکـەین بەوپێیـەی کەبەهایەکی مەزنی باڵادەستەو ئاماژە بـۆ شـێوەکانی یەکخواپەرسـتیی دەکـەین وەک ئەوەی لەدەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەدا باسکراون، پاشـان هـەوڵ دەدەیـن بەشـوێن ئـەو چارەسـەرە جـۆراو جۆرانـەدا بچـین کەلـەبارەی بابـەتی یەکخواناسیەوە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام هەبووە، دواتریش ئاماژە بۆ بـەهای یەکخواپەرسـتی و جێکەوتـەکانی لـەدەروونـی مـرۆڤ و ژیـانی کۆمەڵایـەتی و واقیعی مرۆڤ لەڕەهەندە مەعنەوی و مادیەکانیدا دەکەین.

**یەکەم: وشەکانی (ألفاظ) یەکخواپەرستی لەقورئانی پیرۆزدا:**

لەسەرەتای مێژووەوە ئایین دیاردەیەکی ڕەسەن بووە لەژیانی مرۆڤایەتیدا، بەڵام زانایانی ئاینە جۆراوجۆرەکان ئاستیان زۆر جیاوازە لەتێگەیشتنی ئەو گۆڕانکاریانەی کەبەسەر ئەو دیاردەیەدا هاتووەو ئەو زانایانە لەتوێژینەوە مرۆڤناسییەکانیاندا وەک گریمانە لەوەوە دەست پێدەکەن کەهەندێک هۆزی سەرەتایی لەچەند قۆناغێکی مێژوودا دەرکەوتوون و هەندێک بیروباوەڕی دیاری کراویان سەبارەت بەخواوەند بۆ خۆیان دروست کردووەو ئەو بیروباوەڕانە بەسێ قۆناغدا تێپەڕیوون کە ئەمانەن: فرە خواوەندی (تعدد الالهة) و پەسەندزانی لەنێوان خواوەندە جۆراو جۆرەکان (الترجيح بين الالهة المتعددة) و یەکخواناسی (التوحيد). لەمبارەیەوە عەباس مەحموود عەقاد وتەی زانایانی ئایینەکان دەهێنێتەوەو ئەوەیان پەسەند دەزانێت کە" قۆناغەکانی بیروباوەڕی خواوەند لەنێو خەڵکیدا ئاڵۆزە، قۆناغی هاوشێوە لەنێوان هەموو نەتەوەکان و تێکڕایی ئایینەکاندا نەبووە"[١].

بەڵام ئەو مەرجەعیەتە ئیسلامییە کەقورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر بڕیاریان لەسەر داوە یەکلاکەرەوەیە کەیەکخواناسی کرۆکی بیروباوەڕ بووە لەکاتی دروستکردنی ئادەمی باوکی ئادەمیزادەوەو لەپاش خۆی نەوەکانی ئادەم بیروباوەڕی یەکخواناسی لەیاد دەکەن و بیروباوەڕی ئەفسانەو بێ بنەما تێکەڵی بیروباوەڕیان دەبێت، سوننەتی خوای گەورەش وایە کەپەیامبەران و نێردراوان ڕەوانە بکات تا هەوڵ بدەن خەڵکی بۆ لای باوەڕبوون بەخودای تاک و بێهاوتاو پابەندبوون بەپەرستشەکانەوە بەو شێوەی بۆیان دیاریکراوە بگێڕنەوە. لەیادکردن و نەزانی لەگەڵ درێژەکێشانیدا بووە هۆی لادان لەیەکخواپەرستی ڕاستەقینە، هەروەک لەو فەرموودە صەحیحەدا دەردەکەوێت کەلەڕاڤەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا هاتووە: ﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ {نوح:٢٣}، واتە: (وتیان: دەست هەڵنەگرن لە بت و خواوەندەکانتان و واز لە (پەرستنی) ود و سواع و یەغووس و یەعوق و نەسر نەهێنن).

---

[١] العقاد، عباس محمود. الله: كتاب فى نشأة العقيدة الالهية. القاهرة: دار المعارف، الطبعة السابعة، (د،ت)، ل٣٩.

لەگــەڵ ئــەوەی ئــەو ناوانــە هــی چەنــد پیاوچــاکێکی نــەوەی نــووحن، شـوێنکەوتەکانیان پەیکـەریان بـۆ دروسـت کـردن و یادیـان دەکردنـەوە، لەگـەڵ تێپەڕبوونی کاتدا خەڵکی لەیادیان چوو ئەوانە پیاوچاکبوون و وایان لێهات ئەو پەیکەرانەیان دەپەرست"[١].

زۆرێـک لـەزانایانی ناموسـڵمانیش بەهەمانشـێوە ددان بـەوەدا دەنـێن کـە یەکخواناسـی لەئیسـلامدا بەتـەواوەتی جیـاوازە لـەوەی کەلەئایینـەکانی دیکـەدا بەیەکخواناسـی ناودەبرێت[٢]، ئیدی لەتێڕوانیانـدا بێت بـۆ خـودای تـاک، یـاخود لەڕەنگدانـــەوەکانی ئـــەو تێڕوانینـــە بەســـەر پەیوەنـــدی بەدیهێنـــەر بەبەدیهێنراوەکانەوە بێت، یاخود بەپەیوەندی خەڵک لەگەڵ یەکتریدا.

لەڕاستیشـدا نـاردنی پەیامبـەرو نێردراون بـۆ هـەموو نەتـەوەکان بەپـەیامی یەکخواپەرستیەوە لە ڕەحمەت و دادپەروەریی خوای گەورەوەیە بەخەڵکی: ﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَـا إِلَى نُـوحٍ وَالنَّبِيِّـينَ مِـنْ بَعْـدِهِ وَأَوْحَيْنَـا إِلَى إِبْـرَاهِيمَ وَإِسْـمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَـا دَاوُودَ زَبُـورًا (١٦٣) وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْـهُمْ عَلَيْـكَ وَكَلَّـمَ اللَّهُ مُـوسَى تَكْلِيمًا (١٦٤) رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُـلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٦٥)﴾، {النساء: ١٦٣-١٦٥}، واتە: (بەڕاسـتی ئێمـە نیگامـان بـۆ کـردووی وەک چـۆن نیگامـان کـرد بـۆ نـووح و بـۆ پێغەمبـەرەکانی پـاش ئـەو و نیگامــان کــرد بــۆ ئیبــراهیم و ئیســماعیل و ئیســحاق و یــەعقووب و نــەوەکانی

---

[١] لەصەحیحی بوخاریدا لەئیبن عەباسەوە (خوا لێیان رازی بێت) سەبارەت بەو فەرمایشتەی خوای گەورە لەسورەتی نوح ئایەتی (٢٣) هاتووە: "ئەو ناوانە پیاوچاکانی هۆزەکەی نووح بوون، کاتێ لەناوچوون شەیتان بەهۆزەکەی وتن: لەو شوێنانەی کۆدەبوونەوە پەیکەریان بۆ دابنێن و بەناوی ئەوانەوە ناویان بنێن، ئەوانیش وایان کرد، تا ئەو کاتەی ئەوانە لەناوچوون و ئەوە لەیاددا نەماو پەرستران". بڕوانە:

- البخاري، الامام محمد بن اسماعيل. صحيح البخاري. دمشق: دار ابن كثير، ط١، ٢٠٠١م، كتاب التفسير، باب"ودا ولا سواع ويغوث ونسرا" من تفسير سوره نوح، رقم ٤٩٢٠، ص ١٢٤٨..

[2] Moreland, J. P. and William Lane Craig. *Philosophical Foundations for a Christian Worldview***.** Downers Grove, Ill.: InterVarsity Press, 2003, p. 595. See also:

- Schwarz, John. The Complete Guide to the Christian Faith. Minneapolis, MN: Bethany House Publishers, 2001, p. 184.

یەعقووب و عیسا و ئەیووب و یونس و هاروون و سولەیمان و زەبووریشمان بەخشی بە داوود، پێغەمبەرانێک بێگومان بەسەرهاتەکانیانمان گێڕاوەتەوە بۆت لەمەوپێش، پێغەمبەرانێکیش بەسەرهاتەکانیانمان نەگێڕاوەتەوە بۆت وە خوا قسەی کرد لەگەڵ مووسا بە قسە کردن ، پێغەمبەران(مان ناردووە) کە موژدەدەرن و ترسێنەرن بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی نەبێت بەڵگە بەسەر خواوە دوای(ناردنی) پێغەمبەران و خوا هەمیشە زاڵی کار دروستە).

لێرەدا قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە ڕوونی دەکاتەوە کەهەموو پێغەمبەران یەک ئایینیان هێناوە، با شەریعەتەکانیشیان جیاواز بێت، ئەویش یەکخواپەرستییە: ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ {الاعراف٧٣،٦٥،٥٩، ٨٥و هود: ٥٠، ٦١، ٨٤و المؤمنون: ٢٣، ٣٢}.

یەکئایینیی کۆکەرەوەی خەڵکە و ئامانجی پەیامی پەیامبەران و نێردراوان بووە، پاشان ئەوانەی باوەڕێکی ڕاستەقینەیان هەیە بەخواو بەتاک وتەنهایی و سیفەتەکانی و خوایەتیەکەی، جیاوازی لەنێوان هیچکام لەنێردراوانی خوادا ناکەن و لەوەدا جیاواز نین. ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ﴾ {البقرة: ٢٨٥}، واتە: (جیاوازی ناکەین لەنێوان هیچ یەکێک لەپەیامبەرانی).

بەڵام هاوبەشبڕیاردەران بۆ خودا کەخواوەندی تری لەگەڵە، یاخود خواوەندی تر هەیە جگە لەو (پەنا بەخوا)، لەڕاستیدا ئەو نەفامی و ستەم و خۆبەگەورەگرتنەی ئەوانی تێدایەو ئەو سیستەم و بەرژەوەندییانەی بونیاتیان ناوە دڵیانی لەئاستی یەکخواناسی کوێر کردووە، ئەوەی جیا لە یەکخواناسی بانگەشەی بۆ دەکەن لەدەروونیاندا گەورە کردووە و بەوەش باوەڕهێنان پێی سەخت دەبێت بۆیان، ئەمە لەکاتێکدا کەیەکخواناسیی فیترەتێکی ڕەسەنەو لەگەڵ حەقیقەتە گەردوونییەکان و باری دەروونیدا گونجاوە. لەمبارەیەشەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ يُنِيبُ﴾ {الشورى:١٣}، واتە: (ئەو ئایینەی بۆ داناون کە فەرمانی کردووە بە نووح و ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆو ئەوەش کە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم و

مووسا و عیسا کە لەسەر ئەو ئایینە بن بە ڕێک و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەکەن زۆر قورس و گرانە بە لای هاوبەشدانەرانەوە ئەوەی ئەوانی بۆ بانگ دەکەیت خوا هەر کەسی بویَ هەڵیدەبژێرێ بۆ (موسوڵمان بوون) لای خۆی وە کەسێک ڕێنوویێنی دەکات کە بۆ لای خوا بگەڕێتەوە).

سورەتی (صمد)یش لەقورئانی پیرۆزدا هەمووی باسی تاک و بێهاوتایی خوای گەورەیە: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ(٤) ﴾ {الصمد:١-٤}، واتە: (بڵێ: ئەوە خوای تاک و تەنیایە (١) ئەو خوایەی بێنیاز و جێینیاز و ئومێدە(٢) کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووە (٣) هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای نی یە(٤)).

خوای گەورە تاک و تەنیایە "أحد"و هاوشێوەو لێکچوو هاوشانی نییە، بێهاوتاو تەنیایە، جگە لەو هاوشێوەدارە. ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾ {البقرة: ١٦٣}، واتە: (پەرستراوی ئێوە پەرستراوێکی تاک و تەنهایە هیچ پەرستراوێکی تر نییە بەتەنیا ئەو نەبێت کە بەخشندەی میهرەبانە).

﴿إِنَّمَا اللَّهُ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ {النساء: ١٧١}، واتە: (بێگومان خوا پەرستراوێکی تەنهایە).

﴿وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ {المائدة: ٧٣}، واتە: (جگە لەتەنیا خوایەک هیچ پەرستراوێک نییە). ﴿وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ {ابراهيم: ٥٢}، واتە: (تا بزانن بێگومان (خوا) پەرستراوێکی تاک وتەنهایە).

﴿فَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ {الحج: ٣٤}، واتە: (خوای ئێوە پەرستراوێکی تەنهایە).

﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ﴾ {التوبة: ٣١}، واتە: (فەرمانیان پێ نەکراوە بێجگە لەوەی کەیەک خوا بپەرستن کەهیچ پەرستراوێکی تر نییە بێجگە لەئەو). ئەو لەسەر ئەو بنچینەیە تاک و بێهاوتاویە لەزاتی خۆیداو تەنهایە لەسیفەتەکانیداو بەتەنها ئەو بەدیهێنەرەو جگە لەو بەدیهێنەری تر نییە، ئەو بەدیهێنەر (خالق)ە: تاک و تەنیایە، ڕۆزیدەرە، کارڕێکخەرە، کاروباری هەموو دروستکراوەکانی لەئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندا بەڕێوە دەبات، ڕۆزیدەر و کارڕێکخەر نییەو بەتەنها ئەو بەدیهێنەرە، بەتەنیا ئەو

پەرستراوە تاکە پەروەردگاری هەموو شتێکە، ﴿إِنَّ إِلَهَكُمْ لَوَاحِدٌ (٤) رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ (٥) ﴾ {الصافات:٤-٥}، واتە: (بەڕاستی پەرستراوی ئێوە تاک وتەنهایە (٤) پەروەردگاریئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایەو پەروەردگاری خۆرهەڵاتەکانە).

لێرە مەبەستمان ئەوە نییە هەموو ئەو ئایەتانەی بەدەربڕینێک ئاماژەی بەتاک وتەنهایی و بێهاوتایی خوای گەورە کردبێت بهێنینەوە، چونکە وشەی مانابەخشی یەکخواپەرستی ڕەها چ بەدەربڕینی ڕاستەوخۆ بێت وەک (أحد)و (واحد)، وەک لەو ئایەتانەی خستمانە ڕوو یاخود بەدەربڕینی جیاکردنەوەی زاتی خودا ﴿هو الله لا اله الا هو﴾ {الحشر:٢٢} وادەکات پێویستت بەوە نەبێ هەموو ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کەتایبەتن بەوە بکرێنە گەواهیدەر.

یەکخواناسی لەم دەقانەدا ئیدی بەمانابەخشینی وشەکە بێت یاخود واتا زاراوەییەکەی فرەیی و هاوشێوەیی و لێکچوون و هاوبەش و هاوشان بۆی رەتدەکاتەوە، لەڕووی ژمارەوە یەکە لەدروستکردن و بەڕێوەبردندا: ﴿وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ {النحل: ٥١}، واتە: (خوا فەرمووی دوو پەرستراو بۆخۆتان دامەنێن، بێگومان پەرستراوی ئێوە تەنها یەکە)، هەر ئەو دهروستی کردوون، هەر ئەویش چاودێرتانەو کاروبارتان بەڕێوە دەبات: ﴿لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ﴾، ئەو یەکەش پارچە نابێت بۆ سێ، یاخود سیان لەیەکێکدا کۆ نابنەوە: ﴿وَلَا تَقُولُوا ثَلَاثَةٌ انْتَهُوا خَيْرًا لَكُمْ إِنَّمَا اللَّهُ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ {النساء: ١٧١}، واتە: (مەڵێن (خواکانمان) سیانن (اللە-عیسا- مەریەم) کۆتایی (بەو قسەیە) بهێنن چاکترە بۆتان بێگومان خوا پەرستراوێکی تەنهایە)، ئەگەر چەند خواوەند هەبوایە، ئەوا لەهێزدا جیاواز دەبوون، لەویستیشدا وەک یەک نەدەبوون ، سەرئەنجامی ئەوەش خراپەکاری و شڵەژانی لەگەردووندا لێ دەکەوتەوە: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾{الانبياء: ٢٢}، واتە: (ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند پەرستراوێک هەبوایە جگە لە خوا بێگومان (ئاسمان و زەوی) هەر دووکیان وێران دەبوون دەی پاک

و بێگەردی بۆ خوای پەوەردگاری عەرش لەوەی بێ باوەڕان ڕەوای دەدەن بۆ خوا).

ئەگەر بەدیهێنەرێکی تر لەگەڵ خوای تاکی بێهاوتا لەبووندا هەبوایە ئەوا هەر خواوەندەو ئەوانەی بەڕێوە دەبرد کەخۆی دروستی کردبوون و بەوەش یاساو ڕێساکانی گەردوون جیاواز دەبوون، یەکیک لەو خواوەندانەش دەبوو پلەو پایەی لەوانی تر بەرزتر بێت ، دەسەڵاتیشی زیاتر، بەوهۆیەشەوە ناکۆکی وپێکدادان ڕوویدەدا، ﴿وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ {المؤمنون: ٩١}، واتە: (هیچ پەرستراوێکی تری لەگەڵدا نەبووە (ئەگەر پەرستراوی تری لەگەڵدا بوایە) ئەو کاتە هەر پەرستراوێک چی دروست کردووە (بۆ خۆی) دەبرد و هەندێکیان زاڵ دەبوون بەسەر هەندێکی تریاندا خوا پاک و بێگەردە لەوەی ئەوان دەیڵێن).

لەبەر ئەوە کاتێ بەڕێوەبردنی بوونەوەر بەشێوەیەکی سەقامگیر و ڕێکوپێک لەسایەی یەک تاکە یاسادا بەڕێوە دەچێت، ئەمە لەخۆیدا بەڵگەیە کەبەدیهێنەر و کارڕێکخەر تەنها یەکە، سەرئەنجامی دروستکردن و بەڕێوەبردن هەر بەدەستی ئەوە، پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری جیهانیان.
چەندان ئایەتیش لەسەر یەکخواپەرستی تەواو لەچەندین جێگای جیاوازی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، بۆ نمونە:

جەختکردنەوە لەیەکێتی ئایین لەچیرۆکی پەیامبەراندا، چونکە هەموو پەیامبەران و نێردراوان ئاینی یەکخواناسییان هێناوە، ئەمەش دواتر لەباسێکی گشتگیر سەبارەت بەپەیامبەرو نێردراوان باسکراوە، وەک لەم فەرمایشتەدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ {الانبیاء: ٢٥}، واتە: (ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر نیگامان بۆ ناردبێ (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێک نی یە کەواتە تەنها من بپەرستن).

هەروەها لە بابەتی حەقیقەتی یەکخواپەرستیشدا کە بەهەمان دەربڕین هەموو پەیامبەران هێناویانە، وەک ئەوەی لەسورەتی (الاعراف) سەبارەت بەنووح و هود و صالح و شوعەیب هاتووە: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ

اعْبُـدُوا اللَّهَ مَـا لَكُـمْ مِـنْ إِلَهٍ غَـيْرُهُ﴾ {الاعراف: ٥٩}، واتـه: (سوێند بەخوا ئێمە نووحمان ڕەوانە کرد بۆ لای گەلەکەی وتی : ئەی گەلەکەم تەنها خوا بپەرستن ئێوە هیچ پەرستراوێکتان نییە بێجگە لەو).

﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ {الاعراف: ٦٥}، واتـه: (ناردمـان بـۆ لای گـەلی عـاد براکـەیان کـە هـوود(پێغەمبـەر) ە فـەرمووی : ئەی گەلەکەم بەتەنها خوا بپەرستن هیچ پەرستراوێکتان نییە بێجگە لەو).

﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُـمْ مِـنْ إِلَهٍ غَـيْرُهُ﴾{الاعـراف: ٧٣}، واتـه: (بـۆ گـەلی سـەمودیش صـاڵحی برایانمـان نـارد فـەرمووی : ئـەی گەلەکەم خوا بەتەنها بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی ترتان نییە).

﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِـنْ إِلَهٍ غَـيْرُهُ﴾{الاعـراف: ٨٥}، واتـه: (بـۆ گـەلی مەدیـەنیش شـوعەیبی برایانمـان نـارد فـەرمووی ئـەی گەلەکەم بەتەنها خوا بپەرستن هیچ پەرستراوێکتان بێجگە لەو نییە).

هەمان دەربڕین هاتووە: ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾، سێجاری دیکـەش لەسـورەتی (هـود)دا ، دووجـاریش لەسـورەتی (المؤمنـون)دا، چەنـدین جـاریش لەسورەتەکانی دیکەدا بەدەربڕینی نزیک لەوە هاتووە.

ئیدانەکردنی هاوبەشبڕیاردان بۆ خودای بێهاوتا و سـەلماندنی بەڵگـە بەسـەر هاوبەشبڕیاردەران کاتێ کەئاماژە بۆ مـەزنێتی دروسـتکراوەکان و ڕێکوپێکی و تەواوی دیاردەو کاروبارەکان دەکات: ﴿أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ لَكُـمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنْبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُنْبِتُوا شَـجَرَهَا أَءِلَهٌ مَـعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ (٦٠) أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَـارًا وَجَعَـلَ لَهَـا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَءِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (٦١) أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْـطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَءِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَا تَـذَكَّرُونَ (٦٢) أَمَّنْ يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَنْ يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَءِلَهٌ مَـعَ اللَّهِ

تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٦٣)﴾ {النمل: ٦٠-٦٣}، واته: (ئايا زاتێک کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە لە ئاسمانەوە بارانی بۆ ناردوون ئینجا بەو (بارانە) چەند باخچەیەکی جوانمان ڕواند کە ئێوە نەتاندەتوانی درەخت و ڕواوی ئەو (باخچە) بڕوێنن ئایا هیچ پەرستراوی تر لەگەڵ خوادا هەیە نەخێر نییە بەڵام ئەوانە گەلێکن لە ڕێگای ڕاست لادەدەن. ئایا زاتێ کە زەوی کردووەتە جێگای ئارامی و نیشتەجێ بوون و لەناو (زەوی) دا چەند ڕووباری بەدیهێناوە و چەند چیای گەورەی بۆ زەوی داناوە و لە نێوان دوو ئاودا (شیرین و سوێر) بەربەستی داناوە (بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبن) ئایا هیچ پەرستراوی تر هەیە لەگەڵ خوادا، نەخێر نییە، بەڵام زۆربەیان نازانن. ئایا زاتێ کە دێت بە هاواری ناچارو داماوەوە کاتێ هاواری لێ دەکات وە ناخۆشی و بەڵاکان لادەبات و دەتانکاتە جێنشینی گەلانی تری سەر زەوی، ئایا پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا (نەخێر نییە) بەڵام زۆر کەم بیردەکەنەوە. ئایا زاتێ کە ڕێنموونیی ئێوە دەکات (بە ئەستێرەو شتی تر) لە تاریکی یەکانی وشکانی و دەریادا (لە شەودا) و زاتێک کە با دەنێرێت بە موژدەدەر پێش بارانی ڕەحمەتی ئایا هیچ پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا، خوا بەرزو بڵندترە لەوەی بتپەرستان دەیکەنە هاوبەشی).

- بەیەکەوەبەستنی یەکخواناسی و تایبەتکردنی خوایەتی تەنها بە (اللە) لەکاتی ئاماژەدان بەناو و صیفەتەکانی خوای گەورە: ﴿**اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى**] {طه:٨}، واتە: (خوا (ئەو زاتەیە) کەپەرستراوێکی تر نییە جگە لەئەو تەنها بۆ ئەوە ناوە هەرە جوانەکان).

﴿وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ {المائدة: ٧٣}، واتە: (هیچ پەرستراوێک نییە جگە لەتەنها خوایەک).

﴿لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾ {البقرة: ١٦٣}، واتە: (هیچ پەرستراوێکی تر نییە جگە لە کەبەخشندەی میهرەبانە).

﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ {البقرة: ٢٥٥}، واتە: (خوا ئەو خوایەیە کەهیچ پەرستراوێکی (ڕاست) بێجگە لەو هەمیشە زیندووی تەدبیرکارو ڕاگری (بوونەوەرە) نییە).

﴿لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ {ال عمران: ٦}، واتە: (پەرستراوێکی ڕاست نییە تەنها ئەو نەبێت، زاڵی کار بەجێ یە).

﴿لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ {الاعراف: ١٥٨}، واتە: (هیچ پەرستراوێک نییە جگە لەو دەژێنێت و دەمرێنێت).

﴿لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾{المؤمنون: ١١٦}، واتە: (هیچ پەرستراوێک نییە جگە لەو کەپەروەردگاری عەرشی بەرزو بەڕێزە).

﴿وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ {ص: ٦٥}، واتە: (هیچ پەرستراوێکی تر نییە بێجگە لەخوای تەنهای بەدەسەڵات).

زۆرێک لەزانایانیش ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیان کردووەتە بەڵگە بۆ سێ جۆر لەیەکخواپەرستی، جۆری یەکەمیان: (توحید الربوبیة) بەو واتایەی کەخوای گەورە پەروەردگاری جیهانیانە، هەر ئەو بەتەنها بەدیهێنەرو کاربەڕێکارو کار ڕێکخەرە، ژیان و مردنی بەدەستە، نموونەکانی وەک ئەم ئایەتانە: ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾{الاعراف: ٥٤}، واتە: (بەدیهێنان و فەرماندان هەر بۆ خوایە پاک و بێگەردە (لەهەموو کەم و کورییەک) خوای پەروەردگاری جیهانیان).

جۆری دووەمیشیان (توحید الالوهیة)، بەو واتایەی کەباوەڕت بەوە هەبێ کەتەنها خوا شایستەی پەرستنەو ملکەچی و گوێڕایەڵی تەنها بۆ ئەوەو پاڕانەوەو داواکاری تەنها لەو دەکرێت ، تەنها پشت بەو دەبەسترێت ، خۆشەویستی بۆ ئەوە... نموونەی ئەو ئایەتانەش: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾{الانبیاء: ٢٥}، واتە: (ئێمە پێش تۆ هیچ

پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراوێک نییە کەواتە تەنها من بپەرستن).

جۆری سێهەمیشیان: (توحید الاسماء والصفات)، بەو واتایەی باوەڕت بەوە هەبێت کەخوا هەموو سیفەتەکانی تەواومەندی تێدایە، دوورە لەهەموو سیفەتەتێکی ناتەواوی ، بەتەنها ئەو بەسیفەتەکانی لەتێکڕای دروستکراوەکان جیایە، بەو سیفەتانەی لەناوەکانی و سیفەتەکانی کەوەسفی خۆی پێ کردووەو ئەو سیفەتانەی کەپێغەمبەرەکەی (درودی خوای لەسەربێ) وەسفی پێ کردووە، بەدەر لەهەر زیادو کەمکردنێک، بێ هاوشێوەو ، پێچواندن و بەرجەستەکردن و لەکارخستن و لادان.... نموونەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: ﴿لَـيْسَ كَمِثْلِـهِ شَيْءٌ وَهُـوَ السَّـمِيعُ الْبَصِـيرُ﴾ {الشورى: ١١}، واتە: (هیچ شتێک بەوێنەی خوا نییە، ئەوە بیسەری بینایە).

دەتوانرێت ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەهەر کاروبارێکی ئاییندا بکرێتە گەواهیدەری درەوشانەوەکانی یەکخواپەرستی، یاخود ئەو ئومەتەی کەشوێنکەوتەی ئەو ئاینەیە، بۆ نموونە قورئانی پیرۆز جەخت لەوە دەکاتەوە کەیەکخواپەرستی یەکبوونی ئومەتی ئیسلام پێویست دەکات، چونکە یەکبوون خەسڵەتێکی ڕەسەنی ئومەتی ئیسلامە و یەکێکە لەفەرزەکانی ئایین: ﴿إِنَّ هَـٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ {الانبیاء: ٩٢}، واتە: (بەڕاستی ئا ئەمەیە ئایینی ئێوە کەیەک ئایینە (ئایینی هەموو پێغەمبەران)و منیش پەروەردگارتانم کەواتە تەنها من بپەرستن). بەمەبەستی یەکبوونی ئەندامانی ئەم ئومەتە پێویستە ئەو یەکخەرەی هەمووان هەبێت. بەڵام قورئان –بەدیاریکراوی لەم ئایەتەدا- یەکبوونی ئومەتی لەپەرستنی خودای پەروەردگاری بێهاوتادا کۆ کردووەتەوە. پەرستنیش لێرەدا واتایەکی گشتی دەگەیەنێت کەتێیدا خەسڵەتی چاکەکاری (الاحسان) لەهەموو کارێک کەمرۆڤ پێی هەستێت دێتە دی: ((أن

تعبد الله كأنك تراه، فإن لم تراه فإنه يراك))[1]، واته: بەوجۆرە خوابپەرستە کەدەیبینیت، ئەگەر تۆ ئەو نابینیت، ئەوا ئەو تۆ دەبینێت.

بەڵام یەکبوونی ئومەت، بەو واتایەی ئایینی ئیسلام مەبەستیەتی دەبێت بەشێک بێت لەیەکبوونی مرۆڤایەتی بەهەموو ڕەنگ و ڕەچەڵەکەکانیانەوەو ئەم یەکبوونە لەیەکبوونی بنەڕەت و سەرهەڵدانی ئادەمیزاددا دەردەکەوێت، چونکە خودای گەورە، پەروەردگاری هەموو ئادەمیزادە، تاک و بێهاوتایە: ﴿إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَاحِدٌ﴾ {الصافات: ٤}، ئەو خوایە تەنیاو بێهاوتایە دروستکردنی ڕەگەزی مرۆڤی لەیەک نەفس دەست پێکردووە، ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً﴾ {النساء: ١}، واتە: (ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە(سزای) پەروەردگارتان ئەوەی کە دروستی کردوون لەیەک کەسەوە (کەئادەمە)هەر لەئەویش هاوسەرەکەی دروست کردووەو لەو دووانە پیاوان وئافرەتانی زۆری خستۆتەوەو بڵاوکردۆتەوە).

لەم یەکبوونە یەکسانە تەواومەندەی نێوان مرۆڤەکان لەرێزو کەرامەتیاندا، یەک چارەنووسیشی لێ دەکەوێتەوە، کەگەڕانەوەیە بۆلای خوا: ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ مَرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ {الزمر: ٧}، واتە: (پاشان گەڕانەوەتان بۆلای پەروەردگارتانە، ئەوسا هەواڵی هەموو ئەو کاروکردەوانەتان پێدەدا کەئەنجامتان دەدا، چونکە ئەو زاتە زانایە بەهەموو ئەو شتانەی لەسینەو دڵ ودەروونەکاندا حەشار دراون).

---

[1] البخاری، صحیح البخاری، سەرچاوەی پێشوو، کتاب الایمان، باب سؤال جبریل النبی (صلی الله علیه وسلم) عن الایمان والاسلام والاحسان، فەرموودەی ژمارە ٥٠، ل٢٣، هەروەها پێشەوا موسلیمیش لەصەحیحەکەیدا هێناویەتی، بڕوانە:

- مسلم، الامام مسلم بن الحجاج. صحیح مسلم، الریاض: بیت الافکار الدولیة، ١٩٩٨، کتاب الایمان، باب الایمان والاسلام والاحسان، فەرموودەی ژمارە ٩، ل٣٧.

یــەکبوونی مرۆڤایــەتی لــەدونیادا بەســتراوەتەوە بەیــەکبوونی ژیــانی ئادەمیزادەکانەوە، هەروەک چۆن چرکەساتی دەستپێکی ژیانی ئادەمیزاد لەسەر زەوی هەبووە، بەهەمان شێوەش چرکەساتی کۆتایشی هەیە لەگەڵ کۆتایهاتنی ئـەم ژیانـەو دەسـتپێکردنی ژیـانی قیامـەت، لـەنێوان ئـەو دوو چرکەساتەشـدا مرۆڤانێـک لـەدایک دەبـن و ژیانیـان دەسـت پێـدەکات ، کەسـانێکیش دەمـرن و ژیانیان کۆتـایی دێت: ﴿وَاللَّهُ يُحْـيِ وَيُمِيـتُ﴾ {ال عمـران: ١٥٦}، واتـە: (هـەر خـوا ژیــان بەخشــەو مرێنــەرە). لای خــوای گــەورە هــەموو ئومــەتێک ئاکــامێکی دیاریکراوی هەیە، هەموو کەسێکیش ئاکامێکی دیاریکراوی هەیـە: ﴿إِنَّ أَجَـلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ {نوح: ٤}، واتە: (بێگومان کاتی دیاریکراوی خـوا کەدێت، بەهیچ شێوەیەک دواناکەوێت ئەگەر بتانزانیایە).

چونکـە یــەکبوونی ژیــان، شــوێنەوارێکی پرشــنگدانەوەی ئــەو یەکبوونەیــە کەخاوەنی ژیان هەیەتی، پاکی و بێگەردی بۆ خوا.

بـەڵام یـەکێتی ڕاسـتەقینە ئـەو بناغەیەیـە کەبیردۆزەی مەعریفـە لـەتێڕوانینی ئیسلامیدا لەسەری دادەمەزرێت، خـوای گـەورەش ئـەو حەقەیـە، ئـەویش یەکـەو تەنیایە، لەبەر ئەوە حەقیقەت نابێتە چەند دانەیەک، حەقیقـەتیش لەشـتەکانی ئـەم جیهانــەدا بەشــاراوەیی هەیــە، خــوای گــەورە بەســروش لەبەشــێکی ئاگادارمــان دەکات و فەرمانمان پێدەکات کەبیدۆزینـەوە، هەمیشـە ئـەوە دەبینـین کەسـروش بۆ هیچ شتێک نایەتە خـوارەوە، یـاخود بـۆ کارێـک بەشـێوەیەک جیـاواز بێـت لـە حەقیقەتە واقیعیەکەی، کەخوای بەدیهێنەری حەقیقەتەکان بـەدیهێناوە. یاسـاکانی سروشتیش بریتین لە سوننەتەکانی خوای گەورە لەدروستکراوەکانیدا، خـوای گـەورە لەبارەیانـەوە دەدوێـت، هەیانـە خـوای گـەورە بـۆ ڕامـان و بیرکردنـەوە دەیخاتـە ڕوو هەشـیانە داوامـان لێدەکات بیدۆزینـەوەو دایبڕێژینـەوە، لـەکۆتایی گەڕانەکەشـماندا وەک چــوون یەکییــەکی لــۆژیکی و کرداریــی تــەواو لــەنێوان ئەوەی وەحی داوای دۆزینەوەی دەکات لەگەڵ ئەوەی دەدۆزرێتـەوە هەیـە. ئـەم وەک یەکبوونەش بریتییە لـەوەی کەگوزارشـتی پێدەکـەین لـە یـەکێتی حەقیقـەت،

کەئەوە ڕەتدەکاتەوە دژیەکی هەبێت لـەنێوان حەقیقەتـە واقیعیـەکان و دەقـەکانی وەحیـدا، یـاخود لـەنێوان ئـەوەی عـەقڵی مـرۆڤ ئەیدۆزێتـەوە لەگـەڵ دەقـەکانی وەحیدا، هەروەها دەروازە بۆ دووبارە تێگەیشتنی مرۆڤ بەدەرکەوتنی بەڵگـەی نوێ بەوالآیی دەمێنێتەوە هەتا بەڵگەکانی یەکێتی مەعریفە جێگیر دەبێت.

دەگەڕێینـــەوە بـــۆ درێـــژەدان بەباســـکردنی هەنـــدێک لەدرەوشـــانەوەکانی یەکخواناسیی لەبوارەکانی ژیانی خێزانـی و کۆمەڵایـەتی و سیاسـی و ئـابووری و زانسـتی و هونـەری... بـۆ ئەمـەش لەئایەتـەکانی قورئـانی پیـرۆزەوە دەسـت پێدەکەین، کاتێ هەندێ کتێب دەخەینـە ڕوو کەباسـیان لەیەکخواپەرسـتیی وەک بابەت و یەکخواپەرستی وەک زانست کردووە، بەتایبـەتی ئـەو درەوشـانەوانەی کە خوالێخۆشـبوو فـاڕووقی لەکتێبەکەیدا سـەبارەت بەیەکخواپەرسـتی و شـێوە دەرکەوتنەکانی لەفیکرو ژیاندا خستویەتییە ڕوو.

گومـانی تێدا نییـە کـە بـوونی پەیوەنـدی بەدیهێنـەری تـاک و بێهاوتـا لـەدڵی مرۆڤ و عەقڵیدا، کەخوای خۆش دەوێت و فەرمانەکانی بەمەزن وەردەگرێت و گوێڕایـەڵی شـەریعەتەکەی دەبێـت، بەرهەمـدار دەبێـت لەڕێکخسـتنی هەسـت و ویســت و ئارەزووەکــانی مــرۆڤ و هۆکارەکــانی جیــایی و بەشبەشــبوون و ئاشـووب لـەنێوان باوەڕدارانـدا ناهێڵێت، پاشـان نـەوەکانی ئـەم ئومەتـە لەسـەر بیروباوەڕی یەکخواناسیی کۆدەبنەوەو لەسەر ئەم بنچینەیە دەکرێت لـەواقیعی هاوچەرخی ئـەم ئومەتـە تێبگـەین کەلەئێسـتادا لاوازو بەشـبەش و پەرتەوازەیە، کەئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەئـەم ئومەتـە لەپەرستشـیدا گیـرۆدەی ناتـەواوی بووە و ڕەحمەت و سۆزی خوای گەورە بۆ ئـەم ئومەتـە دانابـەزێت بەیـەکبوون و پێکـەوەبوونی تـا ئەوکاتـەی پەرسـتش و تـەقوای تێدا دێتـە دی: ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ (١١٨) إِلَّا مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ﴾ {هود: ١١٨-١١٩}، واتە: (بەردەوامیش ئەو خەڵکە لـەنێوانی یـەکتردا لـەئایین و بەرنامـەو بۆچوونـدا جیـاوازن ، مەگـەر ئـەوەی بەزەیی پەروەردگارت گرتبێتیەوە).

**دووەم: وشەکانی یەکخواناسیی لەسونەتەکانی پێغەمبەردا :**

بەهەمان ئەو شێوەیەی مامەڵەمان لەگەڵ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کرد، لێرەشدا هەموو ئەو فەرموودانە ناهێنینەوە کەتێیاندا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ یەکخواناسی کراوە، هێندە بەسە کەهەوڵی هەندێک لەزانایانی فەرموودەناس لەچۆنیەتی مامەڵەیان لەگەڵ دەقەکانی ئەو فەرموودانەی تایبەتمەندن بەیەکخوداناسی بخەینە ڕوو. پێشەوا بوخاری لەسەحیحەکەیدا کتێبێکی تایبەت کردووە بەیەکتاپەرستی، سەدو نەودو سێ فەرموودەی لەخۆ گرتووەو بەسەر پەنجاو هەشت دەروازەدا دابەشی کردووە، ئەوەی جێی ڕامانە پێشەوا بوخاری کتێبی یەکخوداناسی "کتاب التوحید"ی کردووەتە کۆتا کتێب لەصەحیحەکەیدا کەنەوەدو حەوت کتێبی لەخۆ گرتووە[1].

بەڵام پێشەوا موسلیم کتێبی تایبەت نەکردووە بەیەکخوداناسی، بەڵکو کتێبی یەکەمی لەصەحیحەکەیدا ناولێناوە: کتێبی باوەڕ (کتاب الایمان)، ژمارەیەک لەو فەرموودانەی کەپێشەوا بوخاری لەکتێبی یەکخواناسیدا هێناویەتی لەم بەشەی کتێبەکەی پێشەوا موسلیمیشدا هەیە، سەبارەت بەفەرمووده هاوبەشەکانی دیکەش کەلەم کتێبەی صەحیحی موسلیم و کتێبی یەکخواناسی بوخاریدا هەیە، پێشەوا موسلیم ئەو فەرموودە هاوبەشانەی دیکەی لەکتێبی دیکەیدا هێناوە، بەتایبەت کتێبی زیکر و پاڕانەوە (کتاب الذکر والدعاء)[2].

پێشەوا بوخاری لەکتێبی یەکخوداناسیدا فەرموودەی هەمەجۆری لەبابەتەکانیدا هێناوە، زۆربەی دەروازەکانی دیکەش فەرموودەی تێدایە کەپەیوەندار بێت بەناوو سیفەتەکانی خوای گەورەوە، بەڵام دەروازەکانی تر فەرموودەکانی زیاتر بابەتی بیروباوەڕ (عقیدە)ی لەخۆ گرتووە، وەک قەدەر، ویست و ئیرادە، بابەتەکانی غەیب و ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە و ئەو

---

[1] البخاری، صحیح البخاری، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٢٠-١٨٦٩.

[2] الامام مسلم، صحیح مسلم، سەرچاوەی پێشوو.

بابەتانەی پەیوەنددارن بەقورئانی پیرۆزەوە لەڕووی تیلاوەو تەفسیری هەندێک لەئایەتەکانیەوە، وادیارە کە بوخاری –ڕەحمەتی خوای لێ بێ- بەهۆی بوونی یەک وشە لەفەرموودەیەکدا کە ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ پەیوەست بووایە بەیەکخواناسیەوە لەدەروازەیەک لەدەوازەکانی یەکخواناسیدا پۆلێنی دەکرد، ئەمە لەکاتێکدا کەبابەتی فەرموودەکە بەگشتی دەکرا لەکتێبێکی تردا بووایە جیا لەیەکخواناسی، وەک کتێبی فەزڵەکانی قورئان، یاخود کتێبی تەفسیری قورئان. هەندێک فەرموودەی کتێبی یەکخواناسی بەهۆی دانرانیان لەو شوێنەدا تێگەیشتنیان ئاسان نییە، مەگەر تەئویلێکی دووری بۆ بکرێت تا ئەوواتایە بگەیەنێت.

هەروەک چۆن قورئان بابەتی یەکخواناسی بەجۆرێک یەکلادەکاتەوە کەئامانجی هەموو پەیامەکانی خودا بووە بۆ تێکڕای خەڵک، فەرموودەکانی پێغەمبەریش بەهەمان شێوەن، بەجۆرێک کەناسینی خودای گەورە بەحەقیقەت و تاک و تەنهایی دەکاتە یەکەم ئەرکی سەرشانی مرۆڤ لەژیانیداو یەکەم بانگەشەی خەڵک بۆ لای ئایین، فەرمودەکەی مەعازیش –خوا لێی ڕازی بێ- کاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ناردی بۆ یەمەن، یەکلاکەرەوەیە لەڕوونکردنەوەی ئەم واتایەدا. ئەو فەرموودەیە بەسێ گێڕانەوە لای پێشەوا بوخاری و دوو گێڕانەوە لای پێشەوا موسلیم هاتووە، کەهەموویان یەکدی تەواو دەکەن، ئێمە یەکێک لەگێڕانەوەکانی بوخاری هەڵدەبژێرین، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێت: {**إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ من أهْلِ كِتَابٍ فَلْيَكُنْ أوَّلَ مَا تدْعُوهُمْ إِلَى أن يوحدوا اللَّه تعالى، فإِذَا عَرَفُوا ذلك، فأَخْبِرْهُمْ أنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فإِذَا صلُوا فأَخْبِرْهُمْ أنَّ اللَّهَ افتَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً فِي أمْوَالِهِمْ، تؤخذ من غنيهم فترَدُّ عَلَى فُقَيرَهِمْ، فإِذَا أقروا بذلك، فخُذْ مِنهُمْ، وَتوَقَّ كَرَائِمَ**

**أمْـوَالِ النَّـاسِ**} (١)، واتــه: {تــۆ بەکەســانێک دەگــەیت کەشــوێنکەوتەی پەیامــه ئاسمانیەکانن، یەکەمجار بانگیـان بکە بۆ شـایەتمان (**أشْهَدُ أنْ لـا إِلَـهَ إِلّـا اللّـهُ وأنّـي رَسُولُ اللّهِ** )، ئەگەر ئەوان بەدەمتەوە هـاتن ئـەوا تێیـان بگەیەنـه کەخودا لەشـەوو ڕۆژێکـدا پێنجـار نـوێژی لەسـەر فـەرز کـردوون، ئەگـەر گوێڕایـەڵت بـوون بـۆ ئــەوەش، ئــەوا تێیــان بگەیەنــه کــەخوا زەکــاتی لەســەر فــەرز کــردوون کەلەدەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و دەدرێتە هـەژارەکانیان، ئەگـەر ئەوەشـیان ئەنجامدا، ئەوا نەکەیت ماڵە بـەنرخ و گران بـەهاکانیان لێ وەربگریت}، ئەمـەش مانای وایە کەباوەڕبوون بەیەکخوداناسی ڕازیبوون بەئەرکی پەرستش ئاسانتر دەکات، چونکە ناوەرۆکی بانگەشە بۆ لای خـوا لەبانگکردنـەوە بۆ یەکخواناسـی دەست پێدەکات.

---

(١) البخـاری، صـحیح البخـاری، سـەرچاوەی پێشـوو، کتـاب التوحید، بـاب ماجـاء فی دعـاء النبی (صلی اللـه علیـه وسلم) امتـه الی توحید اللـه تبـارک وتعالی، فـەرموودەی ژمـارە ٧٣٧٢، ل ١٨٢٠، بەهەمان شێوە پێشەوا موسلیمیش لەصەحیحەکەیدا هێناویەتی، بڕوانە:

- الامـام مسـلم، صـحیح مسـلم، سـەرچاوەی پێشـوو، فـەرموودەی ژمـارە ١٩، بـاب الـدعاء بالشهادتین وشرائع الاسلام، ل٤٢.

## هەندێک شێوازی گوزارشتکردن
## لەیەکخواناسی لەقورئانی پیرۆزدا

١- دەربڕینە ڕاستەوخۆکانی یەکخواناسی:

(الاحد) و(الواحد)و (الأحدية): وەک ﴿اللَّهُ الْوَاحِدُ﴾، ﴿إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾، ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾، ﴿وَهُوَ الْوَاحِدُ﴾، بەمشێوەیە (٢١) جار هاتووە.

٢- ماناکەی یەکخواناسی بگەیەنێت:

﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ﴾، ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنْتَ﴾، بەم شێوازەش (٣٧) جار هاتووە.

٣- ڕەتکردنەوەی فرەیی: ﴿لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ﴾، ﴿وَلَا تَقُولُوا ثَلَاثَةٌ﴾، ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾.

٤- ڕەتکردنەوەی هاوبەشبڕیاردان:

﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِنْ شِرْكٍ﴾، ﴿لَا شَرِيكَ لَهُ﴾، بەم شێوازەش (٦) جار هاتووە.

٥- ناوە جوانەکان و سیفەتە تەواومەندەکان:

﴿عَالِمِ الْغَيْبِ﴾، ﴿غَافِرِ الذَّنْبِ﴾، ﴿رَبِّ الْعَرْشِ﴾، ﴿خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾، ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ﴾، ﴿أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ﴾، ﴿مَالِكَ الْمُلْكِ﴾، (نمونەی لەم شێوازە زۆرە زۆرە).

٦- پاکو بێگەردی (التنزيه):

پاک و بێگەردبوونی خودای گەورە لەهەر ناتەواوی یاخود هاوشێوەیی یان چواندنی بەدروستکراو: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾، ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾.

لەڕاســتیدا هــاوەڵان و شــوێنکەوتووانیش لەڕێگــەی دەقــەکانی قورئــان و فەرموودەوە مامەڵەیان لەگەڵ بابەتی یەکخواناسیدا کردووە، بەبێ ئەوەی خۆیان لەقەرەی بگرەو بەردەی قسە بدەن، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە لەزۆر زووەوە هەوڵ هەبوو بۆ ئەوەی دەقەکان بەگوێرەی هەڵوێستی سیاسی لێکبدەنەوە، وەک ئەوەی لەگەڵ خەواریجەکاندا ڕوویدا، کاتێ وتیان: (لا حكم الا لله).

گومانی تێدا نییە کەمانابەخشی هەندێک ئایەتی قورئانی پیرۆز لەسەر بابەتی یەکخواناسی بەتەواوی ڕوونە، وەک ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ {الكهف: ١١٠}، واتە: ((ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەک ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت کە: بێگومان خودای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە)).

بەهەمانشێوە هەندێک فەرموودەش وەک ئەو فەرموودەیەی پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، "با سەرەتای بانگەشەکەت بانگکردنیان بێت کەخودا بەیەک بگرن..." لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە کەگونجاو بێت جەخت لەوە بکەینەوە کورتکردنەوەی هەندێک ئایەتی دیاریکراوی قورئان، یاخود هەندێک فەرموودەی دیاریکراو لەسەر مانایەکی دیاریکراو ئەمە ئیجتیهادێکی مرۆڤە و ئەگەری ڕاست دەرچوون و هەڵەبوونی هەیە، بەڕاستی قورئانی پیرۆز تێکڕای کتێبی هیدایەتدانە بەشێوەیەکی گشتی، ئایەت و سورەتەکانی وەک یەک بونیات یەکدی تەواو دەکەن بەمەبەستی هێنانەدی ئەو هیدایەتەو هەر ئایەتێکیش بەتەنها لەبەر ڕۆشنایی واتای هەموویدا مانای خۆی دەدات، بۆیە پێویستی بەهۆشیاریی هەیە کەقورئان بە بەشبەش و جیاجیا وەربگیرێت. لەبەر ئەوەی لەوانەیە لەیەک ئایەتدا مانای ئەوەی تێدا ببینیت کە لەبواری یەکخواناسی و بواری حوکمی شەرعی بابەتێک لەبابەتەکانی مامەڵەکردندا پۆلین بکەیت، لەوانەیە بەڵێندان و هەڕەشەو ترساندنی لەخۆ گرتبێت، لەوانەشە ئاماژە بەزنجیرە چیرۆکێک بکات کەقورئان دەیانگێڕێتەوە.

## سێهەم: بابەتی یەکخواناسی و زانستی یەکخواناسی:

لەوانەیە گونجاو بێت کەجیاوازی بکەین لەنێوان بابەتی یەکخواناسی و زانستی یەکخواناسیدا، چونکە بابەتی یەکخواناسی کرۆکی مانای ئیسلام و ئیمان و ئیحسانە، کاتێ موسڵمانبوون لەدەروازەی شایەتمانەوە (لا الە الا اللە، محمد رسول اللە) دەبێت، یەکەمین پایەی ئیمان: بەڕاستزانینی تەواو دڵنیابووانەی خودای گەورەیە و ئیحسانیش ئەوەیە کەمرۆڤ هەست بەوە بکات خوای گەورە ئاگاداری هەموو کاروبارەکانیەتی، لەڕاستیدا ئەو فەرموودەیەی لەجبریلەوەیە کە لەهەردوو صەحیحەکەدا هاتووە هەموو ئەوانەی پێکەوە کۆ کردووەتەوە: (**عنْ أبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ع) يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ، فأَتاهُ رَجُلٌ فقَالَ، يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: "أنْ تؤْمِنَ باللَّهِ، ومَلَائِكَتِهِ، وكِتابِهِ، ولِقَائِهِ، ورُسُلِهِ، وتؤْمِنَ بالْبَعْثِ الْآخِرِ" قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: "الْإِسْلَامُ أنْ تعْبُدَ اللَّهَ ولَا تشْرِكَ بِهِ شَيْئًا، وتقِيمَ الصَّلَاةَ الْمَكْتوبَةَ، وتؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وتصُومَ رَمَضَانَ". قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: "أنْ تعْبُدَ اللَّهَ كَأنَّكَ ترَاهُ، فإِنَّكَ إنْ لَا ترَاهُ فإِنَّهُ يَرَاكَ". قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتى السَّاعَةُ؟ قَالَ: "مَا الْمَسْئولُ عنْهَا بأعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، ولَكِنْ سأُحَدِّثكَ عَنْ أشْرَاطِهَا: إذَا ولَدَتِ الْأمَةُ رَبَّهَا فذَاكَ مِنْ أشْرَاطِهَا، وإِذَا كَانَتِ الْعُرَاةُ الْحُفَاةُ رُووسَ النَّاسِ فذَاكَ مِنْ أشْرَاطِهَا، وإِذَا تطَاوَلَ رِعَا و الْبَهْمِ فِي الْبُنْيَانِ فذَاكَ مِنْ أشْرَاطِهَا، فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إلَّا اللَّهُ"**)، واتە: (ابوهریرە) (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەناو خەڵکیدا دەرکەوت، پیاوێک هاتە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوەڕ چییە؟ فەرمووی: "باوەڕت هەبێت بەخوا، بەفریشتەکانی، بەکتێبەکانی، بەدیدارو بەخزمەت گەیشتنی، بەپێغەمبەرانیی. هەروەها باوەڕت هەبێت بەزیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت". ئینجاوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئیسلام چییە؟ فەرمووی: "ئیسلام ئەوەیەکە: خواپەرستی و هیچ شتێک نەکەیت بەهاوبەشی، نوێژە فەرزەکانت بکەیت، زەکاتی دیاریکراو بدەیت، ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت". وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیحسان چییە؟ فەرمووی: "وا خوا بپەرستیت وەکو چاوت لێی بێت، چونکە ئەگەر تۆ چاوت لەو نەبێت ئەو چاوی لە تۆیە) ئینجاوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کەی ڕۆژی قیامەتە؟ فەرمووی:"پرسیارلێکراو لەوبارەیەوە (کەهاتنی قیامەتە) زاناتر نییە لەپرسیارکار، بەڵام باسی نیشانەکانیت بۆ دەکەم:

هەرکاتێ کەنیزەک گەورەکەی خۆی بوو [1] ئەوە لەنیشانەکانیەتی. هەروەها ئەگەر رووت و پێخاوسەکان ببنە کاربەدەستانی خەڵک، ئەوەش لەنیشانەکانیەتی. هەروەها هەرکاتێ شوانی مەڕومالات شانازییان بە بەرزیی کۆشکەکانیانەوە کرد، ئەوەش لەنیشانەکانیەتی.

پێنج شتیش هەن جگە لەخوا کەس نایانزانێت، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ {لقمان:٣٤}. واتە: {لەراستیدا هەر خوا کاتی هاتنی رۆژی قیامەت دەزانێت، هەرئەویش باران دەبارێنێت، هەرئەویش دەزانێت چی لەمنداڵداندا هەیە، هیچ کەس نازانێت سبەینێ چی دەکات، هیچ کەسێک نازانێت لەچ خاکێکدا دەمرێت، لەراستیدا خوا زاناو شارەزایە}. ئینجا پیاوەکە پشتی هەڵکردوو رۆیشت، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: "ئەو پیاوەم بۆ بگێڕنەوە، کاتێ ویستیان بیگێڕنەوە، کەسیان نەبینی. پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: "ئەوە جوبرەئیل بوو هات بۆ ئەوەی خەڵک فێری ئایینەکەیان بکات"[2].

لەبەر ئەوە یەکخواناسی ئیمان و کارکردنە بەگوێرەی ئیمان، بەمەش دەبێتە ئەو عەقیدەیەی کەموسڵمان پابەندی دەبێت و ئەو شەریعەتەی کەژیانی رێکدەخات و ئەو تێڕوانینەی بۆ بوون دەیبێت و ژیانێکی واقیعیانە بەپێی ئەو تێڕوانینە دەژی. پێکهێنەرەکانی بابەتی یەکخواناسی جێگیرن و ناگۆڕدرێن، لەڕووی ژمارەوە کەم وسنووردارن، لەڕووی واتاشەوە سنووردارن، گونجاوە بۆ گەورەو بچووک ، بۆ ئەو زانایەی کەزانستێکی فراوانی هەیەو بۆ کۆلکە خوێندەوارێکیش، شاهێدیەکانیشی لەهەردوو سەرچاوە رێنمایی بەخشەکەدایە:

---

[1] مەبەست لەمەش ئەوەیە: رۆژێک دێت منداڵ رێز لەباوک و دایکی ناگرێت، وەک کۆیلە سەیریان دەکات.

[2] البخاری، صحیح البخاری، سەرچاوەی پێشوو، کتاب الایمان باب سؤال جبریل النبی (صلی الله علیه وسلم) عن الایمان والاسلام والاحسان، فەرموودەی ژمارە ٥٠، ل٢٣. بەهەمان شێوە پێشەوا موسلیمیش لەصەحیحەکەیدا هێناویەتی، بڕوانە:

- الامام مسلم، صحیح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، کتاب الایمان، باب بیان الایمان والاسلام والاحسان، فەرموودەی ژمارە ٩، ل٣٧.

قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لێیانەوە وەردەگیرێت، لەبەر ئەوە لەهەرە تایبەتترین تایبەتمەندیەکانی عەقیدەی یەکخواناسی، وەک ئەوەی کەلەقورئان وفەرموودەدا هاتووە، بریتییە لەئاسانی و ڕوونی و نزیکی ئەو عەقیدەیە لەدڵ و عەقڵی مرۆڤ، ئەمەش خەسڵەتێکە لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە عەرەبەکان بەفیترەت و سادەیی خۆیان وەریان گرتووەو موسڵمان بوون و دواتریش ئەو گەلانەی لەسەر دەستی هاوەڵانی ڕزگاریخواز وەریانگرتووەو موسڵمان بوون، دوای ئەوەش لەڕێگەی بازرگانەکانەوە بەهەندێک لەناوچەو گەلان گەیشتووە، بەراورد بەو ئاڵۆزی وناڕوونییەی لەعەقیدەکانی تردا هەیە عەقیدەی ئیسلامی ئاسان و ڕوونە، لەبەر ئەوەی بەئاسانی خەڵکی لێی تێگەیشتووەو موسڵمان بووە، لەئەمڕۆشدا لەسەرانسەری گۆی زەویدا لەلایەن کەسانێکەوە وەردەگیرێت و موسڵمان دەبن کە لەلوتکەی مەدەنیەتدان لەئەوروپاو ئەمریکاو ژاپۆن و بەهەمانشێوە لەلایەن کەسانێکیشەوە وەردەگیرێت کەژیانێکی سەرەتایی دەژین لەدارستانەکانی ئەفریقیاو جێگا دوورە دەستەکان و موسڵمان دەبن، لەهەموو ئەمەدا گرنگ ئەوەیە کەعەقیدەی یەکخواناسی وەک خۆی ڕوون و ئاسان لەلایەن بانگخوازانێکەوە بگەیەنرێت کەلەخۆیاندا ڕەنگی دابێتەوەو دڵسۆز بن بۆی.

پێکهێنەرەکانی عەقیدەی یەکخوداسی بەتێڕوانینی گشتگیر بۆ بوون دەبێت، لەبەر ئەوەی خودای تاک و تەنیا بەدیهێنەری کار ڕێکخەر، هەموو دروستکراوەکانی هێناوەتە بوون و سیستمێکی داناوەو چەندین ڕێوشوێنی بۆ ڕێکخستنی داناوەو نێردراوانێکی بۆ ڕێنوێنی ئادەمیزادەکان ناردووە تا کاروبارەکانیان لەم ژیانەدا بەباشترین شێوە بەڕێوە بچێت و لێپرسینەوەو پاداشتی خستۆتە ژیانەکەی دیکەی دوای ئەم ژیانەوە، لەڕاستیدا یەکخواناسی و پەیامبەریێتی و گەڕانەوە بۆ لای سێ بنچینەی بیروباوەڕن کەپەیوەستن بەیەکەوەو لەوەڵامدانەوە سەبارەت بەهەموو ئەوەی دێت بەخەیاڵی مرۆڤدا لەپرسیار یەکتر تەواو دەکەن، بەتەنها خودای تاک و بێهاوتا دروستکارەو کاروبارەکانی بەدەستە، لەبەر ئەوە سیستەمی بوون لەسەر سەقامگیری و پێکەوەگونجان دامەزراوە، خودای گەورەش ڕەحم بەخەڵکی دەکات و

پەیامبەرانیان بۆ ڕەوانە دەکات و کتێبیان بۆ دەنێرێت و ڕێنوێنیان دەکات بۆ ڕێکخستنی ژیانیان لەسەر بنەمای ڕێنوێنی خودایی. خودای گەورە ژیانی ڕۆژی دوایی کردووەتە وادەی لێپرسینەوەی دادپەروەرانە، خەڵکی بۆ پەروەردگاری جیهانیان هەڵدەستنەوەو تێکڕای خەڵک لەو کاتەوە ئادەم دروستکراوە تا ئەمڕۆ هەموویان بەرەو لای دەچن، ئیدی دونیاو ئاخیرەت بوونی یەکتر تەواو دەکەن، چونکە لەژیانی دونیادا ئادەمیزادەکان ژیان بەسەر دەبەن و هەڵە دەکەن، کاری باش ئەنجام دەدەن، دادپەروەر دەبن، ستەم دەکەن، خەڵک هەیە هەژارە، هەیە دەوڵەمەندە، هەیە پیاوچاکە هەیە خراپەکارە، هەیە گوێڕایەڵە هەیانە سەرپێچیکارە... بەڵام هەموویان دەمرن، لەڕاستیدا دادپەروەری لەم ژیانەدا نایەتە دی، ئیدی ڕۆژیی دوایی دەست پێدەکات، ئەویش تەواوکاری ژیانی دونیایە، پاداشتی کاری چاکەو سزای خراپەکاری دەدرێتەوە، دادپەروەرانە لێپێچینەوە لەگەڵ خەڵکدا دەکرێت، مافی ستەملێکراو لەستەمکار وەردەگیرێتەوەو حەقی ستەمکار لەسەر ستەمکاریەکی دەسەندرێتەوەو بەدادپەروەری ڕەهای پەروەردگاریش پاداشتی خەڵکی لەسەر کارەکانیان دەدرێتەوە، ئا ئەمەیە بابەتی یەکخواناسی.

بەڵام زانستی یەکخواناسی، ئەمەیان تایبەتە بەو ڕێگاو ڕێبازانەی کەزانایان تێیدا باسیان لەم بابەتە کردووە. لەکۆن و نوێدا زانایان و توێژەران لەڕێبازی لێکۆڵینەوەیاندا سەبارەت بەبابەتی یەکخواناسی جیاوازی زۆر لەنێوانیاندا هەبووە، ئەم جیاوازیەش لەدەرکەوتنی چەندان ناونیشان بۆ باسکردنی ئەم بابەتە ڕەنگی داوەتەوە، وەک زانستی یەکخواسی و زانستی ئیمان و زانستی عەقیدەو زانستی کەلام و زانستی بنچینەکانی ئایین (اصول الدين) و فیقهی هەرەگەورە (فقه الاكبر)و..هتد، هەندێک لەزانایانیش جیاوازیان لەنێوان هەریەک لەم ناونیشانانە بەچەند شتێکی دیاریکراو کردووە، کەبەکارهێنانی هەریەکەیان لەسنوورێکی دیاریکراودا بووە. هەندێکیان زانستی یەکخواناسیان کردۆتە بەشێک لەزانستی عەقیدە کەباس لەعەقیدەی یەکخواناسی لەپاڵ بەشەکانی دیکەی عەقیدەدا دەکات، ئەمە لەکاتێکدایە کەهەندێک لەزانایانی دیکە هیچ جیاوازییەک لەنێوان ئەو ناونیشانانەدا نابینن، چونکە لەکۆتاییدا بابەتەکەیان یەکە.

**بابەتی یەکخواناسی**

(توحيد الربوبية) باوەڕبوون بەوەی کە تەنها خودا بەدیهێنەر و ڕۆزی دەر و زیندوکەرەوە و هاوشێوەی ئەمانەیە، (توحيد الالوهية) باوەڕبوون بەوەی کەتەنها خودا شایانی پەرستش و ڕۆژو و حەج و ئەو پەرستشانەیە، باوەربوون بەسیفەتەکانی و کارکردن بەپێی ئەو باوەربوونە، ئەمەش کرۆکی واتای ئیسلام و ئیمان و ئیحسانەو لەگەڵ فیترەتی ئادەمیزاددا گونجاوەو ئاسان و ڕوونە.

**زانستی یەکخواناسی**

زانستی ئیمان، یاخود زانستی کەلام، یان زانستی بنچینەکانی ئایین، یاخود زانستی فیقهی هەرە گەورە... ئەمەش زانستێکی تایبەتمەندەو تێیدا زانایان بابەتەکانی عەقیدە دەخوێنن و ڕێبازو شێوازی تایبەت بەکار دەهێنن کە لەدرێژەو ڕێکارە هونەرییەکانیدا لێک جیاوازە.

"لەگەڵ ئەوەشدا دامەزراندنی ڕاستەقینەی ئەم زانستە (زانستی عەقیدە) لەسەرەتاکانی سەدەی دووەمی کۆچیدا بوو... کەتێیدا رووکارە بنەڕەتیەکانی زانستی عەقیدە لەبابەت و شێوازەکەیدا دانرا"[1]. سووری تەواوبوون و پێگەیشتنی تا سەدەی سێهەم و چوارەم و پێنجەمی خایاند، بەجۆرێک: "بابەتەکانی عەقیدە وبەڵگەهێنانەوە (استدلال) کەئەم زانستە لەخۆی گرتبوون فراوانتر بوو هەتا تێکڕای ئەوەی پەیوەندداره بە (الالهيات) ئەوەی پەیوەستە بەزاتی خوداو سیفەتەکانی و (النبوات) پێغەمبەران و ئەوەی پێویستە بەرانبەریان باوڕبوون پێی و (سمعيات) واتە: ئەوەی پشت بەوەحی دەبەستێت، وەک بەهەشت و ئاگرو رەوشی ڕۆژیی دوایی.." [2]. لەبەناوبانگترین ئەو کتێبانەشی بەدەستمان گەیشتووە لەو ماوەیەدا کتێبی :"المغني في أبواب التوحيد والعدل"ی قازی جبار کوڕی ئەحمەدە (ساڵی ٤١٧ی کۆچی مردووە)و "مقالات الاسلاميين"ی ئەبو حەسەنی ئەشعەری (ساڵی ٣٢٤کۆچی مردووە)و "الاقتصاد في الاعتقاد"ی ئەبو حامدی غەزالی (ساڵی ٥٠٥ی کۆچی مردووە)و "التوحيد"ی ئەبو مەنصوری ماتریدی (ساڵی ٣٣٣ی کۆچی مردووە).

---

[1] النجار، عبدالمجيد. الايمان بالله وأثره في الحياة. بيروت: دار الغرب الاسلامي، ١٩٩٧، ل٢٠..

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠.

لەسێ سەدەکەی دواتریشدا، سەدەی شەشەم و حەوتەم و هەشتەم، زانستی عەقیدە چووە قۆناغی ڕێککردن (الترتیب) و دەروازەبەندی (التبویب) و جوانخستنە ڕووی ئەوانەی کەلەقۆناغی رابردوودا بەدەستهاتبوون، لەم ماوەیەشدا فەخرەدین رازی (ساڵی ٦٠٦ی کۆچی مردووە) بەکتێبی: "معالم أصول الدین" و ئیبن تەیمییە (ساڵی ٧٢٨ی کۆچی مردووە) بەکتێبی "العقیدة الوسطیة" و سەعدەدینی تەفتازانی (ساڵی ٧٣٩ی کۆچی مردووە) بەکتێبی "شرح العقائد النسفیة" ناوبانگیان دەرکرد، پاشان لەسەدەی نۆهەمەوە تا سەدەی سیازدەهەم ئەم زانستە چووە قۆناغی متبوون و لاساییکردنەوە، کەزانایان کاریان تەنها بوو بەڕاڤەو کورتکردنەوە یاخود نووسینی پەراوێزەکان و زۆرتر وشەو دەستەواژەکان بەسەر عیلمەکەدا زاڵ بوون. ماوەی نزیکەی سەدەیەکە جووڵەی گەڕان و نوێگەری کەوتۆتەوە زانستی عەقیدەوە... بەمەبەستی دەربازبوون لەزۆرێک لەو بەڵگەهێنانەوە کۆنانەی کە لەئێستادا جێگای قبوولکردن نین و هیچ کاریگەریەکیان لەسەر عەقیدەی هاوچەرخ نییە کەلەژێر کاریگەری لۆژیکی زانستیدایە.

"لەوانەیە یەکەم کەس کەدەستپێشخەری لەم نوێگەرییەی زانستی عەقیدەدا هەبوبێت پێشەوا محەمەد عەبدە بێت (ساڵی ١٩٠٥ی زایینی مردووە)، وەک ئەوەی لەکتێبەکەیدا دەرەکەوێت بەناوی: "رسالة التوحید"[1]. لەو زانایانەی دیکەش شێخ (مصطفی صبري) (ساڵی ١٩٥٤ی زاینی مردووە) لەکتێبی: "موقف العقل والعلم والدین من رب العالمین" و محەمەد ئیقبال (ساڵی ١٩٣٨ی زاینی مردووە) لەکتێبی: "تجدید الفکر الدیني في الاسلام" و حەسەن بەننا (ساڵی ١٩٤٩ی زاینی مردووە) لە: "رسالة العقائد"داو محەمەد باقر صەدر لەکتێبی: "فلسفتنا"و محەمەد سەعید رەمەزان بوتی لەکتێبی: "کبری الیقینیات الکونیة"و ئیسماعیل فاروقی لەکتێبی: "عقیدة المسلم"و یوسف قەرەزاوی لەکتێبی: "حقیقة التوحید"دا. ژمارەیەک لەو زانا نوێ و هاوچەرخانە ڕێبازێکیان بۆ خستنەڕووی زانستی عەقیدەیان پەیڕەو کرد کەلەسەر بنەمای ئاسانکردن بوو ئاراستەی عەقڵی هاوچەرخی بڕواداران و نەیاران کرابوو[2]. بەڵام زۆرێک لەزانایان و مامۆستایانی هاوچەرخ هەتا ئێستاش لەسەر هەمان شێوازی کۆنن و پشت بەو دانراوانە دەبەستن کەلەقۆناغی پێگەیشتن یاخود متبوونی ئەم زانستەدا نووسراون.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠-٢٤.

## چوارەم: نموونەکانی کتێبی زانستی یەکخواناسی (علم التوجيد)

### ١- کتێبی (التوحيد)ی ماتریدی[1]:

ئەم کتێبە بەکۆنترین سەرچاوە کەلامییەکان لەمێژووی ئیسلامییدا دادەنرێت و ئەو باشییتیەی هەیە کەتەنها تێڕوانینی خۆی سەبارەت بەبیرکردنەوەی ئیسلامی لەبابەتەکانی عەقیدەدا ناخاتەڕوو بەڵکو –سەرەڕای ئەوە- بیروبۆچوون و تێڕوانینەکانی گروپە ئیسلامیەکانی تریش سەبارەت بەم بابەتە گەنگەشە دەکات، بەتایبەت بۆچوونی موعتەزیلەکان و تێڕوانینی ئایین و بیردۆزە فەلسەفییەکانیش ڕوون دەکاتەوە. ئەگەر پێشەوا ئەشعەری لەقۆناغی کۆتایی ژیانیدا –کەتێیدا مەزهەبی کەلامی دامەزراند- بەگەنگەشەی موعتەزیلەو وەڵامدانەوەیانەوە لەناوەڕاستی جیهانی ئیسلامیدا سەرقاڵ بووبێت، ئەوا ماتریدی لەرۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیدا بەهەمان کارەوە سەرقاڵ بووە، لەوڵاتی ئەودیو ڕووبار. ماتریدی بەچەند ساڵێک پێش ئەشعەری لەدایکبووەو چەند ساڵێکیش پاش ئەو مردووە. لەنێوان ئەشعەری و ماتریدیدا لەزۆر بابەتدا لێکچوونی زۆر هەیە، لەپاڵ بوونی ڕاجیایی لەهەندێک بابەتدا، لەگەڵ ئەوەشدا نەسەلمێنراوە کەبەیەک گەیشتبن یاخود یەکێکیان ئەوەی خوێندبێتەوە کەئەویتریان نووسیویەتی. ماتریدی لەزانستەکەیدا پشتی بە"مەنهەجی مامۆستاکانی پێشەوا ئەبو حەنیفە بەستووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەگۆڕەپانی فیقهەوە چووە گۆڕاپانی عەقیدەو فیکر"[2].

بەو باشەیە ناسرا کەهەرسێ بنچینەکەی عەقیدەی سوننەی پێکەوە کۆکردووەتەوە، ئەوانیش: (الالهيات)و (النبوات)و (السمعيات) [3].

ئەم کتێبەی لەپێنج دەروازە پێکهاتووە لەگەڵ پێشەکییەکی تێروتەسەل سەبارەت بەدەرکپێکردنی زانستەکان، لەنێویاندا سەرچاوەکانی مەعریفە، ئەوانیش دوو سەرچاوەن: بیستن (السمع) و عەقڵ و کەرەستەکانی

[1] الماتريدى، أبومنصور محمد بن محمد بن محمود. كتاب التوحيد. تحقيق: بكر طوبال أوغلي، ومحمد أروشي، بيروت: دار صادر، واستانبول: مكتبة الارشاد، ط١، ٢٠٠٧م.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١٤.

[3] لەلاپەڕەی پشێتردا واتای ئەم سێ زاراوەیەم بەدرێژی بەکوردی نووسیوە بۆیە لێرەدا دووبارەم نەکردەووە (وەرگێڕ).

مەعریفەشی دیاری کردووە کەئەم سیانەیە: هەستپێکراوەکان (العیان أی الحواس) و هەواڵپێدان (الاخبار) و بینین (النظر).

ماتریدی لەدەروازەی یەکەمی کتێبەکەیدا باسی بابەتەکانی (الالهیات)ی کردووە: گوتەی ئەوانەی باسی کۆنیی جیهان و بابەتەکانی بەدیهێنان (خلق) و روودان (الحدوث) و سیفەتەکانی خوای گەورەیان کردووە. ئەم دەروازەشیان درێژترین دەروازەی کتێبەکەیەو قەبارەکەی نزیکەی نیوەی کتێبەکە دەبێت، لەدەروازەی دووەمیشدا بابەتەکانی (النبوات)ی تاوتوێ کردووە: سەلماندنی پەیامو سەلماندنی پەیامی محمد (درودی خوای لەسەر بێ)، پاشان بۆچوونەکانی (راوندی) و (وراق) و (نصار)شی تاوتوێ کردووە، لەدەروازەی سێهەمیشدا باسی بابەتەکانی قەزاو قەدەرو لەدەروازەی چوارەمدا باسی مەسەلە گەورەکان و ئەنجامدەرانی و لەدەروازەی پێنجەمدا باسی بابەتەکانی ئیمان و ئیسلام کراوە.

### ٢- کتێبی (المطالب العالیة)ی فەخرەدین رازی[1]:

هەندێک لەوانە زیادەڕەوویان کردووە لەمشتومڕو گفتوگۆو بەشبەشکردن و لقوپۆپ لێبوونەوە و گریمانەو تاوتوێی گریمانەکان، ئەمەش وایکرد ئاراستەیەکی مشتومڕی ئەو پەڕی ئاڵۆز وەربگرێت، لەو کەسانەش پێشەوا فەخرەدینی رازی (ساڵی ٦٠٦ی کۆچی مردووە) کتێبی: "المطالب العالیة"ی دانا کە لەنۆ بەش پێکدێت، هەموویان بابەتی یەکخواناسی و بیروباوەڕن، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی تەواوی بەناونیشانی: (الدلائل الدالة علی التوحید والتنزیە) بۆ تەرخان کردووەو سەرەتای کتێبەکە بەمە دەست پێدەکات:

"لەئاگاداربوون لەبەڵگەکانی یەکخواناسی و پاکژبوونەوە، دەزانم ئەگەر بڵێین: خودا یەکە، دوو ڕاڤە هەڵدەگرێت، یەکێکیان ئەوەیە کەزاتی ئەو لە بەشەکان وپارچەکان پێکنەهاتووە، ئەوەش تەنها بەڕوونکردنەوەی ئەوە دەبێت

---

[1] الرازیة فخرالدین. المطالب العالیة من العلم الالهي: "وهو المسمی في لسان الیونانیین "باثولوجیا" وفي لسانا لمسلمین "علم الکلام" أو " الفلسفة الاسلامیة". تحقیق: أحمد حجازي السقا، بیروت: دار الکتاب العربي، ط١، ١٩٨٧م. ناسنامەی کتێبەکە بەم شێوازە لەسەر بەرگی یەکەمی ئەو چاپەی ئاوەها نوسراوە.

کەخودای گەورە نەلایەنگر (متحیز) ە و نە لەلایەکەوە (جهة) یە، دووەمیشیان ڕوونکردنەوەی ئەوەی کەخودای گەورە بەدەرە لەهەر دژ و هاوتایەک. لەبەر ئەو هۆکارە ئەم کتێبە کراوەتە دووبەش: بەشی یەکەم بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی خودای گەورە بەدەرە لەلایەنگری ولایەنداریی، بەشی دووەمیش بۆ باسکردنی ئەوەی کەخودا گەورە بەدەرە لەدژ و هاوتا(الند والضد)" [1] نووسەر لەم کتێبەدا سەدوپەنجا لاپەڕەی بۆ ڕوونکرنەوەی ئەوە تەرخان کردووە، تێیدا تاوتوێی بیروبۆچوونی فەیلەسوف و موتەکەلیمین و صۆفیەکانی لەسەر ئەم شێوازە کردووە: "گوتوویانە، بانگەشەی ئەوەیان کردووە... ئێمەش ئەڵێین"، بەشێوەی "وای دابنێین.." وەڵامدانەوەو مشتومڕەکانی دابەشکردن (التقسیم) و لق لێ بوونەوە (التفریع) و سەرژمێری بابەتەکان (تعداد المسائل) و ئاراستە (الوجوه)و پاساو (حجج)ەکان لەئاستێکی جیاوازو بەیەکداچوودا کەتاڕادەیەکی زۆر ئاڵۆزە لەخۆ گرتووە.

ئەو لەزۆر بابەتدا –پاش ئەوەی لەمشتومڕی ماندوو ئەبێت- دوودڵ نییە لەبڕیاردان لەسەر ئاڵۆزی و قورسی بابەتەکە. نموونەی ئەمەش: قسەکردن لەم بابەتەدا "لەسەختی و ناڕەحەتیدا گەیشتۆتە ئەوەی زۆر عەقڵ تێیدا تواونەتەوە. خودای گەورە زاناترە"[2]. هەروەها ئەم گوتەیەی: باسەکە لەقورسیدا گەیشتووەتە ئەوەی عەقڵی مرۆڤ دەسەوسانە لەگەیشتن پێی، خوداش زاناترە"[3]، نموونەیەکی تر: گومانی تێدا نییە کەئەم بابەتە لەوپەڕی قورسیدایە، خودای گەورە زاناترە"[4]. ئەمانە بەدیاریکراوی لەچەندان بابەتی ئاڵۆزی پەیوەنددار بەدەروازەکانی (الحدوث: واتە پێش دروستبوون نەبوونێکی ڕەها بوونی هەبووە) و (القدم: پێش بوون نەبوونێکی ڕەها نەبووە)و (أسرار الدهر: نهێنیەکانی ڕۆژگار) و (الازل: کۆنییەک کەسەرەتای نەبێت) کەلەبەشی چوارەمدا قسەی لەبارەوە کراوە.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ل٥.
[2] سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ل٢٧.
[3] سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ل٣٣-.
[4] سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ل٤٠.

ئـەمجۆرە مەنهەجیەتـەی کـەڕازی پـەیڕەوی کـردووە، وایکـردووە بابـەتی یەکخواناسی ببێتـە زانسـتێکی ئـاڵۆز و خسـتوویەتیە نێو بابەتـەکانی فەلسـەفە و زانستی کەلام بەشێوازی یۆنانیەکان، لەبەر ئەوە هـیچ سـەیر نییە کەناونیشـانی ناسەرەکی کتێبی "المطالب العالیة من العلم الالهي" بەمجۆرە بێت: "وهـو المسـمی في لسـان الیونـانیین "باثولوجیا" وفی لسـان المسـلمین "علـم الکـلام" أو "الفلسـفة الاسـلامیة" واتـە: ئەمـەش لـەزمانی یۆنانییەکانـدا بـە ئیسـۆلۆجیا و لای موسـڵمانەکانیش بـە زانسـتی کـەلام یـاخود فەلسـەفەی ئیسـلامی نـاونراوە. بەهەمانشـێوە سـەیر نییـە کەپێشـەوا فـەخری رازی لـەکۆتایی تەمەنیـدا بگاتـە ئەوەی بڵێت:

(نهایة إقدام الـعقول عقـال | وأکثـر سـعي العـالمین ضـلال
وأرواحنا في وحشة من جسومنا | وحاصـل دنیانـا أذی ووبـال
ولم نستفد من بحثنا طول عـمرنا | سـوی أن جمعنـا فیـه قیـل وقـالوا
ولم قد رأینا مـن رجال ودولـة | فبـادوا جمیعـا مسـرعین وزالـوا
وکـم من جبال قد علت شرفاتها | رجال فزالوا والجبال جبال)

هـەروەها دەڵێـت: "لەڕاسـتیدا ڕێگاکـانی کـەلامی و مەنهەجـە فەلسـەفییەکانم تـاقیکردووەو نـەمبینی تینویـەتی بشـکێنێت و گرفتێـک چارەسـەر بکـەن و بینـیم ڕاستترین ڕێگا ڕێگای قورئانە[1]".

## ٣- کتێبی (رسالة التوحید)ی محمدی کوڕی عبدالوهاب[2]:

کتێبـی "رسـالة التوحیـد"ی شـێخ محمـدی کـوڕی عبـدالوهاب ئـەو باشـێتیەی هەیە کەزۆر بەئاسانی جەخت لەسەر هەمەکیەکانی بیروبـاوەڕی پێشـین (کلیـات الاعتقاد السلفي) دەکاتـەوەو لەسەلماندنیشـدا تـەنها ئایەتـەکانی قورئـانی پیرۆزو فـەرموودەکان دەهێنێتـەوەو وەڵامـی ئـەو بیدعانـەی دایـەوە کەلەگـەڵ

---

[1] الـرازی، فخرالـدین، التفسـیر الکبیـر. بیـروت: دار إحیـاء التـراث العربـي، ط٤، ٢٠٠١م، ج١، (لەناساندنی نووسەرەوە وەرگیراوە) ل١٥-١٦.

[2] بن عبدالوهاب، محمد. کتاب التوحید الذي هو حق الله علی العبید. صححه وقابله علی النسخه الخطیة ٨٦/٤٦٥ بالمکتبة السعودیة: کل من عبدالعزیز السعید، واحمد کحیل، ولبیب السـعیده، جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامیة (د.ت).

پێویستییەکانی ئیماندا یەکی نەدەگرتەوە، لەڕاستیشدا کتێبی (کتاب التوحيد الذي هو حق الله على العبيد) لەکاردانەوە بوو بەرانبەر دیاردەکانی هاوبەشبڕیاردان وبیدعە کەلەسەردەمی ئەودا بڵاو بووبووەوە، ناڕازی بوو لەو بیدعانەو داوای یەکخواناسی پاک و گەڕانەوەی ئایین بۆ لای عەقیدەی بێخەوش و فیترەتی بێگەردو ئاسانییەکەی سەرەتای دەکرد، کەپشتی بەحوکمەکانی قورئان و فەرموودە دەبەست، لەمەنهەجی باسکردنی یەکخواناسی و بانگەوازیشدا بۆ لای کەوتبووە ژێر کاریگەری مەنهەجی ئیبن تەیمیە، بەتایبەت وەرگرتنی عەزیمەت و شکانەوە بەلای توندیداو بانگەوازی بۆ پاککردنەوەی بەندایەتی بۆ خودا و بەرەنگاربوونەوەی توندی بۆ شێوازەکانی بیدعە کەخۆی لەسەردانی گۆڕو هانابردن بۆی و پێویستی رووکردنە خودای تاکی بێهاوتا بەبێ هاوبەش و نێوەندگیر.

ئەم کتێبە لەسەدو پەنجاو یەک لاپەڕە پێکهاتووە، شەست وشەش دەروازەی لەخۆ گرتووە، لەهەریەکەیاندا کۆمەڵێک ئایەت خراونە ڕوو بەفەرموودەو کردارەکان تەفسیری کردوون، پاشان ژمارەیەک بابەت کەلەبیست زیاترە لەزۆربەی دەروازەکاندا دیاریکردووە، ئەم کتێبە بەگشتی دەقەکانی لەقورئانی پیرۆز وەرگیراوە، لەگەڵ ئەوەی پەیوەندداره پێیانەوە لەفەرموودەکانی پێغەمبەر کەتایبەتن بەچەمکی یەکخواناسی و باشێتیەکانی و ئەو شیرکە گەورانەی کەیەکخواناسی هەڵدەوەشێنێتەوە، یاخود شیرکی بچووک و بیدعە کەلێی کەم دەکاتەوە.

### ٤- کتێبی (رسالة التوحيد)ی محمد عەبده[١]:

محمد عەبدە لەماوەی نێوان (ساڵی ١٨٤٩ تا ١٩٠٥ی زایینی) ژیاوە، لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، کەئەو سەدەیە بەلاوازی و دواکەوتوویی و دابەشبوون و جیاڕایی و بڵاوبوونەوەی نەفامی و بەستەڵکی فیکری ناسرابوو بەتایبەت ئەگەر بەراوردی بکەین بەوڵاتانی ئەورووپی، کەخاوەنی پێشکەوتنی پیشەسازی و زانستیی و سەربازی بوو دەستیشی گرتبوو بەسەر زۆرێک لەجیهانی ئیسلامیداو هەڕەشەی لەدەوڵەتی خەلافەتی

---

(١) عبده، محمد. رسالة التوحيد . تحقيق: محمد عماره، القاهرة: دار الشروق، ١٩٩٤.

عوسمانی دەکردو ئەو ڕەوشە لەڕاستیدا کاریگەری لەسەر پێگەیشتنی شێخ محمد عەبدە هەبووە، لەبەر ئەوە سەرقاڵ بوو بەلێکۆڵینەوە لەواقیعی ئەم ئومەتەو نەخشەدانان بۆ هەستانەوەی شارستانیی ئەم ئومەتەو لەپێناوەی ئەمەشدا بەشداری چالاکی سیاسیی کردو بووە هۆی دوورخستنەوەی بۆ لوبنان. لەوێش وانەکانی ڕاستکردنەوە لەعەقیدەدای وتەوە کەئەو ناکۆکیانەی لەنێوان ئومەتدا هەبوو تێبپەڕێنێت. کاتێ گەڕایەوە بۆ میسر ئەو وانانەی پاکنووس کردەوەو بەناونیشانی "رسالة التوحيد" بڵاوی کردەوە.

شێخ محمد عەبدە لەم کتێبەیدا ڕەچاوی ئاسانی و ڕوونی لەدەربڕیندا کردووەو خۆی بەدوورگرتووە لەو زاراوەو دەربڕینانەی لەعیلمی کەلامدا بوون و جەختی لەسەر گرنگییەتی چاکسازی عەقیدە کردەوەتەوە کەکۆکەرەوەی تاکەکانی ئومەتی ئیسلامە. لەمەشدا پشتی بەمەنهەجی سەلەف بەستووە، بەڵام جەختیشی لەگرنگی عەقڵی مرۆڤ لەتێگەیشتنی عەقیدە کردۆتەوە لەڕێی ڕامان وبیرکردنەوە لەئاسۆکانی بوونی ماددی و کۆمەڵایەتی. هەروەها خۆی بەدوور گرتووە لەبابەتە جێ ناکۆکەکان کەبونەتە هۆی پەرتەوازەیی ئەم ئومەتەو چارەسەری هەندێک لەبابەتە جێ ناکۆکەکانی بەشێوازێک کردووە کەگونجاندنی لەنێوان بۆچوونە کەلامییە جیاوازەکاندا دروست کردووە، بەتایبەت بابەتی بینینی خودای گەورەو بابەتی کەرامات.

لەگەڵ ئەوەی شێخ محمد عەبدە تایبەتمەند نەبوو بەعیلمی کەلام یاخود خۆی سەرقاڵ نەکرد بەچاککردنی شێوەیەوە کەهەوڵەکانی هەندێک لەزانایانی پاشینی گروپە کەلامییەکان بوبوونە هۆی شێواندنی، لەگەڵ ئەمەدا بناغەی بۆ مەنهەجێکی نوێ بۆ مامەڵە لەگەڵ بابەتەکانی عیلمی کەلام داناو چەمک و زاراوەکانی خستە ڕوو دروستبوون و گەشەسەندن و فرەیی قوتابخانەکانی و کەوتنە ژێر کاریگەری ڕەوشی سیاسی و تێکەڵبوونی بەفەلسەفەی یۆنانی ڕوونکردەوە، بەشێوەیەکی تایبەتیش ناکۆکی نێوان گروپ ودەستەکانی عیلمی کەلامی کەم کردەوە سەبارەت بەپایەی عەقڵی مرۆڤ و زیادەڕەوی لەتێڕوانینی عەقڵانیدا کەهەواو ئارەزوو ئاراستەی دەکات، یاخود تەنها وەرگرتنی رووکاری دەق و دورخستنەوەی تێڕوانینی عەقڵی. لەمبارەیەشەوە شێخ محەمەد عەبدە ئاماژە بەمەنهەجی ئەبو حەسەنی ئەشعەری کردووە

کەمیانڕەو بووە لەخستنەڕووی بابەتەکانی عەقیدەدا کردووەو شێخ محەمەد عەبدە لەم ڕووە ستایشی ئەشعەری کردووە لەبەر ناوەنگیری و مایندرەوییەکەی و ڕەخنەشی لەزانایانی پاشینی ئەشعەری گرتووە کەکەوتنە ئەوەی موعتەزیلەکانی تێکەوت، بەهەمان شێوە ستایشی موعتزیلەی کردووە لەسەر وەگەڕخستنی عەقڵی مرۆڤ بۆ ئەو مەبەستەی کەخوای گەورە بۆی دروست کردووە، بەڵام لەهەمان کاتدا ڕەخنەی لەزیادەڕەوی و توندڕەوی گرتووە و دژی تێکەڵکردنی کاروباری عەقیدە بەفەلسەفەی یۆنانی لەلایەن ئەوانەوە بووە.

شێخ محمد عەبدە ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە: "بنچینەی واتای یەکخواناسی، باوەڕبوونە بەوەی کەخوا تاک و بێهاوتایە، ئەم عیلمەش بۆیە وا ناونراوە لەبەر ئەوەی گرنگترین بەشەکانی لەخۆگرتووە. کەئەویش سەلماندنی ئەوەی خودا یەکە لەزات و لەکرداری دروستکردنی گەردوونەکان و بەتەنها ئەو مەرجەعی هەموو گەردوون و کۆتا ئامانجیەتی، ئەم خواستەش مەبەستی هەرە مەزن بووە لەناردنی پەیامبەر (درودی خوای لەسەر بێ)، هەروەک ئەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز گەواهی بۆ دەدەن... ئەو زانستەش بۆیە ناونراوە عیلمی کەلام یان ئەوەتا بەناوبانگترین بابەت کەجیاڕایی لەنێوان زانایانی سەدەکان لەسەر دروست بووبێت ئەوەبووە کەکەلامی خوێندراوەی خوای گەورە (حادث: پێشتر نەبوونێکی ڕەهای هەبووە) یاخود (القدیم: پێشتر نەبوونێکی ڕەهای نەبووە)، یان ئەوەتا بەربنەمای بەڵگەکەی عەقڵییەو جێکەوتەکەی لەقسەی هەر قسەکارێکدا دەردەکەوێت..." [1].

بەڵام مەبەستی ئەم زانستە بریتییە لە: "بەجێگەیاندنی فەرزێک کەهەمووان لەسەری یەکڕان، ئەویش ناسینی خودای گەورەیە بەهۆی ئەو سیفەتانەیەوە کەپێویست بسەلمێنرێت بۆی، لەگەڵ پاکگرتنی لەوەی کەئەستەمە تێیدا بێت و بەڕاستزانینی پێغەمبەرانی بەشێوەیەکی تەواو دڵنیا کە دروون ئاسوودە بکات و پشت بەستوو بەبەڵگە بێت، نەک شوێنکەوتەی ئەم و ئەو بێت... چونکە

---

[1] عبده، محمد. رسالة التوحيد . تحقيق: محمد عماره، القاهرة: دار الشروق، ١٩٩٤، ل١٧.

خـوای گـەورە فـەرمان دەكـات وردبيينـەوەو عـەقڵ بـەكار بهێنـين لـەو ديـاردە گەردوونيانەی كەلەبەر دەستماندان"[1].

محمـد عەبـدە لەمەنهـەجی باسـكردنی زانسـتی يەكخواناسـيدا خسـتنەڕووی ئاسانی سەلەفی كەلەسەر بنەمای تێگەیشتنی دەقەكانی قورئانی پيرۆزە، لەگـەڵ نزيككردنـەوەی كـەلامی بـەدابڕينی لـەئاڵۆزی و لێكدانـەوەی فەلسـەفی پێكـەوە كۆكردووەتـەوە، بـەڵام ئـەوەی لەمەنهەجەكەيـدا گرنگـە بريتييـە لەبەسـتنەوەی ئيمـان بەپێويسـتيەكانی يەكخواناسـيەوەو كاريگـەری ئـەو ئيمانـە لەسـەر ژيـانی كرداريی مرۆڤی موسڵمان و كۆمەڵگای ئيسلامی و ئايەتەكانی بوونی گەردوون و سـوونەتەكانی. گرنگتـر لەوانـەش هـەموو ئەوەيـە كەعەقيـدەی يەكخواناسـی بـەبۆچوونی محمـد عەبـدە كەرامـەت و ئـازادی بـەجۆرێك بـۆ مـرۆڤ فەراهـەم دێنێت كەهيچ عەقيدەيەكی تر ئاوا نايهێنێتەدی.

چونكە بەهۆی يەكخواناسيەوە"پايەی مرۆڤ بـەرز دەبێتـەوەو بـەهای زيـاتر دەبێت لەبـەر ئـەو ڕێزەی بەدەسـتی هێنـاوە، بـەجۆرێك كـەوای لێهـاتووە ملكـەچ نابێـت بـۆ هـيچ كـەس جگـە لەبەديهێنـەری تـاكی بێهاوتـا كەدروسـتكاری ئاسـمانەكان و زەوييـە، ... بەمـەش مـرۆڤ ڕيـزدارو ئـازاد دەبێـت و ويسـتی لـەوكۆت و بەندانـە دەربـازی دەبێت كەدەيبەسـتەوە بەويسـتی كەسـانی تـرەوە، ئيدی ئەو ويستە مرۆييە واگومانی بردبێت كەبەشێكە لەويستی خودايی، ياخود ويستی سەرۆكە دەسەڵاتدارەكانە، يان ويسـتێكی خەياڵييە وەك ئـەوەی گومـان ئـەبرێت لـەناو گـۆڕدا بـەردو ڕووەك و هەسـارەكان و هاوشـێوەيان هـەبێت و عەزيمەتيشـی دەربـازی دەكـات لەنهێنيـەكانی تكاكـارو ميـانگير و كـاهين و فاڵگرەوەو ئەو سـەركردانەی دەسـەڵاتدارن بەسـەر نهێنيـەكان و ئەوانـەی واخـۆ دەرئەخـەن كـەمافی دەسـەڵاتداربوونيان بەسـەر كاروبـاری نيـوان مرۆڤـەكان و خوايـان بەدەسـتە و بانگەشـەی ئـەوە دەكـەن كەئـەوان هۆكـاری ڕزگـاربوونن و خۆشبەختكردن و دڵتەنگكردنيان بەدەستە، بەگشتی،ڕۆحی لەپەرستنی كەسـانی فيلبازو دەجال دەربازی دەبێت و مـرۆڤ بەيەكخواناسـی دەبێتـە بەنـدەی خـودا، ئازادە لەپەرستشی جگە لەخودا، هەموو ئـەو مافانـەی بۆ مرۆڤـی ئـازاد بەسـەر ئـازادەوە هەيـە بـۆ ئـەويش هەيـە، لەسـەر حـەق نەكـەس لەسـەريەوەيەو

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

نەلەخوارەوەیـــە، جیـــاوازیی نێـــوان مرۆڤـــەکان تـــەنها بـــەهۆی جیـــایی کردارەکانیانەوەیەو هیچ کەس لەویتر باش وبەرزتر نییە بەباشێتی عەقڵ و مەعریفەیان نەبێت..." [1].

لەڕاستیدا مەنهەجی محمد عەبدە لەکتێبی "رسالة التوحيد" کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ڕەفتاری قوتابییەکانی و زانایانی جگە لەوانیش کەبەو گەیشتن و کەوتنە ژێر کاریگەری قوتابخانە چاکسازییەکەی لەئیجتیهاد لە عیلم و ئاڕاستەی کارکردن لەبانگەوازدا، لەشێخ محمد ڕەزای قوتابییەوە دەستی پێکرد، پاشان زانایانی ئیخوان موسلمین و بیرمەندەکانیان و تا دەگاتە زۆرێک لەنووسەرانی هاوچەرخ. ئەم قوتابخانەیە بڕاوای وابوو کەبنچینەی یەکخستنی ئەم ئومەتە لەواقیعدا لەسەر بنەمای یەکخواناسی لەعەقیدەکەیدا ڕاوەستاوە.

### ٥- کتێبی "رسالة العقائد"ی حەسن بەننا[2]:

خوالێخۆشبوو حەسەن بەننا (ساڵی ١٩٤٩ی زانینی مردووە) نامەیەکی کورتی سەبارەت بەعەقیدە نووسیوە بەناوی: "رسالة العقائد" چاپ کراوەو نزیکەی پەنجا لاپەڕەیە، تێیدا پێشەوای شەهید پێناسەی عەقیدەی ڕوون کردووەتەوەو کەئەو عەقیدانە عەقڵ پشتگیری دەکات و تێڕوانینی دروست پشتیوانی ئەکات. عەقیدەی ئیسلامیشی دابەشکردووە بۆ چوار بەش، ئەوانیش: (الالهيات)و (النبوات) و(الروحانيات)و (السمعيات)، لەبەشی یەکەمدا قسەی یەکلاکەرەوەی سەبارەت بەوەی پەیوەندداره بەزاتی خوداو ناوو سیفەتەکانی کردووەو جیاوازی خەڵکی لەبارەی سیفەتەکانی لەنێوان ئەوانەی کەهەندێ سیفەتی بەرجەستەی دەکەن و ئەوانەی هەندێ سیفەتی لەکار دەخەن ڕوون کردووەتەوە، کەهەڵوێستی هەردوولایان ڕەتکراوەیەو هەڵوێستی پێشین (سلف)یش سەبارەت بەسەلماندنی ئەوەی خوای گەورە بۆ خۆی سەلماندویەتی بەبێ تەفسیرو وەسف و چواندن و هەڵوێستی پاشین (خلف)یش لەبارەی تەئویلی واتای ئەو وشانەی کەتایبەتن بەسیفەتەکان بەو شێوەیەی کەمەجازی بن. گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کەپێشین و پاشین لەسەر ئەسڵی

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨-١٣٩.

[2] البنا، حسن. رسالة العقائد. عناية: ماجد الدرويش، طرابلس، لبان: دار مكتبة الايمان، ٢٠٠١م..

تەئویل ڕێککەوتوون، بەڵام پاشین هەوڵیانداوە واتای دیاریکراو دیاری بکەن بەمەبەستی بەدوورگرتنی خودای گەورە لەوە. بەڵام حەسەن بەننا بەولایەدا شکاوەتەوە کە" بۆچوونەکەی پێشین – بێدەنگبوون و گەڕاندنەوەی زانینی ئەم واتایانە بۆ خودای گەورە- سەلامەت ترو شایانترە بەوەی پەیڕەو بکرێت، ئەمەش بۆ یەکلاکردنەوەی باسی تەئویل و لەکارخستن (تعطیل)". لەگەڵ ئەوەشدا ناکۆکی لەتەئویلی وشەکاندا کارێکی بێنرخەو لەکۆن و نوێدا پێویستی بەوە نەکردووە لەسەری ناکۆک بن، گرنگترین شت کەپێویستە موسڵمانان بەدەمیەوە بچن بریتییە لەیەکڕیزی و یەکدەنگی نێوانیان.

## ٦- کتێبی (الایمان بالله وأثره في الحياة)ی (عبدالمجيد النجار) [1]:

بانگخوازانی هاوچەرخی ئیسلامی لەڕاستیدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لەجەختکردنەوە لەسەر گرنگی بابەتەکانی یەکخواناسی و بابەتەکانی ئیمان لەدارشتنەوەی ژیانی هاوچەرخ بۆ مرۆڤی موسڵمان و کۆمەڵگای موسڵمان، ژمارەیەکی بەرچاو کەکەم نین لەکتێب لەم بوارەدا نووسراوە، لەوانە: "الايمان وأثره في الحياة"ی حەسەن ترابی و "الايمان حقيقته وأركانه ونواقضه"ی محمد نعيم ياسين و "العقيدة وأثرها في بناء الجيل"ی عبدالله عزام و "الايمان وأثره في نهضة الشعوب"ی (يوسف العظم) و "الايمان بالملائكة وأثره في حياة الامة"ی صالح فوزان و "الايمان باليوم الاخر وأثره في حياة المسلم"ی (عبدالله الاثري).

جێگای خۆیەتی لەمبارەیەوە ئاماژە بەیەکێک لەو کتێبانە بکەین کەئەویش کتێبی "الايمان بالله وأثره في الحياة" کەلەنووسینی (عبدالمجيد النجار)ە، نووسەر لەم کتێبەدا تەنها بەخستنەڕووی بابەتە تیۆرییە گەورەکانی پەیوەست بەبوونی خودای گەورە و سیفەتەکانی بەشێوەیەکی مەنهەجی کەپشت بەدەقەکانی وەحی و پێویستیەکانی فیترەتی ساغ و بەڵگە عەقڵییە گەردوونییە بورهانیەکان ببەستێت، بەڵکوو سوورە لەسەر ئیجتیهاد لە: "خستنەڕووی جێکەوتەی ئیمان بەخودا لەژیانی تاک و کۆی باوەڕدارانداا، ڕوونکردنەوەیەک کەپشت ئەستوورە بەبەڵگەی لۆژیکی ڕۆڵی ئیمان لەچوون بەرەو ژیانێکی

[1] النجار، عبدالمجيد، الايمان بالله وأثره في الحياة. بيروت: دار الغرب الاسلامي، ط١، ١٩٩٧م.

باشتر، هەروەها بەڵگەی مێژوویشی لەخۆ گرتووە سەبارەت بەبەرهەمی ئەو ئیمانە لەشارستانیەتی گەشی ئیسلامیدا کەسوودە کردارییەکانی سنووری موسڵمانانی تێپەڕاندووە بۆ جیهان، ئەم ڕوونکردنەوەیەش لەتوانایدایە ببێتە بەڵگەیەکی بەهێز لەبانگەواز بۆ باوەڕهێنان بەخودا، ئەمەش بەهۆی بڵاوبوونەوەی  ڕۆشنبیری لەبارەی سوودەکەیەوە لەناو خەڵکیدا، عەقڵەکان دەبینن کەسوودی کرداریی تێدایە و دەبێتە مایەی قبوڵکردن کاتێ کەبەڵگەکە کرداریی بێت و چارەسەری کێشە واقعیەکانی ژیان بکات و ئەوەش دەبێتە دەروازە بۆ باوەڕهێنان بەبیرۆکەو تێڕوانیەنە تیۆرییەکان"[1].

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

**پێنجەم: کتێبی (التوحيد وتضميناته في الفكر والحياة)ی ئیسماعیل فاروقی:**(١)

زۆرێک لەمامۆستایانی قوتابخانەی (إسلامية المعرفة) لەنووسین سەبارەت بەیەکخواناسی بەشداربوون(٢)، بەتایبەت لەبەیەکەوە بەستنەوەی عەقیدە بەهەموو لایەنەکانی ژیان و ڕەنگە جیاوازەکانی چالاکی کۆمەڵایەتی و فکری مرۆڤایەتی لەسیاسەتەوە تا هونەرەکان، لەم بوارەشدا کارێکی ناوازەی پێشەنگێک لەپێشەنگەکانی ئەم قوتابخانەیە هەڵدەبژێرین کەئەویش خوالێخۆشبوو ئیسماعیل راجی فاروقییە (ساڵی ١٩٨٦زاینی مردووە)، کتێبەکەی بەناوی "مفهوم التوحيد واثاره في الفكر والحياة". ئەم کتێبە پڕبایەخە کەمێک زیاتر لەسەری دەدوێین، ئەمەش بەهۆی ئەو تێڕوانینەوەیە کەکتێبەکە سەبارەت بەیەکخواناسی وەک بەهای هەرەمەزن لەئاییني ئیسلامدا و سەرچاوەی هەموو بەهاکانی تر لەئاییندا لەخۆی گرتووە، پاشان لەخستنەڕووی درەوشانەوەکانی بەهای یەکخواناسی لەتێکڕای سیستمەکانی ژیاندا. دەتوانرێت ئەم کتێبە وەک یەکێک لەهەوڵە هاوچەرخە زۆرباشەکان سەیر بکرێت کەرۆڵی نوێکردنەوەی عیلمی کەلام و دووبارە کاراکردنەوەی و بەستنەوەی بەجووڵەی مێژوو بەپرشنگەکانی شارستانێتی رەوا بۆ موسڵمانان لەسەردەمی هاوچەرخدا لەئەستۆ گرتووە، دوور لەدەستهەڵگرتن لەمەنهەجیەتی زانستی ڕەسەن کەپێویست دەکات لەو جۆرە توێژینەوانەدا لەبەرچاو بگیرێت.

مامۆستا فاروقی لەکتێبەکەیدا لەواقیعی نەویستراوی موسڵمانانەوە سەرچاوە دەگرێت ڕووەو هەستانەوە بەو واقیعە بەرەو ئایندەیەکی بەئاوات خواستراو چارەسەری بابەتی یەکخواناسیشی وەک بەهایەک کردووە کەباڵادەستە لەبوارەکانی ژیانی مرۆڤی موسڵمان و کۆمەڵگای ئیسلامیدا.

---

(1) al-Faruqi, Ismail R.. Al-Tawhid: Its implications for Thought and Life. Herndon, VA:
IIIT. Fifth printing, 2000.

(٢) دکتۆر تەها عەلوانی لەکتێبی "المنهجية الاسلامية"دا بەشێکی درێژی سەبارەت بەناساندنی یەکخواناسی وەک بنەمای یەکەم لەبنەماکانی مەنهەجی ئیسلام نووسیووە: بڕوانە:
- باشا، أحمد فؤاد واخرون. المنهجية الاسلامية. القاهرة: المعهد العالمي للفكر الاسلامي ودار السلام، ٢٠١٠م، ج١، ل٣٤٧-٤٥٩.

ئامـانجی ئـەم کتێبـە پێشکەشـکردنی تێڕوانینێکـە بـۆ بـوون کەگـەنجانی موسـڵمان ڕێنمـایی بکـات لەسـەر ڕێگـای چاکسـازی ڕاسـتەقینە و لێکدانـەوەی چەمکـە ئیسـلامییەکان بـڕۆن، تـا ببێتـە پێـوەری بەرنامـەی چاکسـازییەکەیان، چونکـــە یەکخواناســـی کرۆکـــی ئیســـلامە و ســـەرچاوەی چاکســـازی و ناوەرۆکەکەیـەتی. لەبـەر ئـەوە هـەر سیازدە بەشـەکەی ئـەم کتێبـە، پەیوەندداره بەیەکخواناسیەوە، چونکە یەکخواناسی کرۆکی پەیامە ئاسمانییەکان و کرۆک وحەقیقـەتی ئیسـلامەو بنـەمای مێـژووە، هـەر ئـەویش بنـەمای غـەیب و ڕەوشـتەکان و بنـەمای سیسـتمی کۆمەڵایـەتی و بنـەمای خێـزان و بنـەمای سیسـتمی سیاسـی و ئـابووری و سیسـتمی جیهـانی و بنـەمای خەسـڵەتەکانی جوانییە. باشی نووسـەر لەوەدایە کەلەهـەموو بەشێکدا جەخت لـەوە دەکاتـەوە کەیەکخواناسی چەقی بابەتەکەیەو پێوەرێکی بەهادەرە بۆ چارەسـەری بابـەتی بەشەکە.

نووسـەر تەواومەندی تێڕوانینی یەکخواناسی ڕوونکردووەتەوە، کە ڕەهەنـدە شارسـتانیەکانی لـەخۆدا کۆکردووەتـەوە: (فەلسـەفی و کرداری). تێبینیەکانیشـی سـەبارەت بەبابـەتی یـەکێتی (الوحـدة)و تـەواوکاری (التكامـل) لـەنێو لقـەکانی مەعریفـەدا بـەجۆرێک خسـتووەتە ڕوو کـە ئـەو بـار قورسـییەی کەلـەپووری ئیسلامییدا بەناوی فەلسەفەی ئیسلامی و عیلمی کەلامەوە ئاشنای بووە سووک بکـات، هەوڵەکانیشـی لـەم ڕووەوە بـەرەو هاندانـە لەسـەر چاکسـازی فکـری ئیسلامی و واقیعی هاوچەرخی موسڵمانان.

یەکخواناسی –لای فاروقی هەروەک ئەوەی لای زۆربەی زانایانی موسـڵمان باوە- تێڕوانینێکی گشتییە بۆ حەقیقەت و گەردوون و کات و شوێن و مێژووی مرۆڤایـەتی و چـارەنووس. بنـەمای یەکخواناسـی تێکـڕای سیسـتمی گشـتگیری ژیان دەگرێتەوە لەئیسلامدا و کاریگـەری دەبێت لەسـەر هـەموو پێکهێنـەرەکانی شارسـتانیەتی ئیسـلامی و پەیوەندی سنووردار لەنێوانیاندا دروست دەکات و سەرلەنوێ هەڵدەسـتێت بەداڕشـتنەوەو گشـتگیرکردنی ئـەوەی کەئیسـلام لەهـەر پێکهێنەرێک لەپێکهێنەرەکانی شارستانیەتەکەی بەئاستی قوڵیی جیاواز دەیهێنێتە ئـارا، لـەگۆڕانی سـادەوە لەحاڵـەتی شـێوازو ڕوخسـاردا تـا دەگاتـە گۆڕانکـاریی ڕیشـەیی لەحاڵەتی کاردا، چونکە کـار پەیوەنـدیی جەوهـەریی پێکدەهێنێت. کـاتێ

موسڵمانان گەشـەیان بەزانسـتی یەکخواناسـیدا ئـەم بوارانـەیان تێدا کۆکردەوە: لۆژیک (منطق)، بیردۆزەی مەعریفە و غەیب و ڕەوشت[1].

ئەمانە گرنگترین خەسڵەتەکانی بەهایە، لەبـەر ئـەوە دەبێت فـارووقی باسـی یەکخواناسی وەک بەها بکات.

لەڕاسـتیدا یەکخواناسـی ئیسـلامی جیاکردنەوەیـەکی یەکلاکـەرەوە لـەنێوان بەدیهێنـەر (خـالق)ی باڵادەسـت و گـەردوونی بـەدیهێنراودا دەکـات، ویسـتی بەدیهێنـەر بـوونی بـەدیهێنراوەکان و ڕەفتـارو سیسـتمیان دیـاری دەکـات و حەقیقـەتی یەکخوداناسـیش لـەوەدا خۆی دەبینێتـەوە کەئـەم گەردوونـە لەسـەر ڕێکـوپێکی لـەڕەفتاردا دامـەزراوە، دوور لـە ناسـەقامگیری یـاخود خراپـەکاری، ئەمـەش ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کەسـەرچاوەی ئـەم سیسـتمە یەکـە، ئـەویش بەدیهێنەری تاک و بێهاوتایە، ئەگـەر لەگەردوونیدا چەندین خوداوەند هەبوایە، ئەوا گەردوون تووشی ناسەقامگیری و تیکچوونی کاروبارەکانی دەبوو چونکە لەتوانایدا نەبوو لەیەک کاتدا فـەرمانی دوو کـەس بـەجێ بگەیـەنێت، لەبـەر ئـەوە یەکخواناسی پلەی هەرە باڵایە لەئایین و لەبیروباوەڕی مرۆڤدا و لەپاداشتیشیدا باشێتیەکی مەزن هەیە.

داننان بـەتاک و تـەنیایی خـودا –وەک پێویسـت- داننـان بـەوەی کەحەقیقـەت یەکە دەخوازێت. چونکـە حـەق و حەقیقـەت خەسـڵەتێکە حەقیقـەتی یەکخواناسـی دەیخوازێـت. فـارووقی ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە کـەچۆن یەکخواناسـی –وەک بنەمایـەکی مەنهـەجی پێویسـتبوونی یـەکێتی حەقیقـەت دەخوازێـت- لەسـەر ئـەم سـێ بنـەما ناسـەرەکییەی کەپەیوەسـتن بەسروشـتی ئـەو مەعریفەیـەی کـەمرۆڤ لەسـەرچاوەکانیەوە بەدەسـتی دەهێنێـت پێکـدێت: یەکـەمیان ڕەتکردنـەوەی هـەموو ئـەوەی کەلەگـەڵ حەقیقـەت یەکنەگرێتـەوە، دووەمـیش نکوڵیکردن لەدژیەکی (تناقض)، سێیەمیش کرانەوە بەڕووی بەڵگەی نوێدا[2].

بـەهۆی بنـەمای یەکەمـەوە پوچـەڵ (باطـل) و وەهـم و گومـان لەبازنـەی بیروبـاوەڕی ئیسـلامی دوردەخرێتـەوەو بـوار لەبـەردەم ڕەخنـەو بژارکـردن دەمێنێتەوە. دوورکەوتنەوەش لەحەقیقەت یاخود شکستهێنان لەگونجان لەگەڵیدا

---

[1] al-Faruqi, Al-Tawhid: Its implications for Thought and Life, p 17..
[2] Ibid., p43.

بەسە بۆ ڕەتکردنەوەی هەر شتێک لەئیسلامدا، ئیدی ئەوەی ڕەتی دەکەیتەوە یاسای (تشریع)ی بێت یاخود بنەمایەکی ڕەوشتی کەسیی یان کۆمەڵایەتی یان هەر شێوازێک بۆ تێگەیشتنی جیهان بێت. ئەمەش موسڵمان دەپارێزێت لە شوێنەوارەکانی بۆچوون و هەواو هەوەس، چونکە هەر بانگەشەیەک بەڵگەی لەگەڵ نەبێت جگە لەگومان هیچی تر نییەو هیچ لەحەق کەم ناکاتەوە.

بنەمای دووەمیش پەیوەستە بەنادژیەکییەوە. ئەم بنەمایەش کرۆکی عەقڵانیەتەو ئەگەر ئەم بنەمایە نەبێت ئەوا گومان هەڵدەگرێت. چونکە دژیەکی کۆتایی واتای نەگەیشتن بەحەقیقەت دەگەیەنێت، ڕاستە دژیەکی لەبیرکردنەوەی مرۆڤ و گوفتاریدا ڕوو دەدات. لەوانەیە لەتێگەیشتنی روکەشانەماندا  دژیەکی (تناقض) لەنێوان وەحی وعەقڵدا هەبێت. لەکاتێکدا کەئیسلام روودانی لۆژیکی ئەو دژیەکییە ڕەت دەکاتەوە، لەهەمان کاتدا ڕوونکردنەوە دەدات بۆ چۆنیەتی لابردنی ئەو دژیەکییە ئەگەر هاتوو لەتێگەیشتنماندا ئاڵۆزی روویدا.

فاروقی بۆچوونی وایە نەعەقڵ دەتوانێت بەسەر وەحیدا زاڵ بێت، نەوەحی بەسەر عەقڵدا، ئەگەر وەحی پێشخرا ئەوا ئەو بنەمایە بوونی نامێنێت کەدەقێک لەدەقەکانی وەحی لەدەقێکی تر جیا بکاتەوە، یاخود دوو بیرۆکە لەیەک جیا بکاتەوە کەوەحی سەبارەت بەیەک بابەت خستویەتیە ڕوو. ئەو کاتە چارەسەری ئەوەی وەک دژیەکی یاخود وەک نەگونجان لەتێگەیشتنماندا بۆ دەقەکانی وەحی دەیبینین ئاسان نابێت. لەڕاستیدا دەقەکانی وەحی لەخۆیاندا پێکەوەگونجانی نێوخۆییان هەیە. تێگەیشتنی دروستیش بۆی وادەکات دژیەکی بوونی نەبێت. بەڵام لەوانەیە دەقێک لەدەقەکانی وەحی دژیەک بێت لەگەڵ عەقڵی مرۆڤدا، واتە لەگەڵ هەندێک لەدەرئەنجام وتێگەیشتنی عەقڵدا، کاتێ ئەوە ڕوودەدات، ئەوا ئیسلام فێرمان دەکات کەدژیەکی کۆتایی نییە، لێکۆڵەریش ئاراستە دەکات بۆ پێداچوونەوەی تێگەیشتنی بۆ وەحی، یاخود بۆ پێداچوونەوەی دەرئەنجامەکانی لیکۆڵینەوە عەقڵیەکەی، یان بۆ هەردووکیان پێکەوە.

لەگەڵ ئەوەی پێمان وایە بیرۆکەی دژیەکی کۆتایی بوونی نییە، بنەمای یەکخواناسی –وەک گوزارشت لەیەکێتی حەقیقەت- بانگمان دەکات بگەڕێینەوە

بۆ بابەتی دژیەکی لەپێناوی دووبارە سەرنجدانەوەی، چونکە لەوانەیە بیرمان چوو‌بێت لەرەهەندێکی دیاریکراوی ورد ببینەوە، ئەگەر ئەوەمان لەبەرچاو گرت لەوانەیە دژیەکییەکە چارەسەر ببێت.

لەڕاستیدا یەکخواناسی وا لەخوێنەری وەحی دەخوازێت –نەک لەخودی وەحی- کەلەبابەتی دژیەکیدا خوێندنەوەیەکی تر بۆ وەحی بکات، کەئەو لێ تێکەڵبوونە نەهێڵێت و ئەو واتایانەی ناڕوون بوون ڕوونیان بکاتەوە، ئەگەر ئەمە ڕوویدا ئەوا دژیەکی یەکلا دەبێتەوە. لەبەر ئەوە پێداچوونەوەی عەقڵ یاخود تێگەیشتن لەوانەیە کاریگەری هەبێت لەسەر بونیاتنانی پێکەوە گونجان نەک تەنها لەنێوان خودی دەقەکانی وەحیدا، چونکە ئەم دەقانە باڵاترن بەسەر هەر کردەیەکی گونجاندن مرۆڤ ئەنجامی بدات، بەڵکو لەنێوان تەفسیری مرۆڤ و تێگەیشتنی بۆ ئەو دەقانەش. بونیاتنانی ئەو پێکەوە گونجانە وادەکات تێگەیشتنمان بۆ وەحی  لەگەڵ بەڵگە کۆکراوەو دۆزراوەکان لەڕێگەی عەقڵەوە یەکبگرێتەوە. لەبەر ئەوە گریمانەی هەبوونی دژیەکی تەنها لای ئەو عەقڵ لاوازانە ئەمێنێت کەبەبێ بەڵگەش بۆچوونی خۆیانیان لاپەسەندە. لەڕاستیدا مرۆڤی موسڵمان ئەوکاتە عەقڵانیە کەسوورە لەسەر یەکێتی هەردوو جۆری سەرچاوەکانی مەعریفەی وەحی و عەقڵ[1].

وادیارە فاروو‌قی لەم هەڵوێستەیدا لەگەڵ ئیبن تەیمیە یەکدەگرێتەوەو لەوەمان دوور دەخاتەوە کەپێویستمان بەوەرگرتنی بۆچوونی ڕازی و ئیبن روشدو هاوشێوەکانیان لەفەیلەسووفە موسڵمانەکان و موتەکەلیمنی تر هەبێت، ئەوانەی کەگریمانەی بوونی دژیەکی لەنێوان نەقڵ و عەقڵدا دەکەن و عەقڵ بەسەرچاوە (مەرجەع) دادەنێن، چونکە هۆکاری تێگەیشتنە لەنەقڵ. لەوەشمان دوور دەخاتەوە کەپێویستمان بەوەرگرتنی بۆچوونی غەزالی هەبێت لەهەمان بابەتدا، کەئەویش هاوبۆچوونی فەیلەسووف و موتەکەلمینەکانە لەگریمانەی ڕوودانی دژیەکیداو نەقڵ دەخاتە پێش عەقڵەوەو دەیکاتە مەرجەع.

---

(1) .Ibid., p44

| قوتابخانە | بیرۆکە | شێوازی چارەسەرکردن |
| --- | --- | --- |
| ڕازی و ئیبن ڕوشدو... | دژیـــەکی لـــەنێوان عەقڵ ونەقڵدا ڕوودەدات | عەقڵ مەرجەعە |
| غەزالی | دژیەکی لەنێوان عەقڵ ونەقڵدا ڕوودەدات | نەقڵ مەرجەعە |
| ئیبن تەیمیە | دژیـــەکی لـــەنێوان عەقڵ ونەقڵدا ڕوونادات | پێداچوونـــــــــــــەوە بەتێگەیشتنی عەقڵ لەنەقڵ |
| فاروقی | لەوانەیـــە دژیـــەکی لـەنێوان عـەقڵ و نەقڵـدا لـــەڕووی روکـــارەوە ڕووبـدات، بـەڵام ئـەوە دژیەکی کۆتایی نییە | هـیچ بوارێـک نییـە بـۆ باڵادەستی یەکێکیان بەسەر ئەویتریانـــدا، چارەســـەر پێداچوونەوەیـــــــــــــە بەتێگەیشـتنماندا بـۆ نـەقڵ، یـــاخود پێداچوونـــەوە بەدەرئەنجامـە عەقڵیەکانـدا، یـــان پێداچوونـــەوە بەهەردووکیاندا پێکەوە |

بنـەمای سـێهەمی یەکخوداناسـیش کـە گوزارشـت بێت لەیـەکێتی ڕاسـتەقینە، بریتییە لە کرانەوە بۆ قبوڵکردنی ڕوونکردنـەوە نوێیـەکان یـاخود پێچەوانـەکان، ئـەم بنەمایـەش موسـڵمان لـەوە دەپارێزێت کەپێویسـتی بـەڕەوت و ڕێبازەکانی دیکـەی لیبراڵیـەت هـەبێت، یـاخود لەتونـدڕەویی یـان پارێزکاریـدا نغـرۆ ببێـت، بەجۆرێک کەببێتە هۆی چەقبەستن و ڕاوەستانی، لەلایەکی دیکەوە ئـەم بنەمایـە موسڵمان بەرەو خاکەڕایی (تواضع)ی فکری بـەرز دەکاتـەوەو ئـەوەی بەسـەردا دەسـەپێنێت کەدەسـتەواژەی "خـودا زانـاترە-اللـە أعلـم" بڵێـت، چونکـە لـەو بڕوایەدایـە کـە حەقیقـەت لـەوە گـەورەترە کـەمرۆڤ لەهـەموو کاتێکدا پـەی پـێ ببات.




هەروەک چۆن یەکخواناسی بریتییە لەچەسپاندنی ڕەهای تاک و تەنهایی خـودای باڵادەسـت، بەهەمانشـێوە چەسـپاندنی یـەکێتی سـەرچاوەکانی حەقیقەتیشە، چونکە خودای گەورە بەدیهێنەری ئەو سروشتەیە کەمرۆڤ تێیدا مەعریفە وەردەگرێت: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٥) إِنَّ فِي اخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَّقُونَ (٦)﴾ {یونس: ٤-٦}، واتە: (خوا زاتێکە کە خۆری گێڕاوە بە تیشک مانگیشی گێڕاوە بە ڕووناکی بۆ (گەڕانی) مانگ چەند قۆناغێکی دیاری کردووە بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵەکان و حیسابی (مانگ و ڕۆژی) پێ بزانن خوا ئەوانەی دروست نەکردووە بە حەق و ڕاستی نەبێ ئایەتەکان شی دەکاتەوە بۆ کۆمەڵێک کە زانان و تێدەگەن، بێگومان لە جیاوازی شەو و ڕۆژدا و هەرچی خوا دروستی کردووە لە ئاسمانەکان و زەوی دا چەند نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی کە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن).

لەڕاستیدا بابەتی مەعریفە بریتییە لە شتەکانی سروشت و ڕووداوەکانیەتی کەخودا بەدیهێناون، بەدڵنیایی تەواوەوە خوای گەورە ئەوانە دەزانێت، بەهەمان دڵنیایشەوە خودای باڵادەست بەشێک لەو زانینە فراوانە بێسنوورە ڕەها تەواوەی بەمرۆڤ دەبەخشێت.

پاشان یەکخواناسی وا لەمرۆڤ دەخوازێت کەباوەڕوبوون بەخوای بەدیهێنەر لەلایەک ببەستێتەوە بەجێبەجێکردنی زانست لەبوارە جیاوازەکان

لەلایــەکی تــرەوە، چونکــە مــرۆڤ کــاتێ لــەکاری خــودا لەهــەموو شــت و ڕووداوەکان تێدەگات، ئەوا شوێن کردەی بەدیهێنانی خودای گەورە دەکەوێت، کـاتێ کـاری خـودا لەسروشـتدا دەبینێـت، ئـەوا کـار لەزانسـتەکانی سروشـتدا دەکـات، چونکــە بــەدیهێنانی پــەروەردگار لەسروشــتدا هــەر ئــەو ســونەت و یاسایانەیە کەخودای گەورە لەم سروشتەدا دایناوە، کاتێ مرۆڤ کاری خودا لــەخۆیی یــاخود کۆمەڵگاکەیــدا بــەدی ئــەکات، ئــەوا لەزانســتە مرۆییــەکان و کۆمەڵایەتیـەکان ڕادەمێنێـت. ئەگـەر گـەردوون بەگشـتی –لـەمیانی کۆششـی مرۆڤ و گەڕانی– کردەی ئەو سونەت ویاسایانە ئاشکرا بکات کەبەفەرمان و ویستی خودایە، ئەوا گەردوون لەدیدی موسڵماندا بریتـی دەبێت لـە "شـانۆیەکی زیندوو کەبەفەرمان و کردەی خودای باڵادەست دروست بووە"[1].

مامۆســتا فــاروقی ڕوونــی دەکاتــەوە کــەچۆن بــەهای یەکخواناســی ســەرچاوەی بــەهاکانی دیکەیــە لەهــەموو ڕشــتەکان (أنظمــة)ی دیکــەی ژیــانی مرۆڤدا، ئەمەش چەند درەوشانەوەیەکی یەکخواناسیە لەهەندێک لەو ڕشتانەدا:

**١- درەوشــانەوەی یەکخواناســی لەسیســتەمی کۆمەڵایەتیــدا: خێــزان و ئومەت[2]**

ڕێنوێنیـەکانی ئیسـلام تێکڕای ئـەوەی پەیوەنـدار بێت بەلایەنـەکانی ژیانـەوە دەیگرێتەوە، چونکە پێناسـەی ئیسـلام بۆ ئـایین بریتییـە لەدروسـتکردنی ژیـان و جوڵانـدنی مێـژوو لـەکات وشـوێندا، ئەرکەکەشـی ئـەو جێنشـینایەتیەیە کـەخوای گەورە ویستوویەتی مرۆڤ بەجێی بگەیەنێت، بەشی هەرە گـەورەی پەیوەنـدارە بـەڕێککردنی ژیـانی کۆمەڵایـەتی و ڕێکخسـتنی مامەڵـەکان تێیـدا بـەو شـێوەیەی حوکمــەکانی خــوای گــەورە دەیخوازێــت، ئەمــەش تــەنها کاروبــاری خێــزان ناگرێتەوە، بەڵکو حوکمەکانی مامەڵەی دارایی وئـابووری و کاروبـاری دەوڵـەت و کــارگێڕی حکوومــەت و حوکمــەکانی دادگــاو یاســاکانی دەســتەبەرکاری دادپــەروەریش دەگرێتــەوە، هــەموو ئــەو حوکمانــە پەیوەنــدارە بــەواقیعی کۆمەڵایەتییەوە، ئەمـە لەکاتێکدایە کەبابەتـەکانی پەرسـتش و ڕەوشـتەکانی تـاک تــەنها بەشــێکی کــەم لەیاســا ئیســلامییەکان پێکــدەهێنێت، دیــارە زۆرێــک

[1] Ibid., p51.
[2] Ibid., p85-139.

لەحوکمەکانی پەرستشیش بەسروشتی خۆیان کۆمەڵایەتین، وەک: حەج و زەکات و هەندێکیشیان لەڕووی کاریگەرییانەوە کۆمەڵایەتین، وەک: نوێژو ڕۆژوو.

لەمەشدا ئیسلام تەواو لەئایینە رۆژهەڵاتییە هندۆسی و بوزیەکان جیاوازە، بەهەمان شێوە لەئایینی مەسیحیش جیاوازە، لەتێڕوانینی عەلمانیەتی هاوچەرخیش جیاوازە کەنایەوێت کۆمەڵگایەک دابمەزرێت کەبەهاکانی لەئایینەوە سەرچاوەیان گرتبێت. لەڕاستیدا درەوشانەوەکانیی یەکخواناسی لەژیانی کۆمەڵگادا خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کەفەرمانەکانی خودای تاکی بێهاوتا لەژیانی ئومەتدا دێتە دی، چونکە ئەو ئومەتە بەگوێرەی یاسایەکانی خودا بەڕێوە دەچێت کەگوزارشت لەکرۆکی حەقیقەتی ئایین دەکات، هەر ئەویش سەرچاوەی دەسەڵاتە لەژیانی ئومەتدا نەک زۆرینە (دیموکراسیەت)و کەمینە (ئۆلیگاریکی) و تاکڕەوی (ئۆتۆکراتی)و ڕازی نابێت کەتاک یاخود دەستەیەک بەناوی کۆمەڵی خوداوە حوکمی بکەن (سیۆکراتی).

لەڕاستیدا ئەو ڕێنماییە رەوشتییە ئایینیانەی کەئیسلام هێناویەتی ئامانجیەتی ئەو سپاردەیەی کەئیسلام گرتوویەتییە ئەستۆی بەجۆرێک دابڕێژێتەوە کەببێتە بەهایەکی رەوشتی بۆ ژیانی مرۆڤ لەم جیهانەدا، مرۆڤیش ناتوانێت بەو ئەرکە هەڵبسێت بەبێ بوونی سیستمێکی کۆمەڵایەتی. بەهای رەوشتیش رۆحی پەیوەندییەکانە لەو سیستەمەدا، لەو پەیوەندیانەش بۆ نمونە هاریکاری و دەستبارگرتن لەدابینکردنی پێویستییە بنەڕەتیەکاندا لەڕێی کڕین و فرۆشتنەوە، ئالێرەدا رۆڵی سپاردەپارێزی و ڕاستگۆیی و ئەمەکداری لەمامەڵەی نێوان خەڵکیدا دەست پێدەکات، چونکە بوونی کۆمەڵگا مەرجەو هەردەبێت هەبێت تا ئەو بەهایانەی تێدا ببێت، گەشەسەندنی رەنگدانەوەکانی بەهاش لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی ترو لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر لەپێناو ڕێککردنی ئاکاری خەڵک لەکۆمەڵگادا گەشە دەکات، بەگوێرەی کرۆک و مەبەستی ئەو بەهایانە. ئەمەش گوزارشتە لەو نیشانە جەدەلیەی بوون لەنێوان کرۆکی بوون لەلایەک و شێوەکانی بەرجەستەکردنیان لەواقیعدا لەلایەکی ترەوە.

بەڵام كرۆكی بەها پەیوەستە بەتاكە سەرچاوەكەیەوە كەئەویش خودای گەورەیە، چونكە یەكخواناسی جیاكارییەكی تەواو یەكلاكەرەوە دەكات لەنێوان خودای تاك و هەموو بەدیهێنراوەكاندا، لەهەمان كاتدا یەكخواناسی واتە تاك وتەنیایی خودای گەورەو پاشان بوونی یەك مەرجەعیەت بۆ حەقیقەت و بەها، چونكە یەكخواناسی لەهەمان كاتدا ئەو گریمانەیە دەكات كەبەهاكانی بۆ تێكڕای مرۆڤە دروستكراوەكانە بەبێ جیاوازی، هەروەها سوننەتەكانی خودای گەورە لەگەردووندا بەسەر هەموو دروستكراوەكاندا جێبەجێ دەكرێت، تا جووڵەی گەردوون ڕێكبخات، لەبەر ئەوە ویستە ئاكارییەكانی خودا تێكڕای مرۆڤەكان دەگرێتەوە، كەس بەسەر ئەوانی تردا باڵاتر نییە و دەستەو گروپێك بەسەر هی دیكەدا فەرماندەر نییە، بەمجۆرە ئەو كۆمەڵگایەی كەئیسلام بونیاتی دەنێت لەسەر بنەمای باشێتی تاك یاخود خێزان یان تیرەو گەل یان ڕەگەز دانامەزرێت، تەنانەت ئەگەر جووڵەی بونیاتنانی كۆمەڵگاش لەچركەساتێكی دیاریكراودا لەشوێنێكی دیاریكراو لەسەر دەستی كۆمەڵێكی دیاریكراو دەست پێ بكات، ئەوا پێویستە ئەو جووڵەیەی بونیاتنانی كۆمەڵگا بەئاراستەی هەموو مرۆڤەكان بچێت، چونكە كۆمەڵگای ئیسلامی هۆكار (وسيلة)ە، دەبێت تێكڕای جیهان بگرێتەوە، كەئەمەیان مەبەست (غاية)ەكەیە، ئەو كاتە ئەو گشتگیرییە دێتە دی، هەر قەتیسكردنێكی كۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە "گەلی هەڵبژێردراو- شعب مختار" یاخود "خوێنی بەڕێز –دم نبيل" یان ڕەگەزی تایبەت دژیەكە لەگەڵ پێویستییەكانی یەكخواناسیدا.

لەڕاستیدا هەموو شێوەكانی ململانێ وناكۆكی لەجیهاندا هۆكارەكەی بۆ هەستانی كۆمەڵێك دەگەڕێتەوە كەبانگەشەی ئەوە دەكەن خۆیان سەرچاوەی ئەو بەهایانەن كەدەیانەوێت، پشت بەستن بەهەر پێوەرێكی باڵاش لەپێناوی پاراستنی بەهایەكی دیاریكراو كەچارەسەری ململانێكان دیاری بكات ڕەتدەكەنەوە. لەم حاڵەتانەشدا "هێز" دەبێتە بەهای باڵادەست و پاشان گۆڕانكاری و جووڵانی "هێز" لەنێوان تاكەكان و كۆمەڵەو گەلان دەبێتە سەرچاوەی هەمیشەیی بۆ ئەو جەنگانەی كەكۆتاییان نییە.

ئەو سیستەمەی لەكۆمەلگادا داواكراوە پێویستە گشتگیر بێت لەڕێككردنی هەڵسوكەوتی خەڵكی لەهەموو لایەنەكانی ژیان. ناواخنە (مضامين)

کردارییەکانی یەکخواناسیش، واتە ئەو کۆمەلگایەی کەئیسلام دەیەوێت ئەو ناواخنانەیە کەتایبەتە بەکۆمەڵگایەکی جیهانی کەهەموو مرۆڤەکان و هەموو کاروبارەکانی ژیان بگرێتەوەو بەرپرسیاریێتی بەدیهێنانی بەهاکان بخاتە ئەستۆی هەموو تاکێک، ئیدی ئەوە لەباوەڕبوونیدا بێت لەناخەوە بەو بەهایانە یاخود لەبەدیهێنانی کردارییاندا بێت لەژیاندا.

گومانی تێدا نییە کەسیستەمی کۆمەڵایەتی ئیسلامی کەلەسەر بنەمای یەکخواناسی دادەمەزرێت خێزان دەکاتە یەکەی بونیاتنانی کۆمەڵگا و گیانی پەیوەندییە خێزانیەکان و بەهێزبوونیان، لەم ڕووەوە سیستەمی کۆمەڵایەتی ئیسلامی  لەهەر سیستەمێکی تر جیاوازە. ڕێبازی شیوعیەت کەهەوڵیدا رۆڵی خێزان نەهێڵێت بووە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییە خێزانییەکان، گیانی تاکایەتی (الفردانیة) لەرۆژئاوا بووە هۆی پەرتەوازەیی پەیوەندی خێزانی وگەیاندنی بەقۆناغی لەناوچوون.

بیردۆزە ئەنسرۆپلۆژیەکانیش کەلەبەر رۆشنایی ئەو پەیوەندییانەی کەلەنێوان ئاژەڵاندا هەیە سەیری پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤەکان دەکات بەشدار بوو لەشۆردنەوەی مێشکی مرۆڤەکان کەجیاوازی گرنگ لەئارادا نییەو نەهێشتنی رۆڵی ڕێزدارانەی خێزان. بەمەش شارستانییەتی مرۆڤایەتی کەوتە بەر هەڕەشەی لەناوچوون، چونکە شارستانیەت وخێزان دوو حەقیقەتی پێکەوە گرێدراون.

لەوانەیە ئەوەی جێی سەرنجراکێشان بێت ئەوەیە کەگۆڕەپانی خێزان لەقورئانی پیرۆزدا بەڕادەیەکی زۆر لەحوکمەکان ، یاساکانی هاوسەرگیری وتەڵاق و شیردان و میراتیدا بەدرێژی باسکراوەو ڕێکخراوە، ئەمە لەکاتێکدایە کەقورئانی پیرۆز لەمەیدانەکانی تردا تەنها بنەمای گشتی و کەمێک لەحوکمەکانی بەدرێژی باسکراوی لەخۆ گرتووە. بەپێویستی دەزانین ئەوە بخەینەوە یاد کەقورئانی پیرۆز جەختی لەو بەهایانە کردووەتەوە کەپەیوەندییە فیترەتییەکان ڕێک دەخات کەپەیوەستن بەهەستە مرۆییەکانی نێوان تاکەکانی خێزانەوە لەنیشتەجێبوون و خۆشەویستی و سۆزو هاریکاری و ڕاوێژو جگە لەوانە، ئەو بەها فیترەتیانەش بناغەی بونیاتنانی حوکم ویاساکانن.

هـەتا ئێسـتاش خێزانـی موسـڵمان پارێزگـاری لەهەنـدێک لەتایبەتمەندیـەکانی کردووە، ئەمەش بەهۆی پشت بەستنیەوە بووە بەسروشـتی فیترەتـی خێزانـەوە (ڕشـتەبەندی بـەهاکان-منظومـة القیم)، بـەهۆی پەیوەندیشـیانەوە بەحوکمـەکانی شـەریعەتەوە، کەهـەڵقوڵاوی عەقیـدەی یەکخواناسـییە، لەبـەر ئـەوەی مەبەسـت لەدروستکردنی مرۆڤ بەدیهێنانی لایەنی ڕەوشتی ویستی مرۆڤ بووە لـەڕێی کردە مرۆییەکانەوە. ئەم بەدیهێنانەش لەڕێی چوار ئاستەوە بووە: خـودی تـاک و خێزان و تیرە یاخود هـۆز و ئومـەت. گومـانی تێدا نییـە کەئاستی یەکـەم و دووەم، بـەحوکمی بیرۆکـەو سروشـتی مـرۆڤ ئاسـایی و سروشـتین، ئاسـتی سێهەمیش بـەهاکەی لەئاسـتی چوارەمدا دەردەکەوێت، چونکـە هـیچ بەهایـەکی راسـتەقینەی سـەربەخۆی نییـە. جـا ئەگـەر پەیوەنـدی هـۆزو نەتـەوە پەیوەندییەکانی مرۆڤ بەکەسانی ترەوە لەسەر بنەمای خوێن و ڕەنگ و زمـان قەتیس بکات، ئەوا ئەمـە ڕێزی مرۆڤ لەکـەدار ئەکات و گیانی باڵاتر بوون و جیاکاریی دێنێتە ئاراو پاشان ململانێ و جەنگی لێ دەکەوێتەوە.

بـەڵام ئـەو ئومەتـەی کەلەسـەر بنـەمای عەقیـدەی یەکخواناسـی دامـەزرابێت، ئـەوا لەسـەر پێکـەوەگونجان و یەککگرتنـەوە لەگـەڵ فیتـرەتو ئـەو پەیوەنـدی و هاوسۆزی و یەکترتەواوکردنەی لەبەرپرسیارێتیەکاندا داوای دەکات دامەزراوە. یـەکێتی بنـەڕەتی بونیاتنـانی ئـەو پەیوەندییـەش بریتییـە لـەخێزان کەلەبنەڕەتـدا لەهاوسەرگیری ژن و مێرد و ئەوەی بەهۆی ئەو هاوسەرگیرییەوە لەپەیوەندی ژن و ژنخوازی و وەچەخستنەوەو ئـەو منـاڵ ونەوانـەی لێـی دەکەوێتـەوە دێتـە ئـاراو ئـەو چەمکانـەی مامـەو خاڵـە و پـوور کەدروسـتی دەکـات و ئـەو بەرپرسـیارێتیانەی کەدەسـتەواژە قورئانیـەکانی بـەها لـەخۆی گرتـووە، وەک "أولوا الارحام" و" ذوو القربى". ئەم حوکمە شەرعیانە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییـە فیترەتیـە چەسـپاوەکان لـەڕووی لـۆژیکی وعەقڵیـەوە، پێویسـت دەکات لەدەرئەنجامی باوەڕبوون بەوشەی یەکخواناسی کار پێکراوەوە بێت.

بـەبێ پشتبەسـتن بـەخێزان لـەچوارچێوە یاسـا بۆدانراوەکەیـدا، بنـەمای یەکخواناسی لەواقیعی کۆمەڵایەتی مرۆڤدا نایەتەدی.

واتـای یەکخواناسـی بەدیهێنـەر وادەخوازێت کـەتێکڕای مرۆڤـەکان لەبـەردەم خـوای گـەورەدا یەکسـان بـن، لەبـەر ئـەوە بەرپرسیارێتیەکانیشـیان لەبـەردەم

خوای گەورە تاکییە. یەکسانیش لەنێوان نێرینەو مێینەی مرۆڤەکان، لەمافەکان و ئـــەرک وبەرپرســـیارێتییە ئـــایینی و ڕەوشـــتی و مەدەنیەکاندایـــەو دەقـــە قورئانیەکانیش لەم بوارەدا دەقی هەمەجۆرو یەکلاکەرەوەن لەواتایاندا، ئەوەی لەهـــەڵاوێرەکان (إستثناءات)و ڕەنگـــەکانیش لەتایبەتمەنـــدی یـــەکێک لـــەو دوو ڕەگەزە دەردەکەوێت، بۆ جەختکردنەوەیە لەو یەکسانییە لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی هەندێک لەجیاوازییە سروشتیەکان کەبەرپرسیارێتیەکانی تایبەت بەپیاو یاخود ژن لەسەری بونیات دەنرێت. لەبەر ئەوە لەبەرچاوگرتنی جیاوازی لەپێکهاتەی جەستەیی و ئەرکە فیترییەکان دەبێتە هۆی یەکترتەواوکردنی ڕۆڵەکان، بەبێ جیاوازی لەبەهاو پێوەرە ڕەوشتییەکان وبەرپرسیارێتییە ئایینییەکان، چونکە هەریەک لەپیاو و ژن پێویستی بەزیرەکی و لێهاتوویی وهەوڵی کەسیی هەیە کەلەسەر پێویستە ئەنجامی بدات تاهەستێت بەو ڕۆڵەی بەباشترین شێوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لەڕۆڵەکان لەهەندێک بواری کاری ناوماڵ یاخود پیشەیی یان کۆمەڵایەتی تێکەڵی یەکتر دەبن بەبێ ئەوەی کەموکورتی لەخواستە سروشتییە مرۆییەکانی هەریەکەیان دروست ببێت.

خێزانی موسڵمانیش سروشتێکی فراوانی هەیە، کەپشت بەسەربەخۆیی مادی پیاوو ژن، ژن ومێردو دامەزراندنی خێزان نابەستێت، بەڵکو پشت بەهاریکاری دەستبارگرتن لەدابینکردنی پێداویستیەکانی هاوسەرگیری لەتەمەنێکی زوودا دەبەستێت و منالانی نێو خێزان لەگەڵ گەورەکانیدا دەژین و لەژینگەی نێو ماڵدا لانی کەم سێ نەوە دەژین و ڕۆشنبیربوون و وەرگرتنی دابونەریت و پەروەردە لەگەڵ بەهاکان دەبێت و هاسۆزی وخۆشەویستی ئالوگۆڕ دەکەن وڕەنگەکانی ڕێزو خۆشەویستی و سۆز قولتر دەبێت و لەکەشی ئەو خێزانەدا وێنەکانی ژیانی سروشتی دێتەدی، بەجۆرێک کەخۆشی وناخۆشی، پێکەنین وگریان، گاڵتەوگەپ، یاری و قوربانیدانی بۆ یەکدی تێدایەو تێڕوانینێکی گەشبینانەی ڕوو لەئایندە ژیان تێکڕای دەتەنێت. هەموو ئەمانە رووکاری بونیاتی تەندروستی بۆ دەروونی مرۆڤ پێویستن.

بەڵام خێزانی ناوەکی (کەلە ژن و مێرد و منال پێکدێت) ئەوا هەڵبژاردنی لەسەر بنەمای تێڕوانینی مادی بۆ ژیان و جیهان دەبێت و ژن ومێرد تێیدا هەوڵ دەدەن لەبەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتییە فیترییەکان هەڵبێن، بەڵام لەواقیعی

کارەکەدا بەرپرسیاریتی گەورەترهەڵدەگرن، کە ژیانیان پڕ دەکات لەدڵتەنگی و ماندبوون، ئەمە سەرەڕای خاڵی بوونی ژیانیان لەداخوازییەکانی پێگەیشتنی دەروونی و هەستە مرۆییە فیترییەکان و بەدیهێنانی ڕووکارەکانی تەندروستی دەروونی.

کاتێ ئیسلام خێزان وەک یەکەی بونیاتنانی ئومەت سەیر دەکات و چەمکێکی دیاریکراو بۆ خێزان دادەنێت، ئەوا بەهەمان شێوە چەمکێکی دیاریکراویش بۆ ئومەت دادەنێت، چونکە ئومەت زاراوەیکی ئیسلامی دیارەو ئاماژەیە بۆ حەقیقەتێک کەپەیوەستە بەتێڕوانینی ئیسلامەوە بۆ جیهان و جیاوازە لەزاراوەی کۆمەڵگا یاخود کۆمەڵ لەمانابەخشینە زمانەوانی و زاراوەییە بەکارهێنراوەکەیدا. بەهەمان شێوە سەختە گوزارشت لەچەمکی ئومەت بەدەر لەزمانی عەرەبی بکرێت، چونکە ئومەت گەل نییە، دەوڵەت یا هۆزیش نییە، ئومەت لەچەمکی ئیسلامیدا پەیوەندی بەشوێن و جوگرافیایەکی دیاریکراوەوە نییەو هەموو تاکێکی مرۆڤ یان ئەندامن لەئومەی ئیسلامدا یاخود بۆ ئەندامبوون تێیدا بانگکراون.

ئوممەت لەچەمکی ئیسلامیدا جۆرێکە لە"نەتەوە یەکگرتووەکان" کەهەموو تاک و کۆمەڵگاکانی بەئایین کۆدەکاتەوەو حکوومەت و سوپا تێیدا هەڵدەستن بە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئوممەت. ئوممەت بریتییە لەسیستەمی کۆمەڵایەتی ئیسلامی، سیستەمێکە خەسڵەتی جیهانێتی هەیە، بەهۆی ئەوەی ڕێنماییەکانی هەموو مرۆڤەکان دەگرێتەوەو گشتگیرن، چونکە ئەو ڕێنماییانە هەموو لایەنەکانی ژیانیان گرتۆتە خۆ. ئەگەر موسڵمان حوکمێکی شەرعی سەبارەت بەبوارێکی دیاریکراوی ژیان دەست نەکەوت، ئەوا لەسەری پێویستە ئیجتیهاد بکات لەجێبەجێکردنی بنەما گشتییەکان تا حوکمە شەرعیەکەی پێ بدۆزێتەوەو خەڵکی بەخۆویستی و سەرپشکبوون دەچنە بازنەی ئەندامبوون لەئوممەتدا. بەمەش ئومەت دەبێتە کەرەستەی جێبەجێکردنی ویستی خودای گەورە لەگەردووندا، هەتا وشەی خودای گەورە بەرزو باڵا بێت، ئەمەش بەبانگەشە بۆ چاکەو فەرمانکردن بەکاری باش و ڕێگری لەکاری خراپ دەبێت. ئیسلامیش جەخت لەبەها کەسییەکانی وەک دڵسۆزیی و ڕاستگۆیی و سپاردەپارێزی و دەروونپاکی دەکاتەوە، بەجۆرێک کەتاک لەخۆیدا بیهێنێتە دی، بەڵام ئەو

بەهایانــە ئەگــەر نــەگۆڕدرێن بــۆ کــردار دەبنــە گۆشــەگیریەکی ســنووردار کەکاریگەری دروست بکەن لەسەر کات و شوێن و لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگادا بــڵاو ببنــەوەو ســەرکردەکانی جیهــان لــەڕێی یاســا گونجاوەکــانی لەهــەموو بوارەکانی واقعی کۆمەڵایەتییدا بەرەو چاکە ئاراستە بکەن.

لەڕاستیدا گوێڕایەڵی خودای گەورەو هێنانەدی ویستی بریتییە لەو بەهایەی کەبەها بەهەموو شتێک دەبەخشێت، ئەرکی رەوشتی ئەو کاتە واتادار دەبێت کەلەو پەیوەندییانەی مرۆڤ لەژیانیدا لەگەڵ خەڵکانی دیکە دایدەمەزرێنێت لەپەیوەندییەکانی خێزان و دراوسێیەتی و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان و بەکاربردن ومامەڵە بازرگانییەکان و پەیوەندی و گواستنەوەو پەیوەندییەکانی رکابەریتی و ململانێ وجەنگ و ئاشتی ڕەنگبداتەوە. چونکە بەها ڕەوشتییەکان بەبۆچوونێکی نمونەیی (مثالي) دەمێننەوە ئەگەر هاتوو لەپەیوەندییەکانی مرۆڤ وژیانی کۆمەڵگاندا بەرجەستە نەبوون.

لەڕاستیدا یەکێتی ئوممەتی ئیسلامی، یەکیتیەکی ئایینی و ڕەوشتییەو یەکیتیەکی بایلۆجی ڕەگەزی (عرقی) یاخود زمان یان سیاسیی نییە. ئەمەش بوو وای لەپەیامبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کرد جوولەکەکانی شاری مەدینە بەئوممەت ناو بنێت، هەرچەندە لەپەیوەستییان بەکۆمەڵگای مەدینەوەو بەشداربوونیان لەگەڵی لەڕووی پێگەی جوگرافی و زمان و سیاسی و ئەو شارستانیەتەی کەموسڵمان سەربەئەو بوون جوولەکە وانەبوون، چونکە ناسنامەی ئایینی چەمکی ئوممەت دیاری دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا بوونی یەکەیەکی سیاسی و جوگرافی و نەریتی و زمانەوانیی هاریکاری یەکێتی ئایینی ئوممەتەو بەهێزی دەکات، چونکە نزیکەکان لەپێشترن بۆ چاکە لەگەڵ کردن، بەڵام ئەم یەکانە بناغەی پێکهاتنی ئوممەت و دیاریکردنی ناسنامەکەی نین، چونکە ئەوانە خەسڵەتانێکن کە هەن، لەبەر ئەوەی دەکرێت لەدەرەوەی ویستی بن، بەڵام ئەندامبوون لەئوممەت بەواتا ئایینییەکەی لەئاگاییەوە دەبێت و بەهەڵبژاردنێکی خودی خۆویستانە دێتە دی، لەبەر ئەوە زۆرلێکردن لەئاییندا قبوڵکراو نییە.

یەکێتی ئایینی ئوممەتیش وەک پێویست ئەو واتایە دەبەخشێت کەڕێگە بەدابەشکاری لەناوخۆیدا لەسەر بنەمای ئایینی نادات، چونکە بناغەکانی

بیروباوەڕی ئایینی لەئیسلامدا یەکەو جیاوازی قبوڵ ناکات، لەبەر ئەوەی ئەو بناغـە بیروباوەڕیانـە گوزارشـتە لەیـەکێتی ڕاسـتەقینەی ئـایینی "یەکخواناسـی"، تەنانـەت ئـەو کاتەشـی بۆچوونـەکان لـەبارەی تێگەیشـتنی حەقیقەتـەوە زۆر بـن، چونکـە ئوممـەت پابەنـدکراوە بەدامەزرانـدنی کۆڕبەنـدی بیـرورا گۆڕینـەوەو لەیـەکتر گەیشـتن هـەتا ئیجتیهـادە جیاوازەکـان لـەچوارچێوەی گەڕانـەوە بـۆ کۆدەنگی لەسەر پێکهێنەرە سەرەکییەکان سەقامگیر ببێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، یەکێتی ئایینی ئوممەت ڕێگە لەدابەشبوونی کارگێڕی بۆ ڕێکخسـتنی کاروبارەکـانی خـەڵکی لەیەکـەی جـوگرافی و ئـابووری نێوخۆیـدا ناگرێـت، ئەمـەش بەمەبەسـتی ئاسـانکاری پێشکەشـکردنی خزمـەتگوزاری بەباشترین شێوە.

هـەموو چالاکییـەکی مـرۆڤ لەخۆیـدا بەهایـەکی دیـاریکراوی هەیـەو ڕۆڵـی ئوممەی ئیسلامیش ئەوەیە ئەو بەهایە بێنێتە دی، لەبەر ئەوە ئوممەت بۆ هـەر ڕەفتـارێکی مرۆیـی حـوکمێکی هەیـە، چونکـە شـەریعەتێکی گشـتگیرەو هـەموو لایەنـەکانی چـالاکی دەگرێتـەوە. حوکمـە شـەرعییەکانیش لـەکاتی جێبـەجێ کردنیانـدا ڕەچـاوی کـات و شـوێن دەکـات و شـێوازەکانی جێبەجێکردنیشـیان لەگەڵ پێشـهاتەکاندا گەشـە دەکـات، چەندین ڕێسـای ئوصـولیش هـەن کـەبواری نوێکردنـەوەو ئیجتیهـاد سـەبارەت بـەڕووداوە نوێیـەکان دەکـەن و ڕێگـە دەدەن کەبگوترێت شەریعەت بۆ هەموو کات وشوێنێک گونجاوە. ئەمەش وایکردووە ئیسـلام زیندویەتییـەکی تێدا بێت کـەکلیل بداتـە شـوێنکەوتووەکانی بەمەبەسـتی کردنەوەی هەر داخراوێک کەبێتە ڕێگایان، ئەو خەڵکە خۆیان ئەو کلیلانـە بـەکار دەهێـنن و بـەرەو ئاسـۆوە دەکەونـە ڕێ، یـان ئـەوەتا بـەکاری نـاهێنن و لەبەندیخانەکانی دەستەوسانی و دواکەوتوویدا دەمێننەوە.

لەڕاستیدا بـەها باڵاکـان وا لەموسڵمان دەکات هـەموو هـەوڵێک بخاتەگـەڕ و قوربانی بەخۆی بدات لەپێناوی ئیسلامدا، لەکاتێکدا کە هەڵوێسـتێک ئـەوەی لـێ بخوازێـت، ڕێگـری لەموسـڵمان نـەکراوە هـەڵگری ئـەو شـێوازانەی بـەها سوودبەخشـەکان بێت کـە لـەفیترەتی مرۆڤـەوە سـەرچاوەیان گرتـووە، چونکـە خـودای گـەورە ئارەزوویسـتی لـەئافرەتان و منـاڵ و زۆری سـامان و مـاڵ و جـوانی و باشـییەکانی ڕۆزیـی ڕازاندۆتـەوە، لەبـەر ئـەوە هـیچ ڕێگرێـک نییـە

کەموسڵمان بەشی خۆی لەوانە لەدونیا ببات، بەڵام ئەمە پێویستە لەبەر سایەی بەهاکانی دادپەروەری و هاوسەنگی و میانڕەویدا بێت و ڕێگری لەهەر لادانێک بەرەو ستەم و فێڵکردن و قۆرغکاری و زیادەڕۆیی بکرێت، هەتا خەسڵەتەکانی پەیوەندی هاوسۆزی و دەستبارگرتن لەنێوان نەوەکانی ئوممەتدا بمێنێت، ڕێک وەک هاوبەشێتی ئەندامەکانی جەستە لەیەکتر تەواوکردن وهەست بەئازارکردندا. لەهەمان کاتدا، ئەم ئەندامبوونە بریتییە لەئەندامێتیەکی زیندوی کارا کەڕێگە بەدەستپێشخەری کەسی و گەشەی خودی و داهێنانی تاک دەدات، چونکە تاک لەجەستەی ئوممەتدا وەک کەرەستەیەکی لاوەکی نییە، کەکەسێتی خۆی لەدەست بدات و بەرپرسیارێتیدا لەسەر هەڵگیرێت.

بەها لەئیسلامدا ناوەندگیری و هاوسەنگییە، چونکە ئەگەر دەمارگیری هۆزایەتی و ڕەگەزپەرستی، ئیدی لەجوولەکایەتیدا بێت یاخود لەسەردەمی نەفامی عەرەبدا، لەڕوویەکەوە بێ بەهای بگرێتەوە، ئەوا تاکویستی (الفردية) و گۆشەگیریی مەسیحیش لەلایەکی تر بێ بەهایە ، کەواتە ناوەندگیری و میانڕەوی وهاوسەنگی لەئیسلامدا بەهایە.

## ٢- درەوشانەوەی یەکخواناسی لەسیستەمی سیاسیدا[1]:

یەکخواناسی بەهایەکی بەرزە لەئیسلامدا، سەرچاوەی بەهاکانی دیکەیە و ناوەرۆکەکەی لەتێکڕای سیستەمەکانی فیکرو ژیاندا ڕەنگدەداتەوە، لەسیستەمی سیاسیەوە بگرە تادەگاتە ئاستی جوانی و هونەر. لەبواری سیاسیدا بەهای یەکخواناسی بەشێوەیەکی سەرەکی لەیەکێتی ئوممەتدا دەدرەوشێتەوە کەبەمەرجێکی بنەڕەتی بەدیهێنانی مەبەستەکانی جێنشینایەتی سیاسی ئیسلامی دادەنرێت. لێرەدا مەبەست ئەوەیە کەئوممەت یەکەی پێکهێنەری هەرە گەورەیە لەسیستەمی سیاسی ئیسلامیدا. ئەگەر یەکخواناسی بریتی بێت لە سیفەتی خودای تاکی بێهاوتا ئەوا وادەخوازێت کەئوممەت یەک بێت و سەربە ئایینی خودا بێت: ﴿إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ {الانبياء: ٩٢}، واتە: (خەڵکینە بەڕاستی ئەمە ئایینەکەتانە کەیەکەو منیش پەروەردگارتانم کەواتە تەنها من بپەرستن)، ئوممەت چەمکێکی ئیسلامی ناوازەیە خەسڵەتی جیهانێتی

---

[1] Ibid.141-155, and p.185-193.

تێدایە کە ڕەگەزو ڕەنگ و زمان و خاک و دەسەڵاتی سیاسیش تێدەپەڕێنێت، بەمەش وا لەو موسڵمانە دەکات کەپەیڕەوی عەقیدەی یەکخواناسی دەکات بەئەرکی ئایینەکەی هەستێت و بەوەش لەهەر جێگایەکی سەر ڕووی زەوی بژی، مافەکانی دەستەبەر بێت، ئەگەر ڕێگەی ئەوەی پێدرا بێت، بۆشی هەیە پابەند بێت بەیاسامەدەنیەکانی ئەو کۆمەڵگایەی کەتێیدا دەژی کە لەوێ ڕێگەی دراوە ئەرکە ئاینیەکانی بەتەواوی بەجێ بگەیەنێت و دژ نییە لەگەڵ ژیانی ئیسلامیدا، پاشان بەڕەفتارو هەڵس وکەوت و ڕەوشتی دەبێتە نموونەیەکی سەرنجڕاکێشان بۆ لای ئایینەکەی، هانی کەسانی دیکە دەدات بۆ موسڵمانبوون، دوای ئەوەش ئەندامبوون لەئوممەتی ئیسلامیدا. خۆ ئەگەر نەیدەتوانی ژیانی بەو جۆرەی ئیسلام دەیخوازێت بگوزەرێنێ ئەوا ڕێگای کۆچکردنی لەبەردەمدایە بۆ وڵاتێک کەبتوانێت ئەوە بەجێ بگەیەنێت: ﴿وَمَنْ يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً﴾{النساء: ١٠٠}، واتە (هەرکەس لەپێناوی خودا کۆچ بکات ئەوا لەو زەوییەی کۆچی بۆ دەکات جێگەو ڕێگەی زۆرو رزق و ڕۆزی فراوانی دەست دەکەوێت).

لەڕاستیدا سەرقاڵبوونی نەوەی یەکەمی موسڵمانان بەفەرموودەکانی پەیامبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) و ژیاننامەی و ژیاننامەی هاوەڵانی گوزارشت بوو لەسروشتی ئەو ئیسلامەی کەباوەڕیان هێنابوو پێی وبەوەی کەبەها ئیسلامییەکان لەبزاوتی مێژوودا هێنابوویە دی، لەبەر ئەوەی لەپلەی یەکەمدا ئایینێکی کرداریی واقیعی جێبەجێکردنە، نەک بیرۆکەیەکی خەیاڵیی، ئەمەیە درێژەی ئەو ژیاننامانە لەتێگەیشتنی تیۆری ناواقعیەوە بەرەو ئەو بوارانەی کەلەواقیعی کاردا بێتە دی، چونکە ئەو سەربردە کردارییانە نیشاندانی بەها ئایینیەکانە، پاشان کاریگەری پەروەردەیی چالاکی دەبێت کەئەو بەهایانە لەتێگەیشتن و ئەنجامدانی نزیک دەکاتەوە.

**لەتێگەیشتی ئیسلامیدا بۆ چەمکی ئوممەت سێ خەسڵەت کۆبووەتەوە:**

**خەســڵەتی یەکــەم:** ئوممــەت تێڕوانینێکــی یــەکگرتووی هەیــە بــۆ جیهــان، چوونیەکی ئەم تێڕوانینەش لەهزرو تێگەیشتندایە، ئەم تێڕوانینە ئیسلامییە بۆ جیهــان ســەرچاوە دەگرێــت لــەدرک کــردن بــەو بەهایانــەی کەویســتیی پــەروەردگاریان لــێ پێکهــاتووەو ئــەو بزاوتــەی مێــژوو کــەڵێ دەکەوێتــەوەو پەیوەنــدی ئــەم بەهایانــەو جوڵــەیان لــەکاتی ئێســتاو ئاینــدەی ویســتراو و لەکرانــەوەکانی مانــای ئــەم بەهایانــەو بەرجەســتەکردنی مێژووییــان لەگــەڵ پێشهاتەکاندا، کە وادەکات مرۆڤی موسڵمان ئەم بەهایانە بەشێوازێکی نوێوە وەربگرێــت، بەمەبەســتی تێگەیشــتن لــەواقیع و کێشــەکانی و ئیجتیهــادکردن لەدابەزاندنی ئەم بەهایانە بۆ واقیع و پێشهاتەکانی، هەر ئەمەش زیندویەتی و کارایی نوێبوونەوە دەبەخشێتە ئەم بەهایانە.

**خەسڵەتی دووەم:** یەک ئوممەتی لەئەزموون وبەرەنگاربوونەوەکانی واقیع و ڕووداوەکان و تێڕوانینی بۆ کار، بەمەبەستی بەرجەستەکردنی ئەو بەهایانەی کەئــەوەی پێویســتە دیارییــان دەکــات، بــەرەو جێبــەجێکرانی کرداریــی لەســەر ئاستی تاک و کۆمەڵ و سەرکردەکان، بەمەش کۆبوونەوەی ئوممەت لەئامانجە ویستراوەکانیدا دێتە دی و پەیڕەوی کردارییەکەی چالاکییەکانی بەرەو ئەو ئامانجانە ئاراستە دەکات.

**خەسڵەتی سێهەم:** یەک ئوممەتی لەئاراستەکردنی کارو داهێنانی مادی و دەستکەوتی شارستانی دنیاییدا، کەهەموو ئەمانە لەخواستەکانی جێنشینایەتی مرۆڤە، پاشان ئوممەتی ئیسلامی، لەسەر زەوی، بۆ ئەوەی سوودمەند بێت لەخێرو بێرەکانی بەگوێرەی ڕێسا گەردوونییەکان و گەنجینەکانی دەربکات و وزەکانی بخاتە گەڕ، بەمە ئەوەی بۆ مرۆڤ دیاریکراوە لەچێژوەرگرتنی ڕەوا لەم دونیایە دێتە دی و ژیانی گەشە دەکات و ئاسایشی دەروونی وکۆمەڵایەتی بەدەست دەهێنێت، دوور دەکەوێتەوە لەبڵاوبوونەوەی نەزانی و هەژاری و نەخۆشی، یان لانی کەم کەمکردنەوەی شوێنەوارەکانیان.

ئــەم ســێ خەســڵەتە گوزارشــتە لەکۆبوونــەوەی ئوممــەتی ئیســلامی لــەم حاڵەتانەدا، ئەمەش کۆدەنگییە لەتێڕوانین و گۆدەنگییە لەویست و کۆدەنگییە لەکاردا.

لەڕاستیدا ئەو کێشە سیاسیانەی کەجیهانی ئیسلامی ئێستا پێیەوە گیرۆدەیە، زۆرو ئالۆزن، بەلام ئەوەی لەهەموویان زیاتر ئاشکرایە ئەوەیە سەرکردە سیاسییەکان تێڕوانینێکی ئیسلامیانەیان نییە و متمانەیان بەتوانای ئیسلام و پابەندبوون پێیەوە لەدەستداوە کەبتوانن ئوممەت لەو حاڵەی تێیدایە لەلاوازی و دواکەوتن و نەزانی دەرباز بکەن. ئەمە لەکاتێکدایە کەئەم سەرکردانە مەشخەڵی ڕووناکی پێویست بۆ جوولانی ئوممەت بەئاراستەی دروستکردنی مێژوو و پێشەوایەتی و ڕێنوێنی شارستانیانە دادەگیرسێنن، ئەو کاتە جێنشینایەتی ئەبوبەکری صدیق ساتەکانی گزنگ و هەنگاوەکانی سەرەتای دەست بەدەرکەوتن دەکەنەوە.

لەڕاستیدا بەهای یەکخواناسی کەخۆی لەشایەتومان "لا الە الا اللە"دا دەبینێتەوە لەنێو ماناکەیدا ئەوە دەگەیەنێت کەڕێنوێنی پەروەردگار بۆ هەموو مرۆڤەکان گونجاوەو ئوممەتیش بنەمای کۆکردنەوەی مرۆڤایەتییەو چەمکی ئوممەت چەمکێکی ئایینی ئیسلامییەو جیاوازە لەمانا ئایینییەکانی تری جگە لەئیسلام، چونکە ماف دەبەخشێتە پەیڕەوانی ئایینەکانی دیکە کەلەسەر بنەمای ئایینەکەیان کۆببنەوەو هانیان دەدات لەسەر ئەوەو لەکۆمەڵگای موسڵماناندا گونجێنراون، لەگەڵ پاراستنی کیانی ئایینی تایبەت بەخۆیان و دەستووری کۆمەڵگای موسڵمانانیش پەیامێکی کراوەیە بۆ هەموو جیهان، بانگیان دەکات بۆ هاتنە نێو ئیسلام یاخود هاتنە نێو پارێزرانیان لەلایەن ئیسلامەوە، لەپاڵ کارلێککردنی بونیاتنەرانەو هاریکاری بەرهەمدار بۆ پاراستنی مافەکانیان ودەستەبەرکردنی چاودێری بۆیان و ژیان بەهێمنی وئاسایش، بەمجۆرە ئەم خەسڵەتە جیهانییەی بەهای یەکخواناسی و سیستەمی کراوەی بەڕووی جیهاندا بانگەشەیەکی کراوەیە بۆ ئاشتی و گرەنتی نادات کەخەڵکی بێنە ناو ئیسلام، بەڵکو گرەنتی دامەزراندنی پەیوەندیی ئاشتیانەی دەدات کەویستی شەڕ نەهێڵێت و ئازادی مرۆڤ و ڕێزی لەتێگەیشتن وهاوسێیەتی و مامەڵەو هاریکاری لەگەڵ هاوونیشتمانیانی کۆمەڵگای موسڵماندا لەبوارەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و هزرو رۆشنبیریدا دابین بکات و هەموو مرۆڤێک ئازادی رەهای هەیە لەچێژوەرگرتن و هەڵبژاردن، چونکە بێبەشکردنی خەڵکی لەئازادی، پێشێلکردنی ریزی مرۆییە.

کاتێ جیهان پڕ دەبێت لەبەهاکان ئەوکاتە ویستی خودای گەورە دێتە دی و چاودێریکردنی ئەم جیهانە و پارێزگاریکردنی لێی لەلایەن مرۆڤەوە دەچێتە خانەی پەرستشەوە. هەموو شتێک لەدروستکراوەکانی خودا کەرەستەیەکە بۆ هێنانەدی ویستی ڕەهای خوداو بەهایەکی گەردوونی باڵایەو مرۆڤیش دروستکراوێکی ڕێز لێگیراوەو خاوەنی تواناو ویستە بۆ بەدیهێنانی ویستی خودای گەورە، لەتەنگەژەیەکدا نییە کەتوانای دەربازبوون لێی نەبێت، پاشان پێویستی بەفریادڕەس یاخود دڵسۆز نییە، هەموو ئەوەی پێویستیەتی بریتییە لەئەنجامدانی ئەرکەکانی و بەمەش بەڕادەی ئەو دەستکەوتانەی بەدەستی دەهێنێت بەهای بەرز دەبێتەوە. بەهای یەکخوداناسیش بەهەمان شێوە ئەوە دەخوازێت کەویستی خودای گەورە بریتییە لەبەدیهێنانی خێرو چاکەی هەموو مرۆڤایەتی، چونکە کاری ڕەوشتدارانە هەمان بەهای هەیە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەزی خەڵک یاخود ڕەنگیان یان شوینی نیشتەجێبوونیان، ئەمەش وادەکات ژیانی بەڕەوشتانە وەک پێویست جیهانی بێت و سروشتێکی کۆمەڵگایشی هەبێت.

**٣- درەوشانەوەی یەکخواناسی لەسیستەمی ئابووریدا[(١)]:**

مامۆستا فارووقی پێی وایە ڕەهەندی بەهایی کەلەشایەتومان "لا الە الا اللە" دێتە ئارا لەگرنگترین درەوشانەوەکانی یەکخواناسییە لەئیسلامدا، مەبەستی ئەوەیە کەخوای گەورە بەهای کۆتاییەو هەموو شتێکی دیکە بەهاکەی لەخودای گەورەوە وەردەگرێت، بەو ڕادەیەی کەویست و ئیرادەی خودای گەورە بیەوێت. بەپەرستنی خوداش لەلایەن مرۆڤەوە ویستی پەروەردگارێتی دێتە دی، هەر ئەمەش بەهای ڕاستەقینە دەبەخشێتە کات و شوێن، لەبەر ئەوە ئامانجی خوای گەورە لەدروستکردنی گەردوون بریتییە لەبونیاتنانی جیهانێک کە پڕ بێت لەبەها لەڕێگەی بوونی تێڕوانینێکی گەردوونی خودایی لای مرۆڤ بۆ ئەم جیهانە، کەژیانی پڕ بکات لەئاکاری پەسەند. لەڕاستیشدا خودای گەورە مرۆڤەکانی وەها ڕێنوێنی کردووە کەچێژ لەم جیهانە پڕ بەها بنەڕەتییە وەربگرن بەجۆرێک کەخودایان بهێنێتەوە یاد، تێبگات کەئەرکی سەرشانی

---

(1) Ibid.157-183.

پاراستنی ئەم جیهانەو باشترکردن و ڕازاندنەوەیەتی، چونکە هەموو شتێک تێیدا بەهایەکی گەردوونی باڵای هەیە، هەموو مرۆڤەکان یەکسانن و تەنها بەکاری باش (تەقوا) لەیەکتر باشترن. بەهەمان شێوە تێکڕای شتەکان لەم جیهانەدا، ئەوانیش بەگوێرەی ڕێساو یاساکانی خودا بەڕێوە دەچن. بەهای هەریەکەشیان لەڕامبوونیاندایە بۆ مرۆڤ، هەتا ئەم جیهانە بۆ ئەو شێوەیە بەرز بکاتەوە کەخودای گەورە دەیەوێت.

لەڕاستیدا ئیسلام وەک ئاینی یەکخواناسی بەجەختکردنەوەی لەسەر پەیوەندی یەکخواناسی هاوسەنگ لەنێوان مادەو رۆحدا جیا دەکرێتەوە، بەم باشێتیەش هەوڵی بەدیهێنانی سوودو خێرو بێر بۆ تێکڕای مرۆڤەکان دەدات، ئەمەش بەسووربوونی لەسەر کارو سوود وەرگرتن لەخێروبێرەکانی زەوی و خستنەگەڕی وزەو تواناکانی و دابینکردنی خواردن و خواردنەوەو ، پۆشاک و شوێنی نیشتەجێبوون و کۆکرنەوەی سامان و ئەنجامدانی ئاوەدانکاری و دەستەبەرکردنی داخوازییە مادیەکانی ژیان بۆ خەڵک و هەر پێشکەوتن و بەرزبوونەوەیەکی رۆحی کەباشکردنی لایەنی مادی لەگەڵ بێت، خۆ ئەگەر هاوسەنگی نێوانیان تێکچوو ئەوا سیستەمی ژیانی تێکدەچێت.

سیستەمی ئابووریش لەئیسلامدا لەسەر دوو بنەما دامەزراوە، یەکەمیان: ڕەوانەبوونی خراپ سوود وەرگرتنی تاک یان دەستەیەک لەکەسانی تر، دووەمیشیان: ناڕەوابوونی هەستانی هەر تاکێک یاخود دەستەیەک بەئەنجامدانی ئابلۆقەی ئابووری بەسەر ئەوانی تردا یان بێبەشکردنیان. ئیبن خەلدون ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کەچۆن ئەم بنەمایانە ڕێسای گەردوونی و کۆمەلایەتین و مرۆڤیش بەسروشتی خۆی مەدەنیەو ناتوانێ بەبێ کۆبوونەوە لەگەڵ خەڵکی تردا بژی و بەمەش هاریکاری و یەکتر تەواوکاری لەنێو کۆمەڵگاو لەنێو کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیشدا دێتە دی، کەبەرژەوەندیەکانیان پەیوەستە پێکەوەو هەندێکیان پشت بەوانی دیکەیان دەبەستێت. هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەو ڕێوشوێنانەی هەڵوەشاندەوە کەلەنێوان هۆزەکاندا پەیڕەو دەکرا، تا جووڵەی بازرگانی و گواستنەوە ئازاد بکات و عومەری کوڕی خەتابیش (خوا لێی ڕازی بێت) هەموو سنوور ومەڵبەندەکانی گومرگی نەهێشت تاوای لێهات گواستنەوەی خەڵکی

وشتومەکەکان لەنێوان شارو ناوچەکانی دەوڵەتی ئیسلامیدا تەواو ئازاد بوو زیاتر لەوەش جوڵەی بازرگانی دەرەکیش لەنێوان ویلایەتە ئیسلامییەکان و دەوڵەتی بێزەنتی بەئازادی مایەوە تەنانەت لەکاتی جەنگ و دوژمنکاریشدا.

هەروەک چۆن یەکخواناسی لەئابووری ئیسلامیدا بەهاکەی لەدانانی ئەو بنەما گشتییە ئابووریانەدایە، بەهەمان شێوە یەکخواناسی لەڕەوشتی کارو بنەمای وەبەرهێنانیشدا درەوشانەوەی هەبووە، لەوانەش "هاندان لەسەر زۆرترین بەرهەم، واتە مرۆڤ زیاتر لەوەی بەکاری دەهێنێت بەرهەم بێنێت و زیاتر لەو خزمەتگوزاریانەی کەپێویستیەتی پێشکەش بکات و لەکاتی بەجێهێشتنی ئەم جیهانەدا زیاتر لەوەی بەکاری بردووە پێشکەشی کردبێت، لەوانەش دەکرێت بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازی وەها بێت کەسوود بەمرۆڤی بەکارهێنەری ئەو بەرهەمە بگەیەنێت، بەبێ زیانگەیاندن بەو داهاتانەی کەمرۆڤ تێیاندا کراوەتە جێنشین تا بەجۆرێک بۆ خاوەنەکەی بگێڕێتەوە کەباشتر بێت لەوەی کەهەبووە، یان لانی کەم، بەهەمان ئەو شێوە چاکەی کەهەبووەو لەوانەش پێویستە بەرهەمەکان یاخود خزمەتگوزارییەکان هیچ فێڵ وناپاکییەکی تێدا نەبێت، ئەمەش بەتەنها لەترسی دەزگاکانی چاودێری نەبێت، بەڵکو وەک گونجان بێت لەگەڵ ئەو بەها بەنرخانەی کەلەبەهای باڵای یەکخواناسی و فیترەتی ڕەسەنەوە کەکاری چاکە دەخوازێت و لەملکەچبوون بۆ ویستی پەروەردگارو ئەو ئاسوودەیەی کەبەویژدانی دەبەخشێت و ئومێدی پاداشتی رۆژی قیامەتەوە سەرچاوەی گرتبێت.

هەروەک چۆن یەکخواناسی لەئاکاری بەرهەمهێناندا درەوشانەوەی هەبوو بەهەمان شێوەش لەئاکاری بەکاربردنیشدا هەیەتی، چونکە یەکخواناسی بنەمای باشبوون لەجیهاندا دەبەخشێتە مرۆڤی موسڵمان، پاشان رەوایەتی بەکاربردنی پێدەبەخشێت، بەواتای تێگەیشتن لەبەها مادیەکان و بەدەستهێنانی پێویستیە بنەڕەتیەکانی بەڕادەیەکی وا کەزیادەڕەوی وبەهەدەردانی تێدا نەبێت.

زیادەی بەرهەمیش ئەوا دوبارە وەبەرهێنانی بۆ دەکرێت تا بەرهەم زیاد بکات و ئوممەت دەوڵەمەند بکات و خەرجکردنی لەکاری چاک و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتیەکاندا، بەئومێدی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودای گەورەو بەجێگەیاندنی بەهاکانی بەزەییهاتنەوەو دەستباربۆیەکگرتن.

دەروازەکـانی بەخشـینیش بەمەبەسـتی پڕکردنـەوەی پێویسـتییە بنەڕەتییـەکان لەسەر ئاستی تاک ولەسەر ئاستی کۆمەڵگاو دەوڵەتیش کراوەن. لەسەر ئاسـتی تـاک پێویسـتە بـەخزم وکەسـەکانی ببەخشـێت و ئـەو بـڕە زەکاتـەی لەسـەری پێویست کراوە بەو شێوازەی کەدیاریکراوە بیانداتێ و بەشێوەی دیکەش خێرو صـەدەقەیان پـێ ببەخشـێت، لـەکاتی مردنیشـیدا میراتیەکـەی لـەچوارچێوەی سیسـتەمێکی تـەواو ورد و دادپەروەرانـەدا دابـەش دەکرێـت. لەسـەر ئاسـتی دەوڵـەتیش گەنجینەیـەکی دەوڵەمەنـدی لـەداهاتی دیـاریکراوی مـوڵکی گشـتی و زیـادەی زەکـات لەپێویسـتی خـەڵک و لەمافـەکانی کۆمـەڵگا لەسـەرمایەی دەوڵەمەندان جیا لـەزەکات هەیـە، دەوڵـەت بەمەبەسـتی بـەهێزکردنی ئوممـەتو پاراستنی بـەکاری دێنێت و پـرۆژەی وەبـەرهێنانی بەرهەمـداری لەکشـتوکاڵ و پیشەسـازی و خزمەتگوزارییـەکان پـێ ئـەنجام دەدات و ئـەو داهاتانـە وەک مووچە بەسەر سەربازو فەرمانبەرانی دامەزراوە گشتییەکان دابەش دەکات و. ڕێگای پێ دروست دەکات قوتابخانەو نەخۆشخانەو ... هتد پێ بونیات دەنێت.

لەڕاسـتیدا ڕەوشـتەکانی سیسـتەمی ئـابووری لـەکارو بەرهـەمهێنان وبـەکاربردن بەسـن بـۆ هێنانـەدی بەختـەوەری بـۆ خـەڵک لـەژیانی مـادی و ڕۆحیانـدا، لـەچوارچێوەی سیسـتەمێکی بـەهادار کەخەسـڵەتی بەباشـێتی و بەرپرسیارێتی و دادپەروەری تێدایە.

**٤- درەوشانەوەی یەکخواناسی لەبواری سیستەمی مەعریفیدا**[1]:

گرنگـی ڕوونکردنـەوەی پەیوەنـدی یەکخواناسـی بەمەعریفـەوە لەوەدایـە کـەفیکری هاوچـەرخی ڕۆژئـاوا هـەتا ئێسـتاش لـەنێوان دوو بیرکرنەوەدایـە: یەکـەمیان لەسـەر ڕێبـازی ئـەزموونی هەسـتپێکراو دامـەزراوە، وایـدەبینێت کەهـەموو مەعریفەیـەکی ئایینی بریتییە لەمەعریفەیـەکی دۆگمـایی کـەناتوانرێت بسـەلمێنرێت و هـیچ بەهایـەکی نییـە، تـەنها ئەوەنـدە بەسـە کـەتاک مەعریفـەی ئایینی لەسەر باوەڕبوون بەراستبوونی دابمەزرێنێت، بەبێ ئەوەی بکەویتـە بـەر ڕەخنـەی عـەقڵانی و ئـەزموونی هەسـتەکییەوە. بـەگوێرەی ئـەم بیرۆکەیـە مەعریفـەی ئایینی لەعـەقڵی ڕۆژئـاوادا کەوتۆتـە ژێر هـەژموونی ململانێـی تاڵی نێوان کڵێسای مەسیحی لەسەدەکانی ناوەڕاست و عـەقڵی ئـەزموونی زانسـتی،

---

[1]Ibid.39-48, and p.495-60.

چونكـه هەڵوێسـتی كڵێسـا بەرانبـەر مەعریفـە هەڵوێسـتێكی دۆگمـایی بـوو گریمانـەی ڕاسـتبوونی بابەتـەكانی دەكـرد بـەبێ ئـەوەی بخرێتـە بـەر شـیكاری عەقڵی لۆژیكی یان ئەزموونییەوە. كاتێ عـەقڵی زانسـتی لەكۆتاییدا سـەركەوت، پاشان دەستكەوتی بەرچاوی بەدەستهێنا، ئیدی پۆلێنی مەعریفەی ئاینی لەسـەر ئەو بنەمایە بوویە باو. بیرۆكەی دووەمیش لەسەر ڕێبازی ڕۆمانسـییە، ئـەویش وەک بیرۆكەی یەكەمەو بۆچوونی وایە كە مەعریفـەی ئایینی بابـەتێک نییە بۆ بیركردنـــەوەی عـــەقڵانی و تاقیكردنـــەوەی ئـــەزموونیی و لەبەرانبـــەردا جەختكردنـەوە لـەوەی كـە ئـەم مەعریفەیـە لەسـەر بنـەمای ئـەزموونی كەسـیی دادەمەزرێت و ناكرێ تاقی بكرێتەوە، چونكە دەكرێت بۆ خاوەنی ئەو ئەزموونە چـاک و ڕاسـت بێـت، ئەمــەش بەســە بـۆ ڕەگـداكوتانی پایــەكانی ئاییـنداری مەسیحی.

بـەڵام بیروبـاوەڕی ئـاینی دامـەزراو لەسـەر یەكخواناسـی لەئیسـلامدا پشـت بـەوە دەبەسـتێت كـە ڕاسـتیەكانی ئیمـان حەقیقـەتی عـەقڵانین، لەتوانایاندایـە لەتاقیكردنەوەی گومان و تاقیكراوەدا دەربچن، پاشان باوەڕی كەسـی بـاوەڕدار بریتییە لـەباوەڕبوونێكی عـەقڵانی كەلەسـەر بنـەمای بـەرچاوڕوونی و هـەبوونی بەڵگە وتێگەیشتنە.

یەكخواناسـی ئیسـلامی وەک بنەمایـەک بـۆ مەعریفـە ددان بـەوەدا دەنێت كەحەقیقەت لەتوانادایە بزانرێت، ئەویش لەبەر دەسـتی مرۆڤدایە كـاتێ بەكاری جێنشینایەتیەكەی لەبیركردنەوەو گەڕانیدا هەڵدەستێت. بەڵام كـاتێ بیروبـاوەڕە ئایینیەكەی لەسەر بنەمای باوەڕێک بونیات نرابێت كەتێیدا مـرۆڤ دەسـتەوسـان بێت لەگەیشتن بەحەقیقـەت، ئـەوە گومـانی لـێ دەكەوێتـەوە، بـە نـەبوون كۆتـایی دێـت و بـەهای مەرجـەعی تێـدا نامێنێت، چونكـە تێگەیشـتن لەبـەهاكان لەسـەر توانـای مـرۆڤ لەتێگەیشـتنی ئـەوەی بەهاكـە دەیگەیـەنێت و ئـەوەی جیـای دەكاتەوە لەبانگەشە بەتاڵەكان بونیات نراوە.

بەمشـێوەیە یەكخواناسـی لـەكۆتایی ڕێگاكـەدا یـەكبوونی سـەرچاوەكانی مەعریفە لەخۆ دەگرێت، ئیدی ئەو مەعریفەیە وەحی خودایی ڕاستگۆیانە بێت، یان بەڵگە بێت لـەجیهانی گـەردوون و دیاردەكـانی سروشـت، كـەوەحی هانمـان دەدات لێیـان ڕابمێنـین و بیریـان لـێ بكەینـەوەو بەسـەر زەویـدا بگـەڕێین

بەمەبەستی دۆزینەوەو ئاشکراکردنی ڕێساو ڕەوشەکان و تێگەیشتن لەدیاردەو ڕووداوەکان. یەکخواناسیش وەک پێویست ئەوەش لەخۆدەگرێت کەخودای گەورە سەرچاوەی هەموو بەهاکان و تێکڕای جۆرەکانی چاکەیە، چونکە خودای گەورەیە کە نرخ دەبەخشێتە بەهاکان، هیچ سەرچاوەیەکی دیکە نییە بەها بداتە شتێکی تر، لەبەر ئەوە موسڵمان باوەڕی وایە کەکارەکانی خودای گەورە هەموویان خێرو چاکن، خودای گەورەش هێندە لێهاتوویی و توانای بەخشیوەتە مرۆڤەکان کەبتوانن بیکەنە رۆشنایی ڕێگایان، ئەمەش وا لەموسڵمان دەکات کەگەشبین بێت و لایەنەکانی ئاسانکاری و فراوانی لەژیانیدا بەدی بکات و بەبوێری و ئازایەتیەوە بەرەو ڕووی کێشەو ناخۆشییەکان ببێتەوە، چونکە چاوی لەوەیە کە ئەو چاکەی لەپشتی ئەمانە هەیە بەدەستی بێنێت. کاتێ موسڵمان لەگەڵ ناموسڵمان (ئەوانەی پەیڕەوی ئایین و ڕێبازەکانی ترن) مامەڵە دەکات، ئەوا بەدانایی و قسەی باشەوە مامەڵەیان لەگەڵ دهەکات و بەشوێن " هەستی هاوبەش"دا دەگەڕێت کەناکۆکییەکان تێدەپەڕێنێت، بەشوین فیترەتی مرۆیی تەندروستدا دەگەڕێت بۆ مامەڵەکردنەکەی کەهەموو خەڵک هاندەدات بۆ یەکتر ناسین و تێگەیشتن لەیەک و پێکەوەژیان و ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندی و سوودەکان و بونیاتنانی شارستانیەت.

لەکاتێکدا کە تێڕوانینی گەردوونی سروشتی لەئایینی هندۆسیدا پشت بەکۆمەڵێک ئەفسانە دەبەستێت و لەئایینی مەسیحیشدا بەبیرۆکەی کەوتنە نێو خراپە و هەڵە، ئەم تێڕوانینە لەئایینی ئیسلامدا پشت بەوە دەبەستێت کەگەردوون دروستکراوێکی چاک و ڕێکخراو و مەبەستدارەو بۆ مرۆڤ ڕام کراوە، دیاری خودایە بۆ مرۆڤ، تا بتوانێت ئەرکی جێنشینایەتی بەجێ بگەیەنێت. چونکە سیستەم و ڕێکبوون لەگەردووندا وا دەکات مرۆڤ تیبینی ڕێکێتیەکەی بکات و وای لێ بکات فەرمانەکانی خودای گەورە بدۆزێتەوە، کەیاساو ڕێسان و پاشان گەشە بەزانستە سروشتییەکان بدات، بەلام لایەنەکانی کۆمەلایەتی و دەروونی تایبەت بەکۆبوونەوەی مرۆڤەکان، ئەمەیان بەشێکە لەم گەردوونە، بەهەمان شێوەیش ئەمیش دەکەوێتە سایەی ئەو یاساو ڕێسایانەی کەدەکرێت مرۆڤ بیاندۆزێتەوە. هەموو ئەم زانستانە ئەوەیە کە مرۆڤ لەویستی خودای گەورەو فەرمانەکانی بۆ بەڕێوەچوونی کاروباری

گـــەردوون تـــێ بگـــات، بەهـــەموو ئاســـتە سروشـــتی و کۆمەڵایـــەتی و دەروونییەکانـەوە. لەبـەر ئـەوە مرۆڤـی موسـڵمان بـاوەڕی وایـە کـەخودای تـاکی بێهاوتـا تاکـە هۆکـاری هـەموو شـتێکە لەگەردوونـدا، گـەردوونیش بەویسـتی خـودای گـەورە لـەڕێی هۆیـە نوێوەبووەکـان لـەکات و شـوێندا دروسـت دەبێت، هەمووشـیان ملکـەچن بـۆ توێژینـەوەی ئەزمونگـەرایی و بەڵگـەهێناوەی عـەقڵی. ئەم یەکخوداناسـیەش بـاوەڕبوون بـەجادو وشـتی بێبنـەماو ئەفسـانەو پڕوپـووچ ناهێڵێت و بـوار بـۆ جووڵـەی زانسـت بەئاراسـتەیەکی گـەش و بـەرچاو ڕوونانـە دەرەخسێنێت.

هــەتا ئێسـتاش زۆرێـک لـەزانایانی رۆژئـاوا بیرۆکـەی خواوەنـدی خـالقی کاربەڕێوەبەر ڕەت دەکەنەوە، ئەمەش لە رق لێبوونیانەوە بـۆ دەسـەڵاتی کڵێسـا سەرچاوەی گرتووە کەبرەوی بەگوتەی بێبنەما (خورافی) دەداو بزاڤی گەڕان و دۆزینەوەی زانستی دەخنکاند، لەڕاستیدا کڵێسا جۆرەهـا شـێوەی سـتەمکارانەی لەسەرکوتکردنی زاناياندا بـەکارهێنا بەمەبەسـتی پاراسـتی دەسـەڵاتەکانی، بـەڵام لەکۆتاییـدا جووڵــەی زانســت دەســەڵاتەکانی کڵێســای شکســت پێهێنــاو ئــەو شکستەشـی بـووە هـۆی ڕیشـە داکووتـانی ئـەوەی پێـی دەوترێـت عەلمانیـەت کـەواتای نەهێشـتنی باڵادەسـتی ئـایینی کڵێسـای بەسـەر پێشـکەوتنی زانسـتیدا دەگەیاند، ئـەوەش کـارێکی ڕەواو جێگـای پێـزانین بـوو بـەڵام ئـەم عەلمانیەتـە - بەداخـــەوە دواتـــر- ســـنووری ڕەتکردنـــەوەی دەســـەڵاتی کڵێســـای بـــەرەو ڕەتکردنەوەی هەموو ئایین بەزاند.

بەمشێوەیە یەکخواناسی مـەرج بـوو بـۆ دەسـتپێکی گەشـەی زانسـت، چونکـە خـودای تـاکی بێهاوتـا سیسـتەمی گـەردوونی لەسـەر بنـەمای ڕێسـاو یاسـا دامەزرانـدووە، ئـەم یاسـایانەش لەڕێگـەی گـەڕانی زانسـتیەوە مـرۆڤ دەتوانێت ئاشکرایان بکات، کەئەو گەڕانە لەسەر بەڵگەداری عەقڵی و ڕامانی ئەزموندارانـە ڕاوەسـتاوە. گـەردوونیش بەهـەموو شـت و ڕووداو و دیاردەکانیـەوە، تێکـڕا لەبوون و ڕەوت وجووڵەیدا بەپێی یاساو ڕێساکانە، تا بەو جۆرە ئـەو خواسـت و ویستانەی خوای گەورە هەیبووە بهێنێتە دی، چونکـە سیسـتەم و هاوسـەنگی و ومەزنـدە لەدروسـتکراوە بینـراو و دروسـتکراوە نەبینراوەکانیشـدا لەلایـەن مرۆڤەوە لەسەر وشکانی و ناو دەریاو ئاسمانەکانیش هەموویان بەشدار دەبن

لەپاراستنی ئەم گەردوونە بەویستی خودای گەورە و مانەوەی بەچاکی هەتا ئەو کاتەی خودا ویستی لەسەر بێت.

تێگەیشتن لەڕێکوپێکی وپێکەوگونجان و جوانی ئەم گەردوونە، بەرزی و باڵادەستی و مەزنی دروستکاری نیشان دەدات، بەڕادەیەک کەعەقڵی مرۆڤ لەبەردەمیدا دەستەپاچە دەوستێت، وەک گوزارشت لەسەرسوڕمان و پێزانینی، پاشان تێگەیشتن لەو بەها هەرەبەرزەی کەویستی خوداو تاک وتەنهاییەکەی دەنوێنێت. لەبەر ئەوە مرۆڤ هەر دەبێت تێبگات کەئەم گەردوونە موڵکی خودایەو مرۆڤیش جێنشینە تێیداو وەک سپاردە خراوەتە بەردەستی و دەبێت بیپارێزێت لەتێکچوون و بەکاربردنی بەشێوەیەکی وێرانکەر، لەو سنوورە ڕەوشتییە بەرزەشی بۆی دیاریکراوە بۆی هەیە سوودمەند بێت لەخێرو بێرو وزەی و خۆی دوور بگرێت لەزیادەڕۆی وبەهەدەردان و قۆرغکردن و فرت وفێڵ و گزی تا نیعمەتە زۆرەکانی خوای گەورە بۆ مرۆڤەکان بگاتە هەموو خەڵکی، لەهەموو نەوەکان و تەواوی گەل و نەتەوەکان، بەبێ ئەوەی بەشی هیچکام لەنەوەکانی داهاتوو فەرامۆش بکرێت.

ئەمە تێڕوانینی ئیسلامیانەیە بۆ گەردوون ومرۆڤ، بەڵام تێڕوانین سەبارەت بەگەردوون لەشارستانییەتەکانی دیکەدا زۆر لەمە جیاوازە، بۆ نموونە شارستانییەتی گریکی شارستانیەتێکی بتپەرستییە، باوەڕی بەبوونی فرەخواوەندی هەیە، خواوەندەکانی لەشێوەی خەسڵەتە ناسراوەکانی مرۆڤدا بەجۆری خێرو شەڕو چاکەو خراپە وێنا کردوون، لەبەر ئەوە نامۆو سەیر نییە کەئەم شارستانییەتە خواوەندەکانی لەشێوەی ئەو بوونەوەرانەدا وێنا بکات کەیەک لەدژی یەکتر دەجەنگن و پەنا بۆ فێڵ وتەڵەکە و پلانگێڕی دەبەن و داوێنپیسی و دزی ئەنجام دەدەن و ڕق وکینەو تۆڵەسەندنەوەیان هەیە، بەتەواوەتی وەک ئەوەی لەواقیعی مرۆڤدا هەیە، بەهۆی ئەوەی خواوەندەکان بەو شێوەیەن لەبەر ئەوە هیچی تێدا نییە کەمرۆڤەکانیش بەهەمان شێوازی خواوەندەکان ڕەفتار بکەن، بەمجۆرە مرۆڤەکان خواوەندییان لێ دێت! بەڵام ئایینی مەسیحی باوەڕی بەهەڵەی بنەڕەتی هەیە کە وایکردووە ڕەگەزی مرۆڤ شکستخواردو سووک بێت و توانای هەستانەوەشی لەو حاڵەتەی کەوتنی نییە تا خواوەند لەمەسیحدا بەرجەستە نەکات، بەسەر خاچەوە ئەمرێ بۆ ئەوەی

گوناهـەکانی مرۆڤايـەتی بسـڕێتەوە. ئـاييني هندۆسـيش وای کـردووە زۆرينـەی خـەڵکی هند لـەچيني بێزراوان بێت و ئەوانەشـی هندۆسـی نـين بـەپيس وگـڵاو وەسـفی کـردوون و خەسـڵەتی بـاڵای بـۆ دەسـتەی براهمـەکان هێشـتۆتەوە کەدەستەيەکی کەمنو گواستنەوە لەچينێکەوە بۆ چينەکەی تر نييە پـاش مـردن نـەبێت، ئـەويش کەئـەويش ڕۆحەکـەی دەچێتـە کەسـێکی تـرەوە (دۆنـاودۆن)، کاری ڕەوشـتيش لەژياندا هـيچ نرخێکی نييـە. ئـاييني بـوزيش وا سـەيری ژيـان دەکـات کـە نەهامـەتی و بێنـەوايی و ناڕەحەتييـە بـۆ مـرۆڤ و هـەموو دروسـتکراوەکان. ڕۆڵـی مـرۆڤيش لـەم ژيانـەدا تـەنها بريتييـە لـەخۆدەربازکردن لەو چارەنووسە بەخۆرێککردن و ڕامان و بيرکردنەوە.

هيچ عەقيدەيەکی تـر نييـە جگـە لەيەکخواناسـی ئيسـلام کـەڕێزو پێزانينـی بـۆ مـرۆڤ هـەبێت، کە نـە ئەوەيـە بيکـات بـەخودا نەئەوەيـە بـێ بـەهای بکـات، جگـە لەعەقيدەی خوداناسيش نييە کەبەهای ڕەوشتی و تێڕوانينی ئـەرێنی گەشـبينانە بەرانبەر ژيان بەمرۆڤ ببەخشێت، ئا ئەمەيە مرۆڤدۆسـتيی ئيسـلام. مەبەسـتيش لەدروستکردنی بريتييە لەپەرستنی خودا، کەدەبێتە هۆی باشـترين چاکـەو ژيـان پڕ لەبەها دەکات. لەڕاستيدا ژيـان مەبەسـت و ئامـانجی بـەرزی هەيـە کەئـەويش بەديهێنانی ويستی چاکی خودايە لەئاستە هەرەبەرزەکان وپلـە هـەرە بڵندەکانـدا، بـــەبێ فەرامۆشـــکردنی شـــێوازەکانی ديکـــەی ويســـتی خـــودا کەبـــەهۆکارو کەرەستەی ئاوەدانکاری گەردوون دادەنرێن، لـەخواردن وخواردنـەوەو شـوێنی نيشتەجێبوون و هاوسـەرگيری و پەيوەنديـە خێزانييـە کۆمەڵايەتييـەکان و جگـە لەوانەش.

بەتەنها مرۆڤ لەدروستکراوە بينراوەکاندا خاوەنی ئازادييە لەهێنانەدی بـەها ڕەوشـــتييەکان، بـــەهۆی ئـــەو تواناياتـــەی کـــەپێی دراوە جگـــە لـــەو بەدروستکراوەکانی تر نەدراوە، هەموو تاکێکی مرۆڤ کەلـەدايک دەبێت پـاک و بێگوناهـە، هـيچ گونـاهێکی نييـە لـەباوک وباپيرانيـەوە بـۆی مابێتـەوە، يـاخود لەهۆزو تيرەو تيشتمانەکەيەوە، ڕاستە يەکێک لەخەسڵەتەکانی سروشتی مـرۆڤ مکوڕ بوونە لەتێرکردنی ئارەزووەکان و بەدەستهێنانی چێژو هـەبوونی هێز و ڕووکارەکـانی تـری کـەم کـورتی، بـەڵام هـەموو ئەوانـە بـريتين لەحەقيقەتـەکانی سروشـت کـە بـۆ مـرۆڤ بـەديهێنراوەو ئـەم سەرپشـک نـەبووەو بەبوونيشـيان

لەسروشتی خۆیدا گوناهبار نابێت، بەڵکوو بریتین لەو پێکهێنەرانەی کە ڕێزو پێزانینی زیاتر بەمرۆڤ دەبەخشن، ئەو کاتەی بەهۆی پێگەیشتوویەتی ئاکارو ڕەوشتیەوە بەرەو هەڵبژاردنی کارە چاکە بەسوودەکان بەرز دەبێتەوە، کە لەگەڵ ئەو بەرپرسیارێتیانەی جێنشینایەتی و سپاردەو هەوڵدان بۆ هێنانەدی بەها باڵاکان گونجاوە.

مرۆڤیش لەتێڕوانینی یەکخواناسی ئیسلامیدا بەباشترین و چاکترین شێوەی جەستەیی و پێکهاتەی ڕۆحی دروستکراوە، خوای گەورە ڕۆح و عەقڵ و توانایەکی هەستی وەهای پێبەخشیوە کەبتوانێت زانست بەدەست بهێنێت و تاقی بکاتەوە و بەرجەستەی بکات، ئەمەش لەنێو هەموو مرۆڤەکاندا هاوبەشە. عەقڵی مرۆڤ بەنرخترینی بەخششە کەخوای گەورە بەمرۆڤەکانی بەخشیوە، بەهۆیەوە ئەرکباری هەڵگرتنی سپاردەی دەکەوێتە ئەستۆ و بەنەبوونی عەقڵیش بەرپرسیارێتی لەسەر مرۆڤ هەڵدەگیرێت. هەر بەعەقڵ مرۆڤ کاروبارەکانی ئەنجام دەدات وبەرپرسیارێتی خۆشی وناخۆشییەکان دەگرێتە ئەستۆ، لەبەر ئەوە کاتێک کارێک هەڵدەبژێرێت لەو نیەتەی کەپاڵنەرە بۆ ئەو کارە هەنگاو هەڵدەگرێت و بەو دەرئەنجامانەی کەبەهۆی کارەکەوە دێنە ئارا، کۆتایی پێدێت. هەر خۆی بەرپرسە لەنیەت و ئەنجامی کارەکەی، لەبەر ئەوەی نیەت باشی بەشێکە لەباشێتی کار، بەمەش مرۆڤ بەهەوڵدان، مێژووی مرۆڤایەتی دروست دەکات.

یەکخواناسیش لەئیسلامدا یەکێتی چالاکی مرۆیی لەو شێوازانەدا دەگرێتەوە کەتاکەکانی ئوممەت تێیدا هاوبەشن، لەو کارو یاسایانەی بۆ ڕێکخستنی ژیانیان دایدەنێن، بەمەبەستی هێنانەدی ویستی خوای گەورەو سەروەری ئەو بەهایانەی کەگوزارشتی لێدەکات و شێوەکانی ئەو چالاکییە ئەخلاقییە مرۆییانەی کەئوممەت بەتاکەکانی، وەک دەستەو کۆمەڵیش ئەنجامی دەدات بەجۆرێک فراوان ئەبێت کەتێکڕای جیهان وهەموو خەڵکیش دەگرێتەوە. شێوەکانی ئەو چالاکییە ئەخلاقیانەشی کەموسڵمانان لەژیاندا ئەنجامی دەدەن بەجۆرێک فراوان ئەبێت کەداخوازی و پێویستییە فیترەتییەکان پڕ بکاتەوە، هەربۆیە نەگۆشەگیری و نەسزادانی جەستە و نەدونیا نەویستی و نەڕەشبینی لەئاست جوانیەکانی تێدایە، بەڵکوخواردن و خواردنەوە، هاوسەرگیری و

چێژوەرگـرتن، خۆشەویسـتی و هاوڕێیـەتی نێـوان خـەڵک و ئاسـوودەبوون بەبینینی دیمەنە دڵڕفێنەکانی سروشت و ، کشتوکاڵ و پیشەسازی و هونەر و مەدەنیەتە، هەموو ئەوانەش پەرستنی خودایە، چونکە بەهاوسەنگی و دانایی و دوور لەدەسـتدرێژی و قۆرغکـاری و زیانگەیانـدن و زیـادەڕەوی، بـەئامانجی پشت پێ بەستنی لەهێنانەدی خێرو چاکە بۆ کۆمەڵ بەو شێوەیەی کەخوای گەورە داوای کردووەو لەپێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا.

کاتێ مرۆڤ باوەڕی بەعەقیدەی یەکخواناسی ئەبێت ئەم عەقیدەیە لەنیەت و کاریـدا دەگۆڕێـت بـۆ هێزێکـی ڕەوشـتی، پـاڵی پێـوە دەنێـت بـۆ جـووڵان لەگەردوونـدا بەمەبەستی هینانـەدی ویستی خـوای گـەورەو دەچێتـە گۆڕەپانـە جیاوازەکـانی ژیـان لەهــەموو بوارەکـانی چـالاکی مرۆیـدا، هــەتا گۆڕانکـاری پێویست ئەنجام بدات.

لەڕاستیدا ئەم جیهانە جیهانی هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی و کێڵگەی ئـەو کارەیـە کـەمرۆڤ بەهۆیـەوە ئـەرکی خـۆی لەگەردوونـدا ئـەنجام دەدات. جیهانێکی دیکەش هەیە لەویژدانی نادیاریدا، ئەویش جیهانی زیندووبوونەوەو لێپێچینەوەیە. کاتێ کات و ساتی کۆتـا دێت، ئیدی بواری بەدەستهێنانی ڕۆزی و هەوڵدان نامێنێت، بەڵکوو پاداشت و لێپرسینەوە لەسـەر ئـەو کارانـەی مرۆڤ لەژیانی دونیایدا ئەنجامی داوە دێتە ئارا. مێژوو لەدونیاوە بەرەو قیامـەت درێژ ئەبێتـەوە، ئـەویش ڕەهایـەکی حـەتمی پێویست نییە، بـەڵکوو بریتییە لـەکرداری مـرۆڤ و ئـەوەی بەدەستی هێنـاوەو سـەرکەوتن وهەڵـەکانی، لەکۆتایشـدا هـەر خـۆی بەرپرسـە لەسـەرئەنجامی ئـەو کارانـەی. لەبـەر ئـەوە مـرۆڤ تـەوەری مێژووەو ئەو ئەرکەی لەسەر شانە کەویستی خودای گەورە لـەمێژوودا بهێنێتـە دی.

ئابــەم شــێوەیە لەسەرگوزشــتەی پەیامبــەر (درووودی خــوای لەســـەربێ) تێدەگەین، پاش هاتنەوەی لەئەشکەوتی حەرا، کـاتێ کەپەیامەکەی هـەڵگرتووە، فـەرمانی بۆهـات کەهەستێت "قـم فأنـذر". ئیـدی بـەپێی ویسـتی خـودا دەسـتی بەجووڵە کرد، ئـەوە بـوو پەیامەکـەی ڕاگەیانـدو بەرگـەی نەهامەتییـەکانی گـرت، لەجیگەیەکەوە بۆ جێگایەکی تر ڕۆشت و داواکاری ئەبوتاڵبی مـامی ڕەتکردەوە کـەداوای ڕاگرتنـی کارەکـەی لـێ دەکـرد کەئـەوویش هەوڵـدان بـوو بـۆ گـۆڕینی

کۆمـەڵگا. لەکاتێکدا کەئـەو لـەپێناوی گەیانـدنی پەیامەکـەی و بـەجێهێنانی ئـەو ئەرکەی پێی سپێردراوە بەرەو شاری مەدینە کۆچی کردو دەوڵەتی دامەزراندو دەستووری دارِشت و وەک هاوسەر و باوک و باپیرو هاورِێ ژیاو هـەژاری و نارِەحـــەتی بینـــی و چـــووە چەنـــد جەنگێکـــەوەو لەهەندێکیانـــدا ســـەرکەوت و لەهەندێکیشدا سەرکەوتنی تەواوی بەدەست نەهێنا و کاری داوەری و دادگای کردو لەهەموو ئەوانەدا پێشەنگ بوو بۆ هاوەڵانی، ئەوانیش شوێنپێیان هەڵگرت و وڵاتانیـان رِزگـار کـردو سیسـتەمیان بـۆ دانـاو شارسـتانیەتیان دامەزرانـدو لاپەرِەکانی مێژوویان پرِ کرد لەمەعریفە و زانست و دەستکەوت.

**٥- درەوشانەوەی یەکخواناسی لەسیستەمی جوانیدا[1]:**

هونەرمەنـدی موسـڵمانی لەرۆشـتنی لەسـەر رِێگـای بیرکردنـەوەی هـزری یەکخواناســی هونــەری رازاندنــەوە (فـن التـزيين)ی داهێنـاو گەشـەی پێـدا بـۆ رِێککـردن (نســق)ی هــەڵکۆڵین لەســەر دار(ئەرابســک) لەهونــەری وێنــەگرتنی تەجریدی، کەبەشێوەک کەکۆتاییان نەیەت بەهەموو ئاراستەکاندا درێژ دەبێتەوە تا لەسروشتە مادییەکـەی شـتەکان هەیانـە جیـا دەبێتـەوەو دەگۆرِێت بـۆ مایـەی سەیرکردن. تەنانەت کاتێ هونەرمەندی موسڵمان شێوەی رِووەک یان ئاژەڵ یـاخود مـرۆڤ بـەکار دەهێنێت لەوێنەکێشـانیدا، شـێوازەکەی لەسروشـتی مـادی دەردەچێت و کەلـەپووری زمانـەوانی و ئـەدەبی خـۆی ئاوێتـە دەکـات و دەبێتـە تابلۆیــەکی پــرِ مانــاو بیرۆکــەو بــەجۆرێک جــوان وبــەهادار ئــەبێت کەببێتــە نەخشــێنەری رِازانــەوەی رِووی دەرەوەی باڵەخانــەکان و ســەر زەمینەکــەی. بەمــەش یەکخواناســی بریتییــە لــەو بەهایــەی کەرِاڤــەی کــارە هونەرییــەکانی هونەرمەندی موسڵمان دەکات کەئیسلام تێرِوانینی بۆ گەردوون دارِشتووە کە تییدا رِەچاوی شوێنی جوگرافی یاخود خەسڵەتی لەزماندا یان نەژاد نەکراوە.

لەرِاســتیدا نــەبوونی هونــەری بەرجەســتەکردن (الفنــون التشخيصــية) لەپەیکەرتاشـی (نحـت) و وێنەکێشـان و درامـا لەهونـەری ئیسـلامیدا گوزارشـتە

[1] Ibid195-215.

لەبـەهای ڕەهـای یەکخواناسـی کـەخۆی لـەپاک وبێگـەردی پـەروەردگاری دروسـتکار لەسـیفەتەکانی دروسـتکراوان دەبینێتـەوە، پاشـان جیاکردنـەوەی یەکخواناسـی لەهاوبـەش بڕیـاردان و بـەرزی پـەروەردگار لەبەرجەسـتەکردنی سروشتی. چونکە گوزارشتکردن لەخودا بەشێوەیەک لەشێوەکانی سروشت، با تەنانەت وێنەی خودی مرۆڤیش بێت، بریتییە لەگوزارشتێکی رووکەشی سادەو ساکار، کەدوورە لەو بەرزی وبالآیەی شایستەی پەروەردگارە. ئەمە لەکاتێکدا کەتێگەیشـتنی ئیسـلامی بەشـێوەیەکە کـەناتوانرێت بەشـێوازی مـادی بینـراو گوزارشت لەخودای گەورە بکرێت کەئەوەش ترۆپکی جوانییە کە مرۆڤ پێی بگـات. لەڕاسـتیدا هـیچ دروسـتکراوێکی مـادی ناتوانێت لەبـەرزی وتەواومەنیـدا لەپەروەردگار بچێت، چونکە هیچ شتێک هاوشێوەی ئـەو نییـە، ئەمـەش لوتکـەی پەی پێبردنی جوانییە.

مامۆسـتا فـارووقی وایـدەبینێت کەهونـەر لەعەقیـدەی یەکخواناسـیدا بریتییـە لەخویندنەوەی سروشت بۆ کرۆکێک کەسروشتی نییەو ئەو کرۆکەش شـێوەی بینـراوی گونجـاوی پـێ ببەخشـرێت، ئەمـەش وەک پێویسـت گریمانـەکردنی دۆزینـەوەی نەبوویەکـە لەسروشـتدا، ئـەوەش لەدەرەوەیـەتی و پـاک وبێگـەردە لێی و تەنها تایبەتە بەدروسـتکاری بالآدەسـتی. ئـەم کرۆکـەش کەدەبێتـە بابـەتی چێژ وەرگـرتن و تێگەیشـتنی جـوانی، بریتییـە لەبـەهای جـوانی کەهـەر ئـەویش جولێنەری هەسـتە مرۆییەکانـەو ئـەم هەسـت وسـۆزە مرۆییانـە بـەرز دەبنـەوەو بەرزێتیەکەیان لەسەر شێوە مادییەکانەو خاڵییە لەبەهای ڕاستەقینە.

لەمبارەیەشـەوە مامۆسـتا فـاروقی ڕاڤەیـەکی جـوانی سـەبارەت بەبـەهای گوزارشـتی جـوانی لەئیسـلامدا خسـتووەتە ڕوو. کەئـەویش گوزارشـتە لـەوەی کەناتوانرێت گوزارشتی لێ بکرێت! چونکـە گوزارشـتکردنی هەسـتی لەنـەتوانینی گوزارشـت لـەخودا بەشـێوەیەکی هەسـتپێکراو کارێکـە هونەرمەنـد سەراسـیمە دەکـات. هونەرمەنـدی ئیسـلامیش لـەچوارچێوەی ئـەوەی فـاروقی ناوینـاوە "بلیمەتی هونەری ئیسلامی" و"تێپەڕاندنی هونـەری ئیسـلامی". مامۆسـتا فـاروقی

نمونەی ئەمەی هێناوەتەوە کاتێ هونەرمەندی موسڵمانی بەنەمام یاخود گوڵ دەچوێنێت کەدوور بێت لەشێوەی تاکی خۆی، بەڵکو وەک دووبارەبووەوەیەکی بێسنوور وێنای کردووە، بەمەش لەتێگەیشتنی مرۆڤدا تاکبوونی هەڵوەشاندۆتەوەو خەسڵەتی سروشتی لێ دەرکردووە، چونکە گوزارشتی جوانی لەبێکۆتاو گوزارشت نەکراو بەهۆی دووبارەبوونەوەی بابەتە تێکەڵاوەکەوە بریتییە لەهەوڵدان بۆ گەیشتن بەئەنجامێکی هاوشێوەی شایەتومان (لا اله الا الله) لەدەربڕینی زارەکیدا.

مامۆستا فاروقی هەندێ لایەنی باڵای زمانی عەرەبی و شیعری عەرەبی ڕوون کردووەتەوە، ئەویش ئەو لایەنانەیە کەعەرەب پێش ئیسلام شانازییان پێوە دەکرد، پاشان کە قورئان هات زمانی عەرەبی گەیاندە لوتکەو باڵاییەک، کەبەهاکانی جوانی وپێوەرەکانی و گوزارشتە دەروونییە هەرەباشەکان لێی، لەشێوەی بینراو و دەنگی بیستراو و واتا گشتی قووڵ بۆ عەرەب و پاشان بۆ موسڵمان دروست کرد، لەکۆتاییشدا فارووقی لەچەمکی ڕێککراو (نسق)، واتە (ئەرابیسک) و دەرکەوتنەکانیدا لەوێنەکێشانی شێوەکان و نووسینی خەتی عەرەبیدا بەجۆرێک کەلووتکەی هونەری جوانی هەرەبەرزو جوانە ڕوون کردووەتەوە.

# درەوشانەوەکانی یەکخواناسی لای فاروقی

## سیستەمی مەعریفە

مەرجەعیەتی یەکخواناسی لە سەرچاوەکانی مەعریفەو، کەرەستەکانی بەدەستهێنانی بەگوێرەی مەنهەجیەتەی تەواومەندی مەعریفە.

حەقیقەتەکانی ئیمان حەقیقەتی عەقڵانیە لەسەر روونی و بەڵگەداری و مانابەخشی و روونی هەیە.

هەموو زانستەکان بریتین لەتێگەیشتنی مرۆڤ بۆ فەرمانەکانی خودا لە بەڕێوەچوونی گەردوونی سروشتی و کۆمەڵایەتی.

## سیستەمی کۆمەڵایەتی

یەکیتی مەرجەعیەت لەحەقیقەت وبەهادا ئاشتی دێنێتە دی.

یەکیتی کۆبوونەوەی مرۆڤایەتی لەیەك خێزانەوە دەستی پێکردو درێژ بوویەوەو فراوان بوو.

ناوەرۆکی یەکخواناسی کۆمەڵگایەکی جیهانی بونیات دەنێت وهەموو کاروبارەکانی ژیانی ڕیك دەخات.

ڕێزگرتنی نێرو مێ لەگەڵ هاوشانی فیتری لەئەرك و مافەکاندا.

## سیستەمی ئابووری

یەکیتی سیستەمی سیاسی ڕەنگدانەوەی یەکیتی تێڕوانینە بۆ جیهان.

یەکیتی ئوممەتی لەسیستەمیداو، لەتێڕوانینیدا بۆ جیهان و، مامەڵکردنی لەگەڵ واقیع و، ئاراستەی بۆ داهێنانی شارستانی.

سیستەمی یەك ئوممەتی بنەمای ئەو کۆبوونەوە مرۆییەیە کەڕێزو ئازادی و دەرفەتی هاریکاری و تەواوکاری دەبین دەکات.

## سیستەمی ئابووری

درەوشانەوەکانی یەکخواناسی لەبنەماکانی ئابووری و، ڕەوشتەکانی بەرهەمهێنان و بەکاربردن.

پەیوەندی هاوسەنگی نێوان مادەو رۆح و، نەمانی هاوسەنگیش واتە تێکچوونی سیستەمی ژیان.

سیستەم لەسەر نارەوهابوونی قۆرغکاری و خراپ بەکارهێنان و ناڕەوابوونی ئابلۆقە.

## سیستەمی جوانی

نەبوونی هونەرەکانی بەرجەستەکردن (الفنون التشخيصية) گوزارشتە لەیەکخواناسی ڕەها.

شێوازی زەخرەفەی تەجریدی بێکۆتا لە زەخرەفە ئەندازەیی و ڕووەکی- ئەرابیسکی.

گوزارشتی جوانی بریتییە لەگوزارشت لەوەی کەناتوانرێت گوزارشتی لێ بکرێت!

لوتکەی تێگەیشتن لەجوانی ئەوەیە کەخوای گەورە تاك وتەنها لەنمونە باڵاترە.

## کۆتایی بەش

زانایانی موسڵمان لەوەدا ڕا جیا نین کەیەکخواناسی بناغەی ئیسلامە، هەر ئەویش ناسنامە دەبەخشێتە شارستانییەتی ئیسلامی و یەکخواناسی لەتێڕوانینی ئیسلامیدا بریتییە لەبەهایەکی ناوەند و سەرچاوەی بەهاکانی تر و ڕێسای ناوەرۆکی ئەم بەهایانەش لەسیستەمی فیکرو تێکڕای ژیاندا، لەبیرکردنەوەو سەرنجدانی عەقڵیەوە، تا دەگاتە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و بەجوانی پێکەوەگونجاو و بیرکردنەوەی عەقڵی و هتد.

چەمکی یەکخواناسی گێڕانەوەی دیاردەکانی بۆ یەک بنەڕەت لەخۆ گرتووە. یەکخوداناسی دیاردەیەکی ڕەسەنی فیترەتی مرۆڤە، مرۆڤ ئاشنای دەبێت و بەسەرنجدان و ڕامان و بیرکردنەوەو گەڕان دەیدۆزێتەوە، کاتێ بەرەوپێشچوونی بەردەوامی یەکێتیەکە دەبینێت و بەوەحی خودایی کە بۆ پەیامبەران هاتووە تەواو لێی دڵنیا دەبێت. یەکخوداناسی بەرانبەرەکەی فرەییە، چونکە باوەڕبوون بەتاک وتەنهایی خودای گەورە، تێبینیکردنی فرەیی لەهەموو شتەکانی جگە لەخوای گەورەدا پێویست دەکات. بەڵام ئەم فرەییە تەوامەندی و هاوسەنگی نێوان بەشەکانی لەبوون و جووڵەو ئەرکیدا لەخۆ دەگرێت، تێیدا تاک وتەنهایی خودای بەدیهێنەری کارڕێکخەر، بەشێوەیەکی ورد دەدرەوشێتەوە. هەربۆیە شتەکانی گەردوون لەگەردیلەیەکەوە تا ڕێگای کاکێشان، لەپێکهاتەو بونیاتنانیداو لەپەیوەندی وپەیوەستیەوەو لەجووڵەی ناوخۆییەوە (خولانەوەی ئەلکترۆن بەپێچەوانەی میلی کاژمێر)و دەرەکی (خولانەوەی زەوی و خۆرو مانگ و هەموو ئەستێرەو هەسارەو مانگەکان ... بەپێچەوانەی میلی کاژمێر) لەسەر ڕێکوپێکی و پێکەوە گونجان وەستاوە.

بەڵام ڕووداوەکانی گەردوون ودیاردەکانی لەگۆڕانی شەو وڕۆژو بەدوای یەکدا هاتنی چوار وەرزەکەو جووڵەی ڕەشەباو. بارینی باران و درەوشانەوەکانی وزەو گۆڕانەکانی و پەیوەندییەکانی ڕامکردن و بوونی توانا بەسەریدا و.... هەموویان بەشێوەیەکی تەواو ڕێکخراو و بەجوانترین شێوەو

تەواوترین ڕێکوپێکی: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ {القمر: ٤٩}، واتە: (ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاریکراو دروست کردووە)، ﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾ {الحجر: ١٩}، واتە: (زەویمان ڕاخستووە، چیاو کێوەکانمان لەسەر داناوە، لەهەموو جۆرە ڕووەک وبەروبومێکمان تیایدا ڕواندووە بەشێوەیەکی ڕێک وپێک وبەئەندازەی پێویست ودیاریکراو).

ئەگەر یەکخواناسی بریتی بێت لەبەهای ناوەندی یەکەم لەتێڕوانینی ئیسلامیدا، ئەوا کارەکانی ئەم بەهایە بنەمایەکی سەرەکییە لەبنەماکانی مەنهەجیەتی ئیسلامی لەبیرکردنەوەو گەڕان و ڕەفتاردا. لەبەر ئەوە ئاسانە کۆمەڵێک بنەمای مەنهەجی لاوەکی لەم بنەمایەوە وەربگرین، لەو بنەمایانەش وەک نمونە: بنەمای دروستکردن و فەرمان و بنەمای یەکترتەواوکردنی دونیاو قیامەت و بنەمای یەکترتەواوکردنی وەحی و جیهان و بنەمای یەکترتەواوکردنی (تکامل) عەقڵ وهەستپێکردن.




**بنەما مەنهەجیەکانی لەیەکخواناسی دەبنەوە**

قورئـانی پیـرۆزو سـوننەتی پێغەمبـەر بابـەتی یەکخواناسـیان بەشـێوەیەکی سادەو ئاسان، نزیک لەعەقڵ و ویژدان باس کردووە، پاشتر یەکخواناسی بووە بابەتی زانست و ناونیشانی جۆراوجۆری لەخۆ گرت و گوتەی فەیلەسووفان و سـۆفی و زانایـانی کـەلامی تێکـەڵ بـوو شـێوازەکانی خسـتنەڕوو فێرکـردن وفێربـوونی جۆراوجـۆر بـوو. چەنـدین دەسـتەو تـاقمی لـەدوور کۆبوویـەوە کەکاریگەریان هەبوو لەسەر ئەو ئاشووب و نەهامەتیانەی کەتووشـی ئوممـەتی ئیسلامی بوو. لەپاڵ هەندێ هـەوڵی هاوچـەرخ کەدەیـەوێت سـەرلەنوێ زانسـتی یەکخواناسـی دابڕێژێتـەوە، بـەڵام زۆر لەگوتـە کۆنـەکانی زانایـانی کـەلام بـەدەر نییە.

لەوانەیە ئێستا کاتی ئەوە بێت کـەزانایانی موسـڵمان یەکخواناسـی بگێڕنـەوە بۆ سادەییەکەی سەرەتای و لەمەشدا پشت  بەو کاریگەرییە قوڵـەی کـەگوتاری قورئانی و ڕێنوێنی پێغەمبەر لەدەروونی مرۆڤەکاندا دروستی دەکەن ببەستن.

## تەزکییە لەڕشتەبەندی بەها باڵاکاندا[1]

قســەکردن ســەبارەت بــەتەزکییــە قســەکردنە لەســەر چــەمکێکی ســەرەکی لەچەمکە قورئانییەکان و ئامانج لەم باسکردنە بریتییە لەئیجتیهادکردن لەخستنە ڕووی تێڕوانینێکــی مــەعریفی لــەبارەی ئــەم چەمکــەوە کــەقورئان ســەرچاوەی تێڕوانینەکە بێت.

تەزکییــە زاراوەو چــەمکێکی بنــەڕەتی قورئانییــە، پێگەیــەکی گرنگــی هەیــە لەڕشتەبەندی بــەها قورئانیەکانـدا، چونکــە بابــەتی تەزکییــە مرۆڤــە کەکراوەتــە جێنشین، هەر ئەمەش بابەتی چاکسازییە لەواقیعی مرۆڤایەتیدا. چاکسـازی تـاک و کۆمەڵ و ئوممەت. مرۆڤیش مادەو ڕۆحە، تەزکییەش مادەو ڕۆح دەگرێتــەوە. واتــە قســـەکردن لەمــەڕ پرســەکانی چاکســـازی هــیچ واتایــەکی نابێــت ئەگــەر پەیوەنـــدار نـــەبێت بەمرۆڤـــەوەو بـــەئامانجی بەرزکردنـــەوەی نـــەبێت لەپلەکانی تەزکییـەدا. تەزکییـە ئامـانجی ئاوەدانکاری و هۆکاریـەتی، لەبـەر ئـەوە تـەنها بابـەتی هەسـت و سـۆزو خورپـەی دەروونـی نییـە، کـە ئاسـتی چاکسـازی تــاک بگرێتــەوە بەتــەنها، بــەڵکو دەچێتــە جەرگــەی بونیاتنــانی کۆمەڵایــەتی و ئاوەدانکاری مرۆڤەوە.

باسکردنی تەزکییە پێویست دەکات چەند پێکهێنـەرێکی گرنـگ بگرێتـە خـۆی، لەوانە واتابەخشینی زاراوەیی قورئانی بۆ تەزکییە ، تەزکییـە وەک پێکهێنـەرێکی ســـەرەکیی لەمەبەســـتەکانی وەحـــی و پێگـــەی تەزکییـــە لەقوتابخانـــەکانی دونیانەویســـتی (الزهــد) و تەســـەوف و جیهـــادو هۆکارەکـــانی تەزکییـــە و کۆسپەکانی بەردەم تەزکییە.

[1] لەبنەڕەتدا ئەم بەشە وتارێکی پوخت بوو لەگۆڤاری (إسلامية المعرفة)دا بڵاوکرایەوە، پاشان گەشەی پێدرا. ملکاوی، حسن فتحی. "التزكية في منظومة القيم الحاكمة"، إسلامية المعرفة، ع٥٧، هاوینی ٢٠٠٩ز، ل٥_١١.

**یەکەم: فەرهەنگی وشەکانی (ألفاظ)ی تەزکییە لەقورئانی پیرۆزدا**

وشەی (التزکیة) کەبنەڕەتەکەی بۆ ئەم سێ پیتە (زکو) دەگەڕێتەوە پەنجاو نۆ جار بەشێوەی جیاواز هاتووە، لەوانە: (زکی، وزکی، یزکي، أزکی، زکیا، زکاة، أزکی و هتد...)، لەوانە سی ودوو جاریان بەدەربڕینی (زکاة) هاتووە، مەبەست زەکاتدانە لەماڵ وسامان بەو شێوەیەی کەدیاریکراوە، ئەمەش بەواتای پاکژکردنەوەو بەرەکەت و گەشەیە، چوار جاریش بەواتای پیاهەڵدان و ستایش هاتووە، چوار جاریش واهاتووە کە تەزکییە یەکێکە لەچوار مەبەست (مقاصد)ەکانی شەریعەت، ئایەتەکانی دیکە باس لەبوارە جیاوازەکانی تەزکییە دەکات بەواتای: پاکژکردنەوەو بەرزکردنەوەو گەشەپێدان و زیادکردنی کاری باش و سوودمەندی. لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێک لەمانابەخشینە دیاریکراوەکانی دەربڕینی تەزکییە لەقورئاندا چەند هەڵوێستێک دەخەینە ڕوو.

دەربڕینی تەزکییە لەقورئانی پیرۆزدا بەچەند حاڵەتێکی جیاواز هاتووە، چوار لەو حاڵەتانە پەسەندکراوەو پێنجەمیان بێزراوە، ئەوانیش بەمشێوەیە:

**١- کاتێ کەمرۆڤ تەزکییەی بەدەست نەهێناوە:**

داوا لەمرۆڤ کراوە کەدەروونی خۆی پاکژ بکاتەوە، بەوەش سەربەرزی وسەرکەوتن بەدەست دەهێنێت: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا﴾ {الشمس: ٩}، واتە: (بەڕاستی ئەوکەسە سەرفرازە کەنەفسی پاک وپوخت کردوەتەوە)، تەزکییەی تاکیش بەچوونە نێو بازنەی ئیمان دێتە دی: ﴿وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ٣﴾ {العبس: ٣}، واتە: ( جا تۆ چوزانیت لەوانەیە بیەوێت پاک ببێتەوە)، بەبەدیهاتنیشی لەچوونە نێو دۆزەخ دوور ئەکەوێتەوە: ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلۡأَتۡقَى ١٧ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ١٨﴾ {الليل: ١٧-١٨}، واتە: ( جا خواناس وپارێزکاران لەو سزاو ناخۆشییە دوور دەخرێنەوە، ئەو کەسەی ماڵ وسامانی خۆی دەبەخشێت بەوە دڵ ودەروونی خۆی خاوێن ڕادەگرێت)، ئەو کاتەش بەروبوومی تەزکییە تایبەت بەخودی نەفس دەبێت: ﴿وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفۡسِهِۦۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ {فاطر: ١٨}، واتە: (ئەوەی دڵ ودەروون وگوفتارو کردەوەی خۆی پاک دەکاتەوە ئەوە بەڕاستی سوودەکەی بۆ خۆیەتی، گەڕانەوەو سەرئەنجامیش بۆ لای خودای گەورەیە)، تەزکییەی پێویستیش بەئیمان و

کردەوەی چاک بەدەست دێت، هەر بەهۆی ئەوەوە خودای گەورە لەمرۆڤ ڕازی دەبێت و پاداشتی دەداتەوە، بەمشێوەیە: ﴿وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾﴾{طه: ٧٥-٧٦}، واتە: (ئەو کەسەی بەئیمانەوە بگەڕێتەوە بۆ لای وبەڕاستی کردەوە چاکەکانی ئەنجام دابێت، بۆ ئەوانە پلەو پایەی بەرزو بڵند ئامادەیە، بەهەشتی -عەدنە- کەباخەکانی چڕو پڕەو دەچنە ناوی و چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، ژیانێکی هەمیشەیی و نەبڕاوەشیان دەبێت، ئەوە پاداشتی کەسێکە دڵ ودەروونی خۆی خاوێن کردبێتەوە)، لەوانەیە ئاماژە کردن بۆ دەروونسازیش وەک حاڵەتێک بێت کە کاری مرۆڤ بەوجۆرە بێت " لەداهاتوودا نەک لەو کاتەدا"، واتاکەشی: دەروونی پاکدبێتەوە (سیتزکی): ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾﴾{المؤمنون: ٤}، واتە: ئەو پەرستشانەی دەیانەوێت ئەنجامی دەدەن تا خودای گەورە دەروونیان پاک بکاتەوە، یاخود تا دەروونیان پاک بکەنەوە، هەردوو واتاکەش یەکە"[١].

ئەوەی جێی سەرنجە درێژترین سوێند لەقورئانی پیرۆزدا پەیوەندی بەتەزکییەوە هەیە: ﴿وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا ﴿١﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴿٢﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰهَا ﴿٤﴾ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴿٥﴾ وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾{الشمس: ١-١٠}، تێبینی ئەوە دەکەین کەخودای گەورە سوێند بەدروستکراوە هەمەجۆرەکانی دەخوات: لەشتەکان و ڕووداوەکان و دیاردەکان، ئاشکرایە کەخودای گەورە بۆ شتی مەزن سوێند بەخۆی دەخوات کەوەڵامی سوێندەکەی لەخۆ گرتووە، وەڵامی سوێندەکەش لێرەدا ئەوەیە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾. بەمجۆرە سەرفرازو براوەو سەرکەوتوو دەبێت لەبەدەستهێنانی تەزکییەدا: ئەویش بەدوورکەوتنەوە لەوگوناهانەی کەخودای

---

[١] الاصفهاني، الراغب. مفردات الفاظ القران الكريم. تحقيق: صفوان داوودي، دمشق: دار القلم، بيروت: الدار الدمشقية، ط٤، ٢٠٠٩م، ص ٣٨١.

گـەورە تـوڕە دەكـات و زۆر ئەنجامـدانی ئـەوەی مایـەی ڕەزامەنـدی خـودای گەورەیــە لــەكردەوە چاكــەكان، بەمــەش بــەهای دەروون بــەرز دەبێتــەوە. لەبەرانبەردا دۆڕاو و شكستخواردو ئەبێت ئەو كەسەی دەروونی خۆی پۆخڵە كـردووە: ئـەویش حاڵەتێكـە كەخاوەنەكـەی ئـەو خەسڵەتانەی ئـەبێت كەدەبنـە ڕێگــر لــەنێوان كەســەكەو ئەنجامــدانی كــارە چاكــەكان و بێبەشــبوونی لەبەرزبوونەوەی دەروونی و زۆر ئەنجامدانی كاری چاك و دەروون بەرزی.

ئـەو دەروونەشـی كەبـەهۆی تەزكییهـەوە سـەركەوتن بەدەست دەهێنێت و بەهۆی كاری خراپیشـەوە تووشـی شكسـت و نائومێدی ئـەبێت، خـودی هـەمان مرۆڤە بەجەستەو عەقڵ و رۆحـەوە، تـاكی مـرۆڤ و كۆمـەڵی مرۆڤـە، دەروونـی مرۆڤ لەڕاستیدا خـاوەنی ماڵێكە بەڕێگەپێدان لەلایـەن خاوەنـە ڕەسـەنەكەیەوە ئـەم دەبێتـە خـاوەنی، ئـەو خاوەنـە ڕەسـەنەش خـودای بێهاوتایـە، ژینگەیەكیشـی هەیـە كـەخودای گـەورە بـۆ مرۆڤـی سـازاندووەو كردویەتییە جێنشـین تێیدا، تـا شت وەك و ڕووداو و دیاردەكانی بۆ ئاوەدانكردنەوەو بونیاتنـانی شارسـتانی بـەكار بهێنێـت، بـەڵام تـەوەری تەزكییـە لەهـەموو ئەوانـەدا بریتییـە لـەویژدانی مـرۆڤ كەدەبێتـە بابـەتی گەشـەو پـەروەردەو پەرەپێدان. ئـەم ویژدانـەش دوو جـۆرە: ویژدانێكـی كێشـمەكار و ویژدانێكـی تێگەیشـتوو ویژدانـی كێشـمەكار پاڵنەری ئارەزوو وپێویستی مـادی هەیـە، پەیوەندداریشـە بـەوەی لەقورئاندا بـە (النفس الامارة بالسوء) واتە: دەروونێكی فەرمانكار بەخراپەكاری، ئـەو نەفسـەی كەكۆتاییەكـەی دەگاتـە ئـەوەی كـە مـرۆڤ بەشـپرزەیی وتەنگـەتاوی دروسـت كــراوە. بــەڵام ویژدانــی تێگەیشــتوو ئــەوا پاڵنــەری فیترەتــی مرۆڤــی هەیــە لەداواكردنی پێویستیە رۆحیەكانداو لەگەڵیدا مرۆڤ لەڕەهەندی مادییەوە بـەرەو رۆحی دەجوڵێت و دەبێتە خاوەن دەروونێكی سەركۆنەكار، كەهێشتا لەپلـەكانی تەزكییـەدا لەباڵابووندایـە، تـا ببێتـە دەروونێكـی تـەواو دڵنیـا، كەشایسـتەی ئـەم فەرمایشتەی پەروەردگاری باڵادەست بێت: ﴿ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ٣٠﴾ {الفجر: ٢٨-٣٠}، (واتـە: بگـەڕێوە بـۆ لای پەروەردگارت كەتۆ لـەو ڕازیت وئـەویش لـەتۆ ڕازییـە، دەیبچۆرە ڕیـزی بەنـدە چاكە نازدارە بەڕێزەكانمەوە، بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەكەمەوە).

لەچەنـــدین ئایـــەتی قورئـــانی پیرۆزیشـــدا تەزکییـــە بەســـەرفرازیەوە بەستراوەتەوە، ئیدی ئـەوە سـەرفرازی تـاک بێت یـاخود سـەرفرزای کۆمـەڵ، سـەرفرازیش وەک دەرئـەنجامی تەزکییـە بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ هـاتوو: سـەرفرازە ئـەو کەسـەی دەروونـی خـۆی پـاک دەکاتـەوە: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩﴾ {الشمس: ٩}، سەرفرازە ئەو کەسەی دروونی پاک کردووەتـەوە: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤﴾ {الاعلی: ١٤}.

هەروەها سـەرفرازی (الفلاح) بـەهۆی ئەنجامدانی کردەوەیـەکی دیاریکراوی تەزکییەشـەوە هـاتووە، بەتایبـەت بەخشـینی مـاڵ وسـامان: لەڕێگـەی زەکـات و صـەدەقەوەو بەمەبەسـتی پاکژکردنـەوەی دەروون لـەرژدی وڕەزیلـی: ﴿إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٥ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٦ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ١٧﴾ {التغابن: ١٥-١٧}، واتـە: (دڵنیـابن کـەماڵ و سـامان و رۆڵـەو نـەوەکانتان بـۆ تاقیکردنەوەتانن، خـودای میهرەبـان پاداشـتی گـەورەو زۆری لەلایە بـۆ خـۆگرو لێبوردەکـان، کـەوابوو هـەتا دەتـوانن بەتـەقواو خوانـاس بـن، گوێڕایـەڵ و فەرمانبـەرداربن، خێرو چاکـەش بکـەن، ئەوانـە هـەمووی بـۆ خـۆتـان چاکـە، جا ئەوەی خۆی بپارێزێت لەڕەزیلی و رژدی نەفسی خۆی، ئا ئەوانـە هـەر خۆیـان سـەرفرازن، ئەگـەر قـەرز بـدەن بـەخوا (مەبەسـتی بەخشـینی مـاڵ و سـامانە لەپێناوی خودا) ئەوا خودا چەند بەرابەری دەکات بۆتان، هەروەها لێتـان خـۆش دەبێـت، خـوایش سوپاسـگوزارەو خـۆڕاگرە)، بەهـەمان شـێوە دەکرێـت سـەرفرازبوون بـەهۆی دەروون پاککردنـەوە بەسـامان یـەکێک بێت لـەکارەکانی تر، وەک ئەوەی لەسەرەتای سورەتی (المؤمنون)دا هاتووە: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ٣ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ٤﴾ {المؤمنون: ١-٤}، واتـە: (بەڕاسـتی ئـەو بڕوادارانـە سـەرکەوتوو سـەرفراز بـوون، ئەوانـەش ئەوانـەن کـە لەنوێژەکانیانـدا ملکـەچ ودڵئـارام و دڵ دامـەزراون و دڵیـان لای خودایە، ئەوانـەش کەلـەگوفتاری بێ سـوودو کرداری

نابـەجێ و بـێ هـودە دووره پـەرێزن، هـەروەها ئەوانـەش کـەزەکاتی ماڵیـان دەردەکەن). بەهەمان شێوە لەسورەتی لوقمانیشدا: ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥﴾ {لقمان: ٤-٥}، واتـە: (ئەوانـەی کـەنوێژەکانیان بـەچاکی ئـەنجام دەدەن، زەکـاتیش (لـەماڵ و سـامانیان) دەردەکـەن، دڵنیـاش دەبـن بەهاتنـەدی ڕۆژی قیامـەت، ئائەوانـە لـەڕێنوێنی و ڕێبـازی پـەروەردگاریانن، ئـا ئەوانـەش رزگـارو سەرفرازن).

خودای گەورە نەهی کردووە لـەوەی کەخـەڵکی خۆیـان بـەپاک دابنێنن و وا گومـان ببـەن کەبـەو کارەیـان دەگەنـە حاڵـەتی تـەقوا، چونکـە خـودا لەخـەڵکی ئاگادارترە پێش ئەوەی ببنە ئادەمیزاد و بەر لـەوەی لەسکی دایکیان بێنە دەرو زانایە بەوەی کەکاروبارەکان پاش ئەوە بەچی دەگات و هەر ئەو دەزانێ کـەکێ دەگاتە حاڵـەتی تـەقوا: ﴿ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلۡمَغۡفِرَةِۚ هُوَ أَعۡلَمُ بِكُمۡ إِذۡ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَإِذۡ أَنتُمۡ أَجِنَّةٞ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡۖ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢﴾ {النجم: ٣٢}، واتە: (ئەوانەی کەخۆیان دەپارێزن لـەگوناهو تاوانـە گـەورەکان لـەگوفتارو کـرداری بـەد جگـە لـەوردە گوناهـان، بەڕاسـتی پـەروەردگاری تـۆ چاوپۆشـی فراوانـە، چـاک دەتانناسـێت، لەکاتێکـدا کەئێوەی لەزەویدا بـەرپا کـردووە، لـەو کاتەشـدا ئێوە کۆرپەلـەی بچـوک بـوون لەسکی دایکتاندا، کەواتە خۆتان بەچاک مەزانن و خۆتان بەپاڵفتە دامەنێنن، هەر خوا دەزانێ کێ تەقوای هەیەو پارێزکارە). ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣٥﴾ {المائدة: ٣٥}، واتـە: (ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە لـەخوا بترسـن و پارێزکـار بـن، لەڕێگـەی هـەموو هۆکارو کردەوەیەکی چاکەوە هەوڵ بدەن ڕەزامەندی ئەو زاتە بەدەست بهێنن، هەمیشـە هـەوڵ و کۆشش وجیهادو خـەبات بکـەن لـەپێناوی ڕێبازو بەرنامـەی ئەو زاتەدا، بۆ ئەوەی سەرفراز بن).

ئەگـەر تەزکییـە هۆکـاری سـەرفرازی بێت ئـەوا چەنـدین هۆکـاری تـر هەیـە بەمەبەستی گەیشتن بەحاڵەتی تەزکییە و پاشـان گەیشـتن بەسـەرفرازی، لەوانـە بانگەواز بۆ لای چاکـەو فـەرمانکردن بـەکاری بـاش و ڕێگـری لـەکاری خـراپ،

ئەمانـەش خەسـڵەتی کۆمـەڵی سـەرفرازن، کـە کـاری چاکسـازی لەکۆمـەڵگادا ئـەنجام دەدەن: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ {ال عمـران: ١٠٤}، واتـە: (پێویسـتە لـەئێوە ئومـەتێک پێکبێت کەبانگـەواز بکـەن بـۆ خێـرو چاکـە، فـەرمان بکـەن بەهـەموو کارێکی باو و دروست، قەدەغـەی هـەموو نادروسـتییەک بکـەن، ئـا ئەوانـە هـەر سـەرفرازن). بەهــەمان شـێوە ئەمانــە سـیفەتی ئومــەتی چاکەخوازیشــن کەدەیانەوێت بگەنـە سـەرفرازی، هـیچ ڕێگایـەکی دیکـە نیـە جگـە لەبەرزبوونـەوە لەحاڵـەتی چاکیـەوە بـەرەو سـیفەتی چاکسـازی، چونکـە ئەگـەر سـەرفرازی بەدەست نەهات ئەوا لەبەرانبەریدا  لەدونیا تووشی تیاچوون دەبێت، بەرلـەوەی سزاو ئەشکەنجەی ڕۆژی دوایی توش ببێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ ١١٧﴾ {هود: ١١٧}، واتـە: (پـەروەردگارت بەسـتەم خـەڵکی شـارو دێهاتەکان لەناو نابات، لەکاتێکدا خەڵکەکەی چاکەخوازو چاکساز بن).

هـەموو شـێوەکانی چـاکبوون (الصـلاح)و بانگـەواز بـۆ چاکـەو فـەرمانکردن بــەکاری بــاش و بــەرپاکردنی دادپــەروەری و بەشــداربوون لەگەشــەپێدانی کۆمـەڵگاو ئومەتـداو جیهـادکردن لـەپێناوی خـودا کـاری چـاکن، ئەگـەر هـاتوو لەدەروونـدا خۆشەویست بوون، ئەوا پاکی دەکەنـەوەو بـەرزو پـوختی دەکـەن و بەهۆیەوە بەرز دەبێتەوە بۆ تەقواو سەرفرازی. لەبەرانبەردا هـەموو شـێوەکانی خراپـە و کـاری بـەد یـاخود بڵاوکردنـەوەی و ڕژدی دەروون و ڕەزیلـی لـەماڵ وسامانداو بەجێنەگەیاندنی پەیوەنـدی خزمایـەتی و سـتەمکاری و کەمتەرخـەمی لەکارو ئەنجامدانی ئەرکەکاندا و بـەفیڕۆدانی مافـەکان و فەرامۆشـکردنی ئەرکـە پێویسـتەکان، تێکـڕای ئەوانـە کـاری خـراپ و چـەوتن، ئەگـەر دەروون درکـی بەخراپەکـەیان کـرد و پابەنـدبوو بـەوەی کـەلێیان دوور بکەوێتـەوە،  ئەوانـە هۆکارن بۆ تەزکییە و بەرزکردنەوە و پاکژ کردنەوەی.

لەڕاستیشـدا وشـەی (التزکیـة) لـەقورئانی پیـرۆزدا بـەواتای پاککردنـەوەو بەرزکردنــەوەی هەســتی دەروونــی و پەیوەندییەکۆمەڵایەتیــەکانیش هــاتووە. ئــەوەتا کــاتێ تــەڵاق لــەنێوان ژن ومێـرددا ڕوودەدات، ئەگـەری ئـەوە هەیـە کەدەروونـەکان لـەبار بن بۆ تورەبوون و کینـەو گـرژی و دەزووی پەیوەنـدی

خۆشەویستی و هاوسۆزی دەپچڕێت، ئەمەش وا لەکەسوکاری ژنەکە دەکات لای خۆیانی بهێڵنەوە، واتە ڕێگە نەدەن بچێتەوە بۆ لای مێردەکەی، لەکاتێکدا کەهەردووکیان ویستی گەڕانەوەیان بۆ لای یەک هەیە، لەمبارەیەوە خودای میهرەبان پێیان ڕادەگەیەنێت کەئەو گەڕانەوەیە بۆ لای یەک بۆ هەمووان چاکترە و ئەو چوونەوە بۆ لای یەک بۆ پاککردنەوەی دڵ ودەروونیان باشترە لەگومان وتۆمەت، بۆ ئەوەی هۆگری و خۆشەویستیان بەردەوام بێت، کەواتە بابەتەکە هەست وخورپەی دروونن و دڵەکان پاکژ دەکەنەوەو پەیوەندیەکان و سیستەمەکانی بەرکار لەکۆمەڵگادا دیاری دەکەن و چارەسەری بابەتە کۆمەلایەتیەکان دەکەن: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾﴾ {البقرة: ٢٣٢}، واتە: (ئەگەر ژنەکانتان تەلاقداو گەیشتنە کۆتایی عادەی مانگانەیان، ئێوە (ئەی کەس وکاری ژن) مەبنە کۆسپ لەڕێگەیاندا ئەگەر ویستیان شوو بکەنەوە بەهاوسەرەکانیان کاتێک ئەوان لەنێوان خۆیاندا ڕەزەمەندیان بەشێوەیەکی جوان نواند، ئەمە ئامۆژگاری ئەو کەسانەی پێ دەکرێت لەئێوە کەباوەڕی بەرۆژی قیامەت هەبێت، ئەو جۆرە کردارو رەفتارانەتان جوانترو پەسەندترو خاوێنترە، خوای پەروەردگاریش چاک دەزانێت (چی خێرە بۆتان)و ئێوە نایزانن ودەرکی ناکەن).

کەواتە لەئایەتەکەدا وشەی (أزکی لکم) بەمانای: "بۆ ناموس باشترەو لەچاکەوە نزیکترە، چونکە (أزکی) مانای باشترو چاکتر دەدات، ئەوان لای خۆیان پەنایان دەدان تا لەتۆمەت دوور بن و بیانپارێزن لەوەی زیان بەکەسایەتی بگات، خودای گەورە ئاگاداریان دەکات کەنەهێشتنەوەیان بەو شێوەیە باشترە بۆ پاراستنی ناموسیان، چونکە هەوڵی تێدایە بۆ مانەوەی پەیوەندی لەنێوان ئەو خێزانانەی کەبەهۆی ژن وژنخوازی و ڕەچەڵەکەوە لەیەک نزیکبوونەتەوە، خۆ ئەگەر گلدانەوەیان لای خۆیان هۆکار بێت بۆ

ستەملێکردنیان، ئەوا مۆڵەتدانیان بەگەڕانەوەیان بۆ لای یەک خۆڕاگری و لێبوردەیی و باشتر بوونی حاڵیانی تێدایە..." [1].

دەستەواژەکانی "أزكى لكم" و "أزكى لهم" بەجۆرێک دووبارە دەبنەوە کەلەوانەیە ئەو هەستەت لەدەروونندا بۆ دروست ببێت بەهۆی ئەنجامدانی هەندێک ڕەفتارەوە، بۆ نمونە پۆزش هێناوە لەپێشوازی میوان لەماڵەوە بەهۆی لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندییەکان و پاراستنی چاو لەحەرامکراو و هەموو ئەمانە بۆ پاراستنی داوێن و نامووس، لەگەڵ ئەمانەدا پاکژکردنەوەی ویژدان و هەست و گوفتارو ڕەفتار، ئەنجامدانی ئەوانە پاککەرەوەی ژیانی تاک و پەنهان و واقیعی، بەمەش خۆی و تێڕوانینەکانی بەرزدەکاتەوە بۆلای خوای گەورەو هەست بەچاودێریی خوایی بۆ خورپەی دڵ و هەست و ڕەفتاری دەکات: ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾﴾ {النور: ٢٨}، واتە: (ئەگەر پێتان گوترا بگەڕێنەوە، دە ئەبێ بگەڕێنەوە، ئەوە چاکترو پاکترە بۆتان، خودا زانایە بەهەموو ئەو کردەوانەی دەیکەن).

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾ {النور: ٣٠}، واتە: (بڵێ بەپیاوانی ئیماندار چاوی خۆیان (لەسەیرکردنی نامەحرەم) داخەن و عەورەتیان بپارێزن، ئەوە چاکترو پاکترە بۆ ئەوان، بێگومان خوا ئاگادارە بەهەموو کردەوەیەک کەدەیکەن).

**٢- کاتێ تەزکییە کردەی خودای گەورە دەبێت:**

لەڕاستیدا ئەو ئەنجامدەرە، وەک: ﴿بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾﴾ {النساء: ٤٩}، واتە: (بەڵکوو خوا هەرکەسێکی بوێت پاک و خاوێنی دەکات و کەمترین ستەمیان لێ ناکات). کرداری خودا گەورەش لەقورئانی پیرۆزدا کەدێت بۆ باشەو تاقیکردنەوەو پاککردنەوەی هەندێک لەمرۆڤەکانە: ﴿وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةًۖ وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾﴾ {مريم: ١٣}، واتە: (لەگەڵ دڵسۆزی و پاک وخاوێنی

[1] ابن عاشور، محمد الطاهر. التحرير والتنوير. تونس: دار سحنون للنشر والتوزيع، ١٩٩٧م، ج٢، ص٤٢٨.

لەلایەن خۆمانەوەو ئەو (یەحیا) لەخوا ترس وپارێزکار بوو). ﴿لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ١٩﴾ {مريم: ١٩}، واتە: (بۆ ئەوەی منداڵێکی پاک وخاوێنت پێ ببەخشم)، مەبەست ئەوەیە بەخوڕەوشتی پاک بووبێتەوە، بەوەش ببێتە چاکەکارێکی زانای خوڕەوشتپاک بەپشتیوانی خوا، هەروەک چۆن بۆ هەموو پەیامبەران و نێردراوان هەبووە، نەک بەفێربوون و پیادەکردن.

مرۆڤی باوەڕداریش لەکاتێکدا کەپەیوەندی خۆی لەگەڵ خودای گەورە پتەو دەکات، حاڵەتی ئیمانداریەکەی بگاتە هەر ئاستێک و هەر کارێکی چاکیش ئەنجام بدات و هەر هۆکارێکی ڕەوا لەپێناوی گەشەپێدانی پلەکانی تەزکییە بگرێتە بەر، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا دەزانێت کەئەگەر فەزڵ و ڕەحمەتی خودای گەورەی لەگەڵ نەبێت ناتوانێت بگاتە ئەوەی پێی گەیشتووە، پەیامبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانپێکراوە کەبفەرموویێت: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ٩﴾ {الاحقاف: ٩}، واتە: (بڵێ من یەکەم پێغەمبەر نیم (نێردرابم)، ناشزانم چی بەسەر من و ئێوەش دەهێنرێ، تەنها پەیڕەوی سروش دەکەم، منیش تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام وبەس).

### ٣- کاتێ تەزکییە یەکێک دەبێت لەئەرکەکانی پێغەمبەر:

لەقورئانی پیرۆزدا تەزکییە وەک یەکێک لە چوار ئەرکی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هاتووە، لەڕاستیدا پێغەمبەر ئومەتەکەی پاکژ دەکاتەوەو ئایەتەکانیان دەخوینێتەوەو قورئانیان فێر دەکات و فێریی دانایی (حیکمەت)یان دەکات.

ئەمانەش چوار ئەرکن، پەیوەست کراون بەیەک و چوار جاریش لەقورئانی پیرۆزدا دووبارەبوونەتەوە، هەروەک دواتر دەیانخەینە ڕوو هەروەک چۆن تەزکییەی ئومەتەکەی لەلایەن پەیامبەرەوە بەم بەرنامە پەروەردەییە خاوەن چوار پایەیە دەبێت، بەهەمان شێوە پاکژکردنەوەی ئومەتەکەی بەجێبەجێکردنی حوکمە شەرعییەکان ئەبێت، لەبەر ئەوە جێبەجێکردنی حوکمی زەکات لەلایەن پەیامبەرەوە بەسەر ئومەتەکەیدا هۆکارێکە بۆ پاککردنەوەو تەزکییەی

ئومەتەکەی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾﴾ {التوبة: ١٠٣}، واتە: (لەماڵ و سامانیان وەربگرە (زەکات وصەدەقە) تابەهۆیەوە پاکیان بکەیتەوە (لەگوناهو تاوان) و (دڵیان) پوخت و خاوێن دەکەیت بەو ماڵ بەخشینە ودوعاو نزای خێریان بۆ بکە بەڕاستی دوعای تۆ ئارامی و دڵخۆشییە بۆ ئەوان و خوا بیسەری زانایە).

چوار ئایەتەکەی دیکەی قورئانی پیرۆز کە وشەی (التزکیة)یان تێدا هاتووە وەک ئەرکێک لەئەرکەکانی پەیامبەر، ئەوانە تایبەتن بەمحمد (درودی خوای لەسەربێ)، بریتین لە:

- [رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾] {البقرة: ١٢٨-١٢٩}.
- [كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾] {البقرة: ١٥١}.
- [لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾] {ال عمران: ١٦٤}.
- [هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾] {الجمعة: ٢}).

لەئایەتی یەکەمدا پاڕانەوەی ئیبراهیمە (سەلامی خوای لێ بێت) لەپەروەردگاری: کە لەمناڵ و نەوەکان "ئومەتێکی موسڵمان" دروست بکات و لەنێو ئەو ئومەتەشدا " پەیامبەرێک کەلەخۆیان بێت" بنێرێت بۆیان، ئەم پەیامبەرە چوار ئەرکی هەبێت: ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێت و فێری کتێبەکەت و فێری داناییان بکات و پاکیان بکاتەوە. لەسێ ئایەتەکەی تردا خوای گەورە ئەوەی خستووەتە ڕوو کەپاڕانەوەکەی پەیامبەر ئیبراهیمی گیرا کردووەو ئەو ئومەتە موسڵمانە هاتووەو محمدیشی وەک پەیامبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەنێویاندا ناردووە. لێرەدا تەنها دوو تێبینی دەخەینە ڕوو

تێبینی یەکەمیان: تەزکییە لەپاڕانەوەکەی ئیبراهیمدا (سەلامی خوای لێ بێت) لەپێگەی چوارەمی مەقاصیدەکاندا هاتووە، بەڵام تەزکییە لەسێ ئایەتەکەی تردا لەریزبەندی سێهەمدا هاتووە پاش خوێندنەوەی ئایەتەکان. تێبینی دووەمیش: تەزکییە حەقی ئەو ئومەتەیە کەلەپاڕانەوەکەی پەیامبەری خوا ئیبراهیمدا (سەلامی خوای لێ بێت) هاتووە، ئەو ئومەتەی کەخوای گەورە روویان تێدەکات و دەفەرمووێت: هەروەک چۆن "ناردوومانە لەنێوتاندا"، "لەئومەتی باوەڕداراندا" و "ئومەتی نەخوێندەواراندا".

کەواتە نەمەبەستی تەزکییە و نەهیچکام لەسێ مەبەستەکەی تر، پەیوەندارە بەتاک و پەوەردەی دەروونی و بونیاتی کەسێتیو بەرزکردنەوەی ویژدانیەوە. لەبەرئەوە ئەم چوار ئایەتە بەرنامەیەکی پەروەردەیی بۆ ئومەت دادەڕێژێت کەچوار پایەی هەیە، یەکتر تەواو دەکەن و پێکهاتەکانی یارمەتیدەری یەکتر لەبونیاتنانی ئومەت و دارشتنی وێنەکەی و دیاریکردنی خەسڵەتەکانی. پایەی یەکەم بریتییە لەخوێندنەوەی ئایەتەکان، ئەمەش نەهێشتنی نەخوێندەواری و بەرزبوونەوە بۆ ئاستی ئەو رێزەی کەپەروەردگار بەهۆی خوێندنەوەی ئایەتەکانیەوە دەیبەخشێت و سوودمەندبوون لەوەی کەلەئایەتەکاندا هەیە، پایەی دووەمیش بریتییە لەتەزکییە، ئەمیش خەسڵەتەکانی پاکبوونەوەو بەرکەت و گەشەپێدان دەگرێتەوە، پایەی سێهەمیش بریتییە لەفێرکردنی قورئان، واتە فێربوونی ئەوەی کە تێیدایە لەزانست و رێنوێنی. بەڵام پایەی چوارەم بریتییە لەفێربوونی دانایی، واتە فێربوونی بابەتی ناو کتێبەکە کەقورئانەو سوودمەندبوون لەبەرهەمی ئەو فێربوونە، ئەویش ڕاستبوونە لەگوفتارو کردارو و بەدەستهێنانی توانای بەرچاوڕوونی لەکاروبارەکانداو ئەنجامدانی لەشوێنی خۆیداو پێوانەکردنی بەپێوانەی خۆی و تێگەیشتن لەهۆکارو مەبەستەکانی.

### ٤- پاککردنەوەی ماڵ وسامان:

یەکێک لەبوارەکانی تەزکییەی دەروونی مرۆڤ بریتییە لەپاککردنەوەی ماڵ و سامانەکەی، چونکە بەخشینی سامان بەشێوازی چاک پاککردنەوەی سامانە، بەوەش چەند قات خێرو بەرەکەتی تێدەکەوێت: ﴿وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ٣٩﴾ {الروم: ٣٩}، واتە: (ئەوەی بەناوی سوود داوتانە بۆ ئەوەی زیاد ببی لەماڵ وسامانی ئەو خەڵکەدا ئەوە لای خوا هیچ زیاد ناکات و هەر زەکات وخێرێک کەداوتانەو مەبەستتان تەنها ڕەزامەندی خوا بووە ئا ئەوانە چەندجارە دەکەینەوە). زەکاتدان بەهەمان شێوە تەزکییەو پاکبوونەوەشە بۆ خاوەنی ماڵ وسامانەکەش، چونکە دەروونی لەڕەزیلی و رژدی پاکژ دەکاتەوە. لەڕاستیدا سامان ئاشووبە، ئەوکەسەی لەماڵەکەی زەکات دەردەکات و وەک صەدەقە لێی دەبەخشێت، ئەوە وەک ئەوە وایە بەخۆی ببەخشیێت، چونکە بەو کارەی خۆی لەدەرئەنجامەکانی رژدی و ڕەزیلی دەپارێزێت. بەخشینی ماڵ و سامانیش بەشێوەیەکی گونجاو بەشداریکردنە لەبونیاتنانی پەیوەندییەکانی دەستبار بۆ یەکترگرتن و هاوسۆزییە لەکۆمەڵگاداو بەهەمان شێوە ڕەفتارکردنیشە لەگەڵ خوای گەورەدا: ﴿إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا﴾ {التغابن: ١٨}، خودای گەورەش: ﴿شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾ سوپاسگوزاری مرۆڤە لەسەر ئەو بەخشینە، ئەم سوپاس کردنەش بەچەندقات ماڵەکەی بەرەکەت و گەشەی پێدەدات لەلایەک و پاداشت و لێخۆشبوونی لەلایەکی تر پێدەبەخشێت: ﴿إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٥ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٦ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ١٧﴾ {التغابن: ١٥-١٧}.

بەڵام وشەی زەکات بەواتای فەرزەکەی کەناسراوەو لەپێنج پایەکەی ئایینە، لەمبارەیەوە (محمد بن الطاهر بن عاشور) دەڵێت: "وا نازانم کەبەکارهێنانی زەکات (زەکاتی ماڵ) -بە واتای ئەو ماڵە بێت کەلەپێناوی خوا دراوە-بەم

واتایە تەنها لەزاراوەکانی قورئانی پیرۆزدا هاتووەو بەم مانایە پێش هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز نەهاتووە"[١].

لەڕاستیدا زەکات پایەیەکی ئایینی ئیسلامە، هاوبەشە لەگەڵ شایەتومانی یەکخواناسی و نوێژو ڕۆژوو حەجدا. زەکاتیش پایەیەکی نایابی سیستەمی کۆمەڵایەتی گشتییە، ئەرکەکەی پاکژکردنەوەی دەروونە لەڕژدی و ڕەزیلی و زاڵبوون بەسەر ئاشووبی ماڵ و ساماندا و هەستان بەپێدانی مافی کۆمەڵ و تاکەکانی. زەکات پایەیەکی گرنگە لەسیستەمی ئابووریدا، لەڕاستیدا بەخشینی ماڵ وسامان لەئیسلامدا پەرستشە، زەکات بڕێکی دیاریکراوە لەماڵی تاک کە بۆ کۆمەڵگای دەگێڕێتەوە، ئەمەش ئەو کاتە دەبێت کەسامانەکە تاکێک خاوەنی بێت و سەرپشک بێت لەهەڵسوکەوتکردن پێیەوە، چونکە لە ئەنجامی هەوڵ و ماندووبونی بەدەستی هێناوە. ئەو پشکە پەیوەستە بەبەرهەمهێنان و داهاتی کشتوکاڵی و پیشەسازی و بازرگانیەوە. هەروەها زەکات پەیوەستە بەوادەو بڕێکی دیاریکراوەوە، چونکە زەکات لەو سامانەدا پێویست دەبێت بدرێت کە لەبڕێکی دیاریکراو زیاتر بێت، لەوەی کەپاش تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر خاوەندارێتیەکەی سوڕابێتەوە، یاخود لەوادەیەکی دیاریکراودا زەکاتەکەی لێ دەربکات: ﴿وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦ﴾ {التغابن: ١٤١}، ئەوەشی کەلێی دەردەکرێت ڕێژەیەکی سەدییە کەبەهاکەی چارەکێکی یەک لەسەر دە، یاخود نیوەی یەک لەسەر دە، یان یەک لەسەر دە، یاخود پێنج یەک، بەگوێرەی جۆری ماڵەکە و سروشتی ئەو کارەی لەبەدەستهێنانیدا ئەنجامدراوە. لەو بەرژەوەندیانەی کۆمەڵگاشدا کەموڵکداری تایبەت تێیاندا دروست نییە، وەک سەرچاوەکانی وزە، ئەوا ڕێژەی ماڵەکە دەگاتە لەسەدا سەد.

لەڕاستیدا زەکاتدان هۆکارێکی گرەنتی کراوە بۆ بەرەکەت و زیادبوون: ﴿وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ٣٩﴾ {الروم: ٣٩}، واتە: (ئەوەی بەناوی سوود لەماڵ وسامانی ئەو خەڵکە داوتانە بۆ ئەوەی زیاد ببێ، ئەوە لای خوا هیچ زیاد ناکات، هەر زەکات وخێرێک کە داوتانەو مەبەستتان تەنها ڕەزامەندی خوا

[١] ابن عاشور، التحرير والتنوير، سەرچاوەی پێشوو، ج١٨، ص١٢.

بـووه، ئـا ئەوانـە چەنـدجارە دەکەینـەوە). هەربۆیـە هەرکـەس بازرگانییـەکی قازانجمەندی ویست کەسامانەکەی چەند قات زیاد بکات، پێویستە زەکات بدات.

هەروەها خوای گەورە بەڵێن بەخەڵک دەدات کەلەگەڵیان بێت: ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا﴾ {المائدة: ١٢}، واتـە: (خـوا فـەرمووی بێگومـان مـن لەگـەڵتانم، سـوێند بـەخوا ئەگـەر بـەڕێکوپێکی نـوێژ بـەجێبهێنن و زەکـات بـدەن و بـاوەڕ بهێـنن بـــەنێردراوەکانم و یارمـــەتیان بـــدەن و ڕێزیـــان بگـــرن، قـــەرزیش بـــدەن بە(بەندەکانی) خواو خێریـان پێ بکـەن، بەقـەرزدان وخێرێکـی جوان وچـاک). چ لەگـەڵ بـوونێکی مەزنـە! بـەڵام ئـەم لەگـەڵ بوونـە بەمـەرج نـەبێت نایەتـە دی، زەکاتـدان یەکێکـە لەمەرجـەکان. لەگـەڵبوونی خـودا بـەڵێنێکی ئیجگـار مەزنـە، ڕێنوویێنی مرۆڤ دەکات و هەر ئەوە بەسە بۆی، بەڵام ئەم لەگەڵبوونـە مـەرجی خۆی هەیە، ئەوانیش: "...گوێڕایەڵبوون لەهەڵسوکەوت و ڕەفتاردا بەپێی مەرجی ئـەو... دامەزرانـدنی بناغـەکانی ژیـانی ئـابووری لەسـەر بەرنامەیـەک کـەگرەنتی ئەوە بکات ماڵ وسامان تەنها لەدەستی دەوڵەمەندەکاندا دەستاودەست نـەکات و ئەگەرنا ئەوا سامانەکە لەچەند دەستێکی کەمدا کۆ دەبێتـەوەو دەبێتـە هـۆی دارمانی گشتی، زۆرینە توانای کڕین وبەکارهێنانیان نابێت، کۆتایی ئەو کارەش ڕاوەسـتانی ڕەوتـی بەرهـەم یـاخود سسـتکردنی و ئەمـەش پـڕی لەلایـەک و نـەبوونی لەلایـەکی تـرەوەو گەنـدەڵی ولێکترازانـی کۆمـەڵگای لێدەکەوێتـەوە... هـەموو ئـەم خراپەکاریانـە بـەهۆی نـەدانی زەکاتـەوە تەشـەنە دەکـات و ئەمـەش بەهۆی پەیڕەو نەکردنی بەرنامەو ڕێبازی خـوای گـەورەوە لەدابەشـکردنی مـاڵ وسامان ودەستاودەستکردنی ئابووریدا..." [١] .

سیستەمی ئابووری هاوچەرخیش لەسـەر بنـەمای سـوود (ریبـا) دامـەزراوەو زۆرینەی خەڵکی باوەڕیان بـەوە نییـە کەسیسـتەمێکی چـاک هـەبێت لەسـەر ئـەو بنەمایە نەبێت، لەئێستادا زەکاتدان بووەتە چاکەویستیەکی تـاکی کەنابێتـە هـۆی

(١) قطب، سيد. في ظلال القران، القاهرة: دار الشروق، الگبعة الثامنة ١٩٧٩، مجلد ٢، ج٦، ص ٨٥٧-٨٥٨.

ئـەوەی سیسـتـەمێکی هاوچـەرخ لەسـەری دابمـەزرێت و وێنـەی زەکـات لـەم سـەردەمەدا کـەهیچ سیسـتـەمێکی ئیسـلامی لەواقیعـدا بـەخۆوە نـەبینییوە، وەک خەیاڵی لێهاتووە.

غەزالی واتایەکی جوانی بۆ پەیوەندی زەکاتدان بەپرۆسـەی پاککردنـەوەوە باسکردووە، زەکاتدەر هۆشیار دەکاتەوە کەبەزەکاتدانەکەی منەت نەکات یاخود چاوەڕوانی سوپاسگوزاری نەبێت لەلایەن ئەو کەسەوەی کەپێی دەدات، چونکـە حەقیقـەتی ئـەو کارە لای غـەزالی بەوجۆرەیە کـە زەکـات وەرگر چاکـەی هەیـە بەسەر زەکاتدەرەوە، لەمبارەیەوە دەڵێت: "دەبێت بزانیت کەبەقبوولکردنی حەقی خوا لێت چاکـەت بەرانبـەر دەکات، چونکە پاککردنـەوەی دڵـەکان لەنهێنییـەکانی زەکات و پاکژکردنەوەیەتی لەپۆخڵـەواتی ڕەزیلـی و ڕژدی، لەبـەر ئـەوە زەکـات پاککەرەوەیـە، ئەگـەر بەهۆیـەوە پاکبوونـەوە ڕوویـدا، ئـەوا وەک شـۆرەرەوەی پیسییەکان وایە، لەبـەر ئـەوە پەیامبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەربێ)و ئـالو بـەیتی (سـەلامی خوایـان لـێ بێت) بـەدەر دەکرێن لـەوەرگرتنی زەکـات، چونکـە خاشاک و پیسی ماڵ وسامانی خەڵکییـە"[1] جا ئەگـەر هـەژارێک ئـەوەی دەبێتـە هۆی پاکبوونەوەت بردی، ئەوا ئەو چاکەی بەسەر تۆوە هەیە"[2].

### ٥- بەخۆنازینی مرۆڤ، بەستایش وپیاهەڵدانی خۆی:

کاتێ خۆبـەپاکژزانی مرۆڤ بەسـتایش وپیاهەڵدان بەسـەر خۆیدا دەبێت، یـاخود سـتایش ئـەبێت لەکەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی تـر، ئـەوا تەزکییـە –لێرەدا– دەچێتـە بواری نـەنگی وقەدەغەکرانـەوە، ئەمـەش تـەنها حاڵەتـە کەتێیدا تەزکییـە کردەیەکی خراپەو ڕێگری لێکراوە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْۖ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمْۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢﴾

---

[1] عبداللـه عروانـی کە"مصـححی کتێبەکـەی غەزالییـە" لەسـەر ئـەو فەرموودەیـە لەپـەراوێزدا نووسـیویەتی: موسـلیم لـە صـەحیحەکەیدا گێڕاویەتیـەوە "الصـدقە أوسـاخ النـاس" (واتـە: صـەدەقە پیسیەکانی خەڵکیە) پاککەرەوەی سامان وماڵە، بەڵام لەلایەکی ترەوە مافی هەژارەو پاکە بۆ ئەو.

[2] الغزالـی، أبوحامـد. الاربعـین فـی أصـول الـدین. صـحـحه وخـرج أحادیثـه: عبداللـه عبدالحمید عروانی، دمشق: دار القلم، ٢٠٠٣م، ص٥٠.

{النجم: ٣٢}، واتە: (ئەوانەی کە لەگوناهی گەورەو کردەوەی دزێو خۆیان دەپارێزن، جگە لەتاوانی بچووک نەبێت، بەڕاستی پەروەردگارت لێبوردنی فراوانە، ئەو لەهەموو بەحاڵی ئێوە زاناترە، لەکاتێکدا کە لەزەوی دروستی کردوون و کاتێک کەئێوە کۆرپەلەن و لەسکی دایکتاندان، کەواتە خۆتان بەچاک و پاک دامەنێن، خوا زاناترە بەو کەسەی زیاتر لەخوا ترسە). هەروەها دەفەرموویت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾﴾ {النساء: ٤٩-٥٠}، واتە: (ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە کەخۆیان بەپاک وچاک دەزانن، (وانییە) بەڵکوو خوا هەر کەسێکی بوێت پاک وخاوێنی دەکات و کەمترین ستەمیان لێ ناکرێت، سەیر بکە چۆن بەدەم خواوە درۆ هەڵدەبەستن، بەسە ئەو درۆیە کەگوناهێکی ڕوون و ئاشکرایە).

ئایەتی یەکەم لەمیانی ئاگاداربوونی خوای گەورە لەبارەی مرۆڤەوە بەر لە لەدایکبوونی و ئەوەی لەژیانیدا بەدەستی دەهێنێت و چارەنووسیشی لەرۆژیی دواییدا هاتووە، بەڕاستی خوای گەورە زانایە بەو پلەیەی پارێزکاری (تەقوا) کەمرۆڤ پێی دەگات، لەڕێگەی دوورکەوتنەوە لەگوناه و خراپەکاری و دوورە پەرێز بوون لەو کارانەی دەبنە مایەی تورەبوونی خوای گەورە، هەر ئەویش لێپرسینەوەو حسابی لەگەڵ دەکات، پاشان ستایشی مرۆڤ بۆ خۆی و سوپاسکردن و منەتکردن لەسەر کارەکانی خۆی هیچ بەهایەکی نییە، چونکە ئەو پیاهەڵدان وستایشە لەوانەیە لەخۆڕازیبوون و خۆبەگەورەگرتن و خۆبەزلزانیەوە بێت، ئەوەش لەخەسڵەتی شەیتانە، کاتێ وتی: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَۖ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ {الاعراف: ١٢}، واتە: (چی بووە ڕێگر کەکڕنووش نەبەیت کاتێ فەرمانم پێکردی، (شەیتان) وتی: من لە(ئادەم) چاکترم، چونکە منت لەئاگر دروست کردووەو ئەوت لەقوڕ دروست کردووە). لەوانەشە ئەوانە بانگەشەی خراپ بن و هیچ نرخێکیان نەبێت. واباشترە بۆ مرۆڤ کە کاروبارەکانی بەخوای گەورە بسپێرێت و لەئاستیدا ملکەچ بێت.

ئایەتی دووەمیش لەمیانی قسەکردن سەبارەت بەو جوولەکانە هاتووە کەلەگەڵ گاورەکاندا لەچەندین شێوازی تەزکییەکردنی خۆیاندا هاوبەش بوون، کەبەبانگەشەی پوچەڵ تەزکییەی خۆیان دەکرد، خوای گەورە ئەوەی ئەوان دەیانگوت لەچەندان ئایەتدا هێناوە، لەوانە: ﴿وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١﴾ {البقرة: ١١١}، واتە: (وتیان (جوولەکەو گاورەکان): کەس ناچێتە بەهەشتەوە مەگەر یەکێک کەجوولەکە یان گاور بێت، ئەمە ئاواتیانە، پێیان بڵێ: بەڵگەتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن). ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ١٨﴾ {المائدة: ١٨}، واتە: (جوولەکەو گاورەکان دەیان وت: ئێمە کوڕان وخۆشەویستانی خواین، بڵێ: دەی بۆچی سزاتان دەدات بەهۆی گوناهەکانتانەوە، (نەخێر ڕاست نییە) بەڵکو ئێوەش مرۆڤن لەو مرۆڤانەی کەخوا دروستی کردوون، خۆش ئەبێت لەهەر کەس کەبیەوێت و سزای هەرکەسیش ئەدات کەبیەوێت و هەر بۆ خوایە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لەنێویاندا و هەر بۆ لای ئەویشە گەڕانەوە). ئەم تەزکییەیەش بوهتانکردنە بۆ خوای گەورەو گوناهێکی ئاشکرایە. ئەم تەزکییەکردنەی خۆیان بەدڵنیاییەوە هیچ سوودی نابێت بۆیان، چونکە باشە ئەوەیە کە خوای گەورە تەزکییەی بکات، نەک خۆی تەزکییەی خۆی بکات.

پاشان ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر واتای ئەو ئایەتانەی زیاتر کردووە کە سەرکۆنەی تەزکییەی مرۆڤ بۆ خۆی دەکات، بەهەمان شێوە سەرکۆنەی تەزکییەی بۆ کەسانی تریش کردووە[1]. لەوانەیە ئەوەش لەهەمان ڕووەوە بێت، واتە بەمەبەستی دوور کەوتنەوەی مرۆڤ بێت لەوەی تووشی

[1] ابن عاشور دەڵێت: "تەزکییەکردنی مرۆڤ بۆ کەسی تر ئەوەش دەگرێتەوە کە وشەی (أنفسکم) دەگەڕێتەوە بۆ واتای هۆزەکەتان یان کۆمەڵەکەتان، وەک ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: "فاذا دخلتم بیوتا فسلموا علی أنفسکم" واتە: ئەگەر چوونە ماڵێک باهەندێکتان سڵاو لەهەندێکی ترتان بکات، بڕوانە:

- ابن عاشور، محمد بن الطاهر. تفسیر التحریر والتنویر. تونس: الدار التونسیة للنشر، ١٩٨٤م، ج٢٧، ص١٢٥.

خۆبەگەورەگرتن و سەرسامبوون بەخۆ و خۆبەزلگرتن بەسەر خەڵکیدا دەکات. لەوانەشە لێرەدا مەبەست زیادەڕەوی بێت لەستایش تا بگاتە ئەوەی مرۆڤ ستایشەکەی بۆ خۆی بەشتێک بێت کەتێیدا نەبێت و لەو حاڵەتەشدا پیاهەڵدانەکەی درۆیەو هەندێک کەسیش بەهۆی ستایشکردنیانەوە تووشی سەرسامبوون بەخۆیان دەبن، بەوەش ستایشکردنەکە دهەبێتە هۆی دوورخستنەوەی دەروون لەحەقیقەتی تەزکییە. پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) ڕێنوێنی خەڵکی کردووە بۆ وتنی قسەی باش لەبارەی کەسانی ترەوە، وەک ئەوەی بڵێت: وایدادەنێم. تەزکییەی کەس بەسەر خوادا ناکەم، **(عَنْ أبي بَكْرَةَ رَضِيَ الله عَنْهُ عن أبيه قَالَ: أثنَى رجلٌ على رجلٍ عند النبي صلى الله علىه وسلم فقال: وَيْلك، قطعت عنق صاحبك(مراراً) ثم قال: من كان منكم مادحاً أخاه لا محالة فليقلْ: أحسب فلاناً، والله حسيبه، ولا أزكّي على الله أحداً، أحسبه كذ وكذا، إنْ كان يعلمُ ذلك منه)** [1]، واتە: لەئەبوو بەکرەوە (خوا لەخۆی وباوکی ڕازی بێت) دەڵێت: پیاوێک ستایشی پیاوێکی تری کرد لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ)، فەرمووی: تیا بچیت، گەردنی هاوڕێکەتت بڕی (چەندجار دووبارەی کردەوە)، پاشان فەرمووی: هەرکەس لەئێوە کەهەر دەبوو ستایشی براکەی بکات ئەوا بابڵێت: من وای تێگەیشتووم و خوا باشتر ئاگاداریەتی، تەزکییەی کەس بەسەر خوادا ناکەم، من ئاواو ئاوای دەبینم، ئەگەر ئەوەی لێ بزانرێت).

هەروەها ئەو فەرموودەیەی بوخاری: عن خارجة بن زيد بن ثابت، أن أم العلاء امرأة من نسائهم بايعت النبى (صلى الله عليه وسلم) أخبرته أن عثمان بن مظعون طار لهم في السكنى حين اقترعت الانصار على سكنى المهاجرين. قالت أم العلاء: فاشتكى عثمان عندنا فمرضته حتى توفي، وجعلناه في أثوابه فدخل علينا النبي (صلى الله عليه وسلم)، فقلت رحمة الله عليک أبا السائب، شهادتي عليک، لقد أكرمک الله. فقال النبي (صلى الله عليه وسلم): وما يدريک أن الله أكرمه؟ قالت: قلت: لا أدري بأبي وأمي يا رسول الله فمن؟ قال: أما هو فقد جاءه

---

[1] البخاري، صحيح البخاري. سەرچاوەی پێشوو، كتاب الشهادات، باب إذا زكى رجل أخاه، حديث رقم ٢٦٦٢، ص ٦٥٠.

والله اليقين، والله إني لأرجو له الخير، وما أدري والله وأنا رسول الله ما يفعل بي. قالت: فوالله لا أزكي أحدا بعد اليوم"[١].

واتە: لە خاریجەی کوڕی زەید کوڕی سابت، کە دایکی عەلاء یەکێک بوو لە ئافرەتانی پشتیوانان، بەیعەتی دا بە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) و هەواڵی پێدا کە (عوسمان کوڕی مظعون لەکاتی دابەشکردنی کۆچەرەکان بەسەر پشتیوانەکاندا، بووە پشکی ئەوان لە نیشتەجێبووندا. دایکی عەلاء دەڵێت: عوسمان لای ئێمە نەخۆش کەوت و چاودێریمان کرد تا کۆچی دوایی کرد، بە پۆشاکەکانی خۆی پێچامانەوە، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) هات بۆ لامان، گوتم: ڕەحمەتی خوات لێبێ باوکی سائیب، خوا ڕێزداری کردی. پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەچیدا دەزانی کە خوا ڕێزداری کردووە؟ دەڵێ: گوتم: نازانم، دایک و باوکم بە قوربانت بێ، ئەی کێ؟ فەرمووی: سەبارەت بەو بەخوا یەقینی پێ گەیشت، بەخوا چاکەی بۆ دەخوازم، من کە پێغەمبەری خوام، بەخوا نازانم چیم لێ دەکرێ. دایکی عەلاء دەڵێ: بەخوا لەمڕۆ بەدواوە تەزکییەی کەس ناکەم)).

لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیشتن لەئایەتە تایبەتەکان بەڕێگریکردن لەتەزکییەی خۆ ، ئەو فەرموودانەشی کەڕێگری لەتەزکییەی کەسانی تر دەکەن، بەفەرموودەی دیکە دیاری دەکرێن، چونکە لەپێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) سەلمێنراوە کەستایشی قبووڵ بووەو ستایشی هەندێک لەهاوەڵانیشی کردووە. لەوانەیە کۆکەرەوەی هەردوو شێوەکە بەو جۆرە بێت کەستایش ئەو کاتەڕێگەپێدراوە کەستایشکار ڕاستگۆ بێت و لەوە دڵنیا بن کەستایشکراو تووشی ئاشووب ناکات. پێشەوا نەوەوی باسی ئەوە دەکات: "لەبارەی ڕێگەپێدرانەوە فەرموودەی صەحیحی زۆر هاتووە. زانایان وتوویانە: ڕێگای کۆکردنەوەی نیوان فەرموودەکان ئەوەیە بوترێت: ئەگەر ستایشکراو ئیمان و یەقین و دەروونچاکی تەواوی تێدا بوو وبەچاکی ناسرابوو بەجۆرێک کەتووشی ئاشووب ولەخۆگۆڕان نەبێت بەوەو یاری بەنەفسی خۆی نەکات ئەوا نەحەرامە نەمەکروهە، خۆ ئەگەر ترسی شتێکی لەو شێوانە لێ دەکرا ئەوا

(1) Ibid., p85-139.

باش نییە پیاهەڵدانی لەڕووداو کەراهیەتێکی توندی هەیە. بەم شێوەیە فەرمووده جیاوازەکان کاریان پێدەکرێت.

لەو فەرموودانەشی لەبارەی ڕێگەپێدانەوە هاتوون: (قوله (صلی الله علیه وسلم) لأبي بكر رضي الله عنه: "أرجو أن تكون منهم") ، واتە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ بەئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: "هیوادارم کەتۆ لەوان بیت"، واتە لەو کەسانە بیت کەلەهەموو دەروازەکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێن بۆ چوونە ناو بەهەشت. لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە"لست منهم" واتە: تۆ لەوان نیت، مەبەست ئەوانەی لەبەر لوتبەرزی پۆشاکیان درێژ دەکەنەوە. پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) بە عومەری فەرموو: "شەیتان لەسەر هەر ڕێگایەک بتبینێ، ڕێگایەکی تر دەگرێتەبەر". جا فەرموودەی ڕێپێدان زۆرن.




هێڵکارییەکە دابەشبوونی مانایەکانی وشەی تەزکیە لەقورئاندا دەخاتە ڕوو

**دووەم: شێوە دەربڕینەکانی تەزکییە لەفەرموودەی پێغەمبەردا:**

بـەگوێرەیی (المعجـم المفهـرس لألفـاظ الحـديث النبـوي) کەرۆژهەڵاتناسـی هۆڵەندی (ئارندجان فنسنک) نووسیویەتی و (محمد فؤاد عبدالباقی) (تحقيق)ی بۆ کردووە، دەبینین کەئەو دەربڕینانـەی پەیوەندارن بەتەزکییـەو ئـەو وشـانەی لـەدەربڕینی (زکـی) وەرگیـراون، هـەمان ئـەو واتایانـەیان هەیـە کەلـەقورئانی پیرۆزدا هەیە، تا کە مانابەخشینێک لـەقورئانی پیرۆزدا ڕاسـتەوخۆ نـەهاتبێت و لەفـەرموودەی پەیامبـەردا هاتبێت بریتییـە لەتەزکییـەی مـرۆڤ بـۆ کەسـی تـر، ئەمـەش لەوانەیـە بکەوێتـە نـاو واتابەخشـینی ئـەم فەرمایشـتەوە: ﴿فَـلَا تُزَكُّـوٓاْ أَنفُسَـكُمۡۖ هُـوَ أَعۡلَـمُ بِمَـنِ ٱتَّـقَىٰٓ ٣٢﴾ {النجم: ٣٢}، واتـە: (خۆتـان بـەچاک و پاک دامـەنێن، خـوا زانـاترە بـەو کەسـەی زیـاتر لـەخوا ترسـە). لـەو کاتەشـدا نەهیکردنەکە بۆ ستایشی مرۆڤە بۆ خۆی و بـۆ کەسـی تـریش، فەرموودەکـەی پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) لێکدانەوەی واتای ئایەتەکەیە بـەدرێژیی. ئەمانەشـی دەیانخەینـە ڕوو چەنـد نموونەیـەکی مانابەخشـینەکانی تەزکییەیـە لەفەرموودەی پێغەمبەردا:

چەنـدین فـەرموودەی پەیوەنـدار بەتەزکییـەی دەروون لەشـێوەی نـزاو پاڕانەوە لەخودا هاتوون کەداوای بەدیهێنانی بۆ تاک دەکەن: " **عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ لَا أَقُولُ لَكُمْ إِلَّا كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله علىه وسلم) يَقُولُ: كَانَ يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ. اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَهَا**"[(١)]. واتـە: (لـە زەیـدی کـوڕی ئەرقەمـەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: شتیکتان پێناڵێم کەپێغەمبەر (درودی خـوای لەسـەر بێت) وای نەفـەرمووبێت، ئـەو دەیفـەرموو: خودایـا پـەنات پێدەگرم لەبێدەسـەڵاتی و تەمبـەڵی و لەترسـنۆکی و ڕژدی و لـەپیریی و سـزای گـۆڕ. خودایـا تـەقوا بـە دەروونـم ببەخشـەو پـاکی بکـەرەوە، تـۆ چـاکترین پاککـەرەوەیت، تـۆ پێشـەواو

(١) النيسابوري، مسلم بن الحجاج القشيري. صحيح مسلم، الرياض: بيت الافكار الدولية، ١٩٩٨م، كتاب الذكر والدعاء، باب التعوذ من شر ما، ح٢٧٢٢، ص ١٠٩٠.

گەورەی دەروونمی، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە زانستێک سودی نەبێت و دڵێک نەترسێت و دەرونێک تێر نەبێت و دوعایەک وەڵام نەدرێتەوە).

سەبارەت بەبێبەشبوونی مرۆڤیش لەتەزکەیەی خوای گەورە، لە(صەحیحی بوخاری)دا هاتووە: **(عن أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : ثَلَاثَةٌ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ؛ رَجُلٌ كَانَ لَهُ فَضْلُ مَاءٍ بِالطَّرِيقِ فَمَنَعَهُ مِنْ ابْنِ السَّبِيلِ وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لَا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِدُنْيَا، فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا سَخِطَ، وَرَجُلٌ أَقَامَ سِلْعَتَهُ بَعْدَ الْعَصْرِ فَقَالَ وَاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ لَقَدْ أَعْطَيْتُ بِهَا كَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ رَجُلٌ ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا}**[1]). واتە: (ئەبوهورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: سێ کەس هەن خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا (بەچاوی ڕەحمەت) سەیریان ناکات و خاوێنیان ناکاتەوە (لەگوناهو تاون) وسزایەکی بەسوێشیان دەدات، پیاوێک لەڕێگەیەکدا ئاوێکی زیاد لەپێویستی خۆی هەبێت و لەڕێبواری بگرێتەوە، پیاوێکیش بەڵێن و(بەیعەت) بدات بەپێشەوا (ئیمام)ێک بەلاّم بەیعەتدانەکەی هەر بۆ مەبەستی قازانجی دونیایی بێت، ئەگەر بەشی دا ڕازی ببێت و خۆ ئەگەر بەشی نەدات رقی لێی هەستێ، پیاوێکیش پاش عەسر بازاڕ دانێت وبڵێت: سوێند بەو خوایەی کەجگە لەو هیچ خوایەک نییە، ئەم شتە ئەمەندەو ئەوەندەم پێدراوەو کەسێک باوەڕ بەو سوێندەی بکات و(لێی بکڕێت) لەپاشان پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: بەڕاستی ئەوانەی کەپەیمانی خواو سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن (لەپلەو پایەی دونیایی، پارەو پول وسامان، ئەڵبەتە هەرچەندە بێت هەر کەمە).

سەبارەت بەنەهیکردن لەوەی مرۆڤ تەزکییەی کەسیتر بکات، لە(صەحیحی بوخاری)دا هاتووە: **(حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ الْحَذَّاءُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَثْنَى رَجُلٌ عَلَى رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم ، فَقَالَ: وَيْلَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ، قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ، مِرَارًا. ثُمَّ قَالَ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ**

---

[1] البخاري، محمد بن اسماعيل. الجامع الصحيح. بيروت: دار طوق النجاة، ط١، ١٤٢٢هـ كتاب المساقاة، باب إثم من مع إبن السبيل من الماء، ج٣، رقم ٢٣٥٨، ص ١٠٩.

**مَادِحًا أَخَاهُ لَا مَحَالَةَ، فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ فُلَانًا وَاللَّهُ حَسِيبُهُ، وَلَا أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا، أَحْسِبُهُ كَذَا وَكَذَا، إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهُ.** [1]). واتـه: ( محمـدی کـوڕی سـەلام دەڵێت: عبـدالوهاب هـەواڵی پێدایـن کەخالـدی کـوڕی حـەزا لەعبـدالرحمان کـوڕی ئـەبو بـەکرەوەو ئەویش لەباوکیـەوە گێڕاویەتیـەوە، وتـی: پیاوێـک لـە خزمـەت پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بـێ) ستایشـی پیـاوێکی کـرد، فـەرمووی: تیـا بچیـت، گـەردنی هاوڕێکـەتت بـڕی، گـەردنی هاوڕێکـەتت بـڕی، چەنـدبارەی کـردەوە، پاشـان فـەرمووی: هەرکـەس لـەئێوە هـەردەبوو ستایشـی برایـەکی بکـات، بابڵێـت: فڵانەکەس ئاوای دەبینم و خـوای گـەورە ئاگادارترە و تەزکییـەی کـەس بەسـەر خوادا ناکەم، من ئاواو ئاوەهای حسێب دەکەم، ئەگەر ئەوەی تێدا دەزانی).

٢- سـەبارەت بەنـەهیکردنیش لـەوەی مـرۆڤ تەزکییـەی خـۆی بکـات لە(صەحیحی موسلیم)دا هاتووە: (**عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ قَالَ سَمَّيْتُ ابْنَتِي بَرَّةَ فَقَالَتْ لِي زَيْنَبُ بِنْتُ أَبِي سَلَمَةَ :إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله علىه وسلم نَهَى عَنْ هَذَا الِاسْمِ، وَسُمِّيتُ بَرَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله علىه وسلم : لَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ، اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنْكُمْ، فَقَالُوا: بِمَ نُسَمِّيهَا؟ قَالَ: سَمُّوهَا زَيْنَبَ**) [2]، واتـە: ( لەمحمـدی کـوڕی عـەمری کوڕی عەتاوە، دەڵێت: کچەکەمم ناونا (برة)، زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە پێی وتم: پێغەمبەر خوا (درودی خوای لەسەر بێ) نەهیکردووە لەو ناوە، متیش نـاو نـا (بَرَّةَ) (ناوەکە بەواتای چاک دێت) پێغەمبەری خـوا (درودی خـوای لەسەر بێ) فەرمووی: تەزکییەی خۆتان مەکەن، خوا زاناترە کێتان چاکەکارە، وتیان: باشە ناوی بنێین چی؟ فەرمووی: ناوی بنێن زەینەب).

٣- سەرنجڕاکێشـان بـۆ نـوێژی بەکۆمـەڵ و باشـتربوونی، واتـە بەرکەتـدار تـرەو پاداشـتی لای خـوای گـەورە زیـاترە لـەنوێژی بەتـەنها، هـەتا ژمـارەی کۆمەڵەکـەش زیـاتر بـن ئـەوا زیـاتر پاککەرەوەیـە: (عـن أبـي بـن کعـب: قـال: صلى رسول الله صلى الله عليه وسلم الفجر، فلما صلى قال شاهد

---

[1] البخاري. جامع الصحيح، سەرچاوەی پێشوو، کتاب الشهادات، باب إذا زكى رجلا رجلا كفاء، ج٣، حديث رقم ٢٦٦٢، ١٧٦.

[2] النيسابوري، مسلم بن الحجاج. صحيح مسلم. سەرچاوەی پێشوو، كتاب الاداب، باب استحباب تغيير الاسم القبيح إلى حسن وتغيير اسم برة إلى زينب وجويرية ونحوهما، حديث رقم ٢١٤٢، س٨٨٥.

فلان، فسكت القوم، قالوا: نعم، ولم يحضر، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم إنَّ أثقل الصلاة على المنافقين صلاة العشاء والفجر، ولو يعلمون ما فيهما لأتوهما ولو حبوا، وإن الصف الأول على مثل صف الملائكة، ولو تعلمون فضيلته لابتدرتموه، إنَّ صلاتك مع رجلين **أزكى** من صلاتك مع رجل، وصلاتك مع رجل **أزكى** من صلاتك وحدك، وما كثر فهو أحب إلى الله تعالى) [(١)]، واته: (لەئەبوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: پێغەمبەر خوا (درودی خوای لەسەر بێ) نوێژی بەیانی کرد، کاتێ نوێژی کرد وتی فلانتان بینیوە. خەڵکەکە بێدەنگ بوون، وتیان: بەڵێ، بەلام نەهاتووە، پێغەمبەر خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: قورسترین نوێژ لەسەر دڵی مونافیقەکان نوێژی خەوتنان وبەیانییە، ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشتێکیان تێدایە ئەوا بەگاگۆڵکێش بوایە دەهاتن، ڕیزی یەکەم وەک ڕیزی فریشتەکان وایە، ئەگەر باشێتیەکەیتان بزانیایە ئەوا لەدەستیان نەدەدا، بەڕاستی نوێژکردنت لەگەڵ دوو کەسدا باشترە لەنوێژکردنت لەگەڵ یەک کەس، نوێژکردنیشت لەگەڵ یەک کەس باشترە لەوەی بەتەنها نوێژەکەت بکەیت، هەتا زیاتر بن ئەوا لای خوای گەورە خۆشەویستترە).

٤- هەر لە(صەحیحی بوخاری)دا سەبارەت بەزەکاتی ماڵ وسامان فەرموودەی زۆر هاتووە، بوخاری لەژێر چەندین ناونیشاندا بەدەربڕینی زەکات دایناون، لەوانە: (باب وجوب الزكاة، البيعة على أداء الزكاة، إثم مانع الزكاة، ما أودت زكاته فليس بكنز) نمونەی ئەمانەش: (**حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ قَالَ حَدَّثَنِي أَبِي حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ عَنْ قَيْسٍ قَالَ قَالَ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بَايَعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ**) [(٢)]، واتە: (ئیبن نومەیر بوی باسکردین، وتی: باوکم بۆی گێڕامەوە، لەئیسماعیل، لە قەیس، وتی: جورەیری

---

[(١)] ابن حنبل، أحمد. مسند الامام أحمد بن حنبل. تحقيق: شعيب الارنؤوط، وعادل مرشد وسعيد اللحام، بيروت: مؤسسة الرسالة، ط١، ١٩٩١م، مسند الامصار، حديث أبي منذر أبى بن كعب، حديث أبي بصير العبدي وابنه عبدالله بن أبي بصير عن أبي بن كعب، ج٣٥، حديث رقم ٢١٢٦٦، ص١٩١.

[(٢)] البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، كتاب الزكاة، باب البيعة على إتاء الزكاة، ج١، حديث رقم ١٤٠١، ص ١٠٦.

کوڕی عبدالله وتی: بەیعەتمدا بە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) لەسەر ئەنجامدانی نوێژو زەکاتدان و ئامۆژگاریکردنی هەموو موسڵمانێک).

٥-هەروەها زەکات بەدەربڕینی سەدەقەش لەچەندین فەرموودی دیکەی (صەحیحی بوخاری)دا هاتووە، کەچەندین ناونیشانی بۆ داناون، لەوانە: (زکاة الغنم، زکاة الورق، زکاة البقر، الزکاة علی الاقارب، من أحب تعجیل الصدقة من یومها، صدقة السر، صدقة العلانیة)، لێرەشدا تەنها وەک نمونە ئەمە دەخەینە ڕوو: **(حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ مِنْ الْإِبِلِ وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ)** [(١)]، واتە: عبدالله کوڕی یوسف بۆی باسکردین کەمالیک لەعەمری کوڕی یەحیای مازنی و ئەویش لەباوکیەوە بیستویەتی: گوێم لەئەبو سەعیدی خودری بوو وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەحوشتردا زەکات نییە تا دەگاتە پێنج سەر، لەپێنج ئوقیە زیویش کەمتر زەکاتی ناکەوێت، لەپێنج ئەوساق (یەکسانە بە٦٥٣کگم) لەدانوێڵەو خورمادا زەکات نییە).

٦-تەزکییەیەک کە بۆ کارەکان بێت: مەعازی کوڕی جەبەل دەڵێت، گوێم لێبوو پێغەمبەر خوا (درودی خوای لەسەر بێت دەیفەرموو: **(ستهاجرون إلى الشام، فيُفتحُ لكم، ويكون فيكم داء كالدمل، أو كالحرة، يأخذ بمراق الرجل، يستشهد الله به أنفسهم، ويزكى بها أعمالهم، اللهم إن كنت تعلم أنَّ معاذ بن جبل سمعه من رسول الله صلى الله علیه وسلم فاعطه هو وأهل بيته الحظ الأوفر منه..)** [(٢)]، واتە: ئێوە کۆچ دەکەن بۆ شام، بەڕووتاندا دەکرێتەوە، تووشی نەخۆشییەکی وەک سورێژە(دمل- الحرة) دەبن، توانای پیاو ناهێڵێت، خۆیان شەهید دەکات و کارەکانیان پاک دەکاتەوە، خوایە ئەگەر دەزانیت مەعاز کوڕی جەبەل ئەمەی لە پێغەمبەر بیستووە، زۆرترین بەش لێی بە خۆی و خانەوادەکەی بدە).

---

(١) سەرچاوەی پێشوو. کتاب الزکاة، باب زکاة الورق، حدیث رقم ١٤٤٧، ص ١١٦.

(٢) ابن حنبل، الامام أحمد. مسند الامام أحمد بن حنبل، سەرچاوەی پێشوو، مسند الانصار، حدیث معاذ بن جبل، ج٣٦، حدیث رقم ٢٢٠٨٨، ص ٤٠٨.

**سێهەم: تەزکییە لەقوتابخانەکانی زوهدو تەسەووف و جیهاددا:**

پـاش وەفـاتی پێغەمبـەر خـوا (درودی خـوای لەسـەر بـێ) لای هەنـدێ لەهاوەڵان ئەو ئارەزووە دروست بوو کەزوهد بکەنە شێوازێکی تایبەت بەژیان و هەڵس وکەوت و پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکدا، دواتر ئـەم شـێوە ژیانـە گەشـەی کـردو بـەرەو جۆرێـک لەدورەپـەرێزی رۆشـت، بەتایبـەت کـاتێ ڕووکارەکـانی دڵخۆشـبوون بـەدونیا لای هەنـدێک لـەچین وتوێژەکـان زیـادی کـردو ئاشـووبە سیاسیەکان بەدواییەکدا هاتن، کارەکە گۆڕا بۆ زوهد و دورەپەرێزی تـا ئـەوەی کەبەتەسووف ناسرا، ڕەنگدانەوەی ئەمەش لەچەند ڕێبازو قوتابخانەیەکدا خۆی بینیەوە. نـاوەرۆکی تەسـەووف لەبنەڕەتدا بریتییە لەخۆگرتنـەوە لەخۆشیەکانی دونیـاو زیـاتر ئەنجامدانی ئـەو کارانـەی کـە نزیکخـەرەوەن لـەخوا، گومـانی تێدا نییە ئەمە یەکێکە لەشێوەکانی تەزکییە و ئاییندارى بەشێوەیەکی گشتی.

بـەلاَم لەڕاسـتیدا تەسـەووف دیاردەیـەک نییـە تـەنها ئاییـنداری لەکۆمـەڵگای ئیسلامیدا گرتبێتەوە، بەڵکوو لەمێژووی ئایین و فەلسەفەکانی دیکەشدا هـەبووە، کۆمەڵـە کەسـێک هـاتوون شـێوازێکی دیاریکراویـان لەهەڵسـوکەوتی دەروونـی وکۆمەلاَیەتی پەیڕەو کردووە، بەتەسەووفی فەلسەفی یـاخود عیرفـان ناسـراوەو جۆرەها بیردۆزەی سـەیرو نـامۆی سـەبارەت بەتێڕوانینـە ئایینیـە ئیسـلامییەکان هاتۆتـە نـاو وەک (اشـراق) و (فـیض)و (وحـدة الوجـود) و جگـە لەوانـە، تێکـڕای ئەوانــەش بیردۆزەیــەکن کەهەسـت وسـۆزە دەروونییــەکان ملکـەچی پێـوەرە ئەقڵیـەکان دەکـات، یـاخود بـەرەو لای خـەیالاَتی خـەون وخـەوبینییان دەبـات. هەنـدێک لـەزانایانی تەسـەووفی ئیسـلامیش کەوتوونەتـە ژێـر کاریگـەری ئـەم بیردۆزانـە، لەبـەر ئـەوە زانایـانی موسـڵمان سـەبارەت بەتەزکییـە ناچـاربوون کەلـەبـارەی تەسـەووفێکی سـوونەتی ویسـتراوە قسـە بکـەن کەلەبەرانبەریـدا تەسەووفێکی فەلسەفی ڕەتکراوە هەیە.

ڕێبازی تەسەووف بەشێوەیەکی جیاواز لەمەزهەبە فیقهی و ئووصـولییەکان دەسـتی پێکـرد کەهــەوڵیان بـۆ دەرهێنــانی حوکمــە فیقهیــەکان دەدا، یـاخود لەمەزهــەبی زانایــانی عەقیــدە و کــەلام وفەلســەفە، ئەوانــەی کەســەرقاڵی بـەرگریکردن لـەبیروباوەڕەکان و ڕەتکردنـەوەی گومانـەکان بـوون، بەهـەمان شێوە جیاواز لەمەزهەبەکانی دیکەی ئەهلی عیلم. لەڕاستیدا زانایانی تەسـەووف

ئەدەبیان بەرەنگی جیاواز بەرهەم هێنا کەپڕ بوو لەزاراوەی تایبەت، لەمەشدا هاوشێوەی شەرعزانان و زانایانی ئووصولی و موتەکەلیمین و جگە لەوان، هەریەک لەوانە خاوەن زاراوەگەلی تایبەت بەخۆیان بوون.

زۆرینەی زاراوەکانی تەسەووفیش بە سیانەیی (ثلاثیات) هاتووە، پێکهێنەری تێکڕای سێیەکە مانای تایبەت بەخۆی هەیەو جیاوازە، با لەنێوان خۆشیاندا یەکتر تەواو بکەن و هەریەکەیان بەرەو لای ئەوەی دوای خۆی بڕوات، یاخود ئەوەی دواتر لەوەی پێش خۆیەوە سەرچاوەی گرتبێت. لەنموونەی ئەو سیانیانەش: سیانەی (التخلي والتحلي والتجلي)و سیانەی (الشريعة والطريقة والحقيقة). لەگەڵ ئەوەی کەهەندێک لەڕەوتی تەسەوف لەتێگەیشتن یاخود کردارییاندا لەبنەمای یەکتر تەواو کردنی سێ پێکهێنەری لایاندابوو بەجۆرێک (التجلي) لەسێینەی یەکەم دادەنا، یاخود حەقیقەتی لەسێینەی دووەم، ئەو بنەڕەتەی کەخۆی بەخۆی دروست دەبێت، گەر ئەمە ڕویدا ئەوا ئەوەی لەپێشیەوەیە هیچ نرخێکی نابێت، لەڕاستیدا لێکۆڵینەوەی زانستی لای زۆرینەی زانایانی تەزکییەو تەسەووف ئەوەیە کەئەم ئاستانە یەکتر تەواو دەکەن وبەشێوەی بەرەو سەرچوونی بەدوای یەکدا هاتوو دێنە دی.

ئەوەی کاری تەزکییە جیا دەکاتەوە پێشخستنی پاداشتی ڕۆژی قیامەتە بەسەر خۆشییەکانی ژیانی دونیادا و نزیکبوونە لەخوای گەورە بەئەنجامدانی پەرستشە سوننەتەکان وێڕای فەرزەکان. بنەڕەتی ئەمەش لەقورئانی پیرۆزدا ئەو زیادە داواکردنەیە لەمرۆڤ کەلەهەموو شتێکدا ڕەزامەندی خوای مەبەست بێت، تا ئەنجامدانی هەر کارێکی بەدەمەوەچوونی فەرمانەکانی پەروەردگاری و پەرۆشی بێت بۆ ئەو پاداشتەی لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە پێی دەبەخشێت، لێرەشدا هیچ بوارێک بۆ بەراوردکردنی بەهای دونیاو بەهای قیامەت نییە، مەگەر تەنها بەو ڕادەیەی کەدونیا هۆکارێک بێت بەرەو قیامەت: ﴿وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ۝٤﴾ {الضحى: ٤}، واتە: ((پاداشتی) دوا ڕۆژ بۆ تۆ چاکترە لەدونیا). لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ بەشێک لەتام وچێژ وەرگرتن لەدونیای بۆ هەیە، بەڵام داوای لێ کراوە قیامەتی زیاتر گرنگی پێبدات وپێشبخات: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ

وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٧٧﴾﴾ {القصص:٧٧}، واتە: (لەو (گەنج وسامان)ەی خوا پێی داوی ئەو دونیای پێ بەدەست بهێنە و بەشی خۆشت لەم دونیایەدا لەبیر نەچێ وچاکە بکە (لەگەڵ خەڵکدا) هەروەک چۆن خوا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووە و بەشوێن خراپەکاریدا مەگەڕێ لەسەر زەویدا چونکە بەڕاستی خوا خراپەکارانی خۆش ناوێت). لەئایەتێکی دیکەشدا دەفەرمووێت: ﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ ﴿٣٩﴾﴾ {غافر: ٣٩}، واتە: (ئەی گەلەکەم بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ڕابواردنێکی کەمەو بەڕاستی هەر ڕۆژیی دوایی جێی حەسانەوەی هەمیشەییە).

زوهد لەدونیادا، لای مرۆڤی باوەڕدار هەڵهاتن نییە لەهەڵگرتنی ئەو سپاردەیەی بەمرۆڤ دراوەو دەستەوسانیش نییە لەئەنجامدانی بەرپرسیارێتیەکانی سەرشانی و داواکردنی ڕۆزی حەڵاڵ لەخوای گەورەو بەشداریکردن لەبەر هەمهێنان و بەدەمەوەچوونی داواکارییەکانی واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی ، وەک ڕاهیبەکان نییە کەئەوەی خوا بۆی حەڵاڵ کردوون لەخۆیانی حەرام بکەن، خوای گەورە لەپەڕاوەکانیدا بۆ مرۆڤەکان ڕاهیبێتی لەسەر کەس پێویست نەکردووە، بەڵکو لەهەندێ کاتدا خەڵکی خۆیان ئەوەیان دروست کردووە، تەنانەت ئەگەر مەبەستیشیان لەوە چاکە بووبێت: ﴿ثُمَّ قَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيۡنَا بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَۖ وَجَعَلۡنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأۡفَةٗ وَرَحۡمَةٗۚ وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَاۖ فَـَٔاتَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۡهُمۡ أَجۡرَهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾﴾ {الحديد: ٢٧}، واتە: (پاشان بەشوین ئەواندا دیسان پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردو دواتر عیسای کوڕی مەریەممان نارد و ئینجیلمان پێ بەخشی وسۆزو بەزەییمان لە دڵی ئەوانەی شوێنی کەوتن دروست کرد و ئەو گۆشەگیریەی کەخۆیان دایان هێنابوو ئێمە ئەوەمان لەسەر پێویست نەکردبوون، بەڵام خۆیان بۆ ڕەزامەندی خوا دایان هێنابوو کەچی وەک پێویست پارێزگاری ئەو گۆشەگیرییەیان نەکرد، ئیمە پاداشتی خۆیانمان بەخشیمان بەوانەیان کەباوەڕیان هێنابوو زۆریشیان لەسنوور دەرچوون).

ئەگەرچی پێویستمان بەشێوەیەکی کردەیی تەزکییە هەیە کەکاروبارەکان بباتەوە شوێنی ڕاستی خۆی، لەمەشدا پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) پێشەنگمانە، ئەو لەپێشترە بەوەی کەلەخوا ترسان و تەقوادا شوێنی بکەوین، لەگەڵ ئەوەشدا قسەی ئەوانەی ڕەتکردەوە کەلەبارەی خواپەرستی پێغەمبەری خواوە دەیانگوت و گومانیان وابوو کەدەبێت لەپێغەمبەر خوا (درودی خوای لەسەر بێ) زیاتر خواپەرستی ئەنجام بدەن، چونکە ئەو خوای گەورە لەگوناهی پێشتر و دواتریشی خۆش بووە، یەکێک لەوانە ویستی بەردەوام بەڕۆژوو بێت، یەکێکی تریان ویستی شەو تا بەیانی شەونوێژ بکات، یەکێکی دیکەش ویستی هاوسەرگیری ئەنجام نەدات. وەڵامی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوەبوو کەفەرمووی: **(أما والله إِنّي لَأخْشَاكُمْ لِّله وَأتقَاكُمْ لَهُ لَكِنّي أصُومُ وَأفْطِرُ وَأُصَلّي وَأرْقُدُ وَأتزَوَّجُ النّسَاءَ فمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنّتِي فلَيْسَ مِنّي)** [1]، واتە: (سوێند بەخوا من لەئێوە زیاتر لەخوا دەەترسم و لەئێوە بەتەقواتریشم، بەڵام ڕۆژوو دەگرم و دەیشکێنم (مەبەست ئەوەیە هەموو ڕۆژێک بەڕۆژ نابێت) و نوێژیش دەەکەم ودەەخەوم و هاوسەرگیرش ئەکەم، هەرکەس لەسوننەتی من لابدات لەمن نییە).

بەڵام کارەکە دواتر شێوازی بەکۆمەڵی وەرگرت، چەندان دەستەی دیاریکراو پەیدا بوون کەئەندامەکانیان پابەندی ڕێنوێنییەکانی سەرکردەی دیاریکراو و شێوازی ڕەفتاری دیاریکراو لەبوارەکانی خواپەرستی و زیکر و بوارەکانی پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ پێیەوە پابەند دەبوون، کارەکە بەوەگەیشت کەوشەو زاراوەی تایبەت بەخۆیان هەبێت، لەوانەیە لەڕووکاری گشتیدا مانایەکی دیاریکراویان هەبێت، بەڵام لەناوەرۆک و ناوەخۆی کۆمەڵەکە یاخود شێخی ئەو پێڕەدا مانای تری هەیە، نموونەی ئەمەش ئەوەی کەلەهەندێ ڕێبازی تەسەووفدا بەڕشتەی سیانی ناسراوە: (التخلي(دەستبەرداربوون)، والتحلي (خۆڕازاندنەوە)، والتجلي (درەوشانەوە)).

ئەگەر دەستبەرداربوون (التخلي) مانای وازهێنان لەگوناهەکان بێت و خۆڕازاندنەوە (التحلي) پێویستی وەرگرتنی خەسڵەتە هەرە باشەکان بێت، ئەوا

---

[1] البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، كتاب النكاح، باب الترغيب فی النكاح، حديث رقم ٥٠٦٣، ص ١٢٩٢.

ئەنجامدانی دەستبەرداربوون و خۆڕازاندنەوە تا ئاستێکی دیاریکراو لەوانەیە (موریدی پەیڕەوکار) بگاتە حاڵەتی ڕوونیی ڕۆحی (الشفافية الروحية) و بەرزی ویژدانی (الرفعة الوجدانية)، کەبەدرەوشانەوە (التجلي) ناوی دەبەن، ئەو کاتەی کەمورید هەست بەدرەوشانەوەی خوا بەسەریدا دەکات.

بەڵام هەندێک لەکارەکانی تەسەووف ڕەنگی جیاواز لەهەڵسوکەوتی بیدعەو دەربڕینی بیدعەی بەخۆیەوە بینیوەو هەندێک لەڕەفتارەکانیشیان لەبازنەی زوهدی زانراو و بەرزبوونەوە لەپلەکانی تەزکییەدا ماوەتەوە. هەندێک پیر و دەستەی سۆفیش چەندین شێوازی جیهادیان لەدژی دوژمنانی ئایین بەخۆوە بینیوە و لەزۆر وڵاتی ئەفریقیاو ئاسیا کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایین کردووە.

دەکرێت تەزکییە وەک جۆرێک لەجیهاد سەیر بکەین، جیهاد بۆ نەفس: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾﴾ {العنكبوت: ٦٩}، واتە: (ئەو کەسانەی لەپێناوی ڕەزامەندی ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە، بەڕاستی ڕێنمونیان دەکەین بۆ ڕێگا چاکەکانی خۆمان و بێگومان خۆ لەگەڵ چاکەکاراندایە). جیهادی بەنەفس: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٧٤﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴿٧٥﴾﴾ {الانفال: ٧٤-٧٥}، واتە: (ئەوانەی کەبڕوایان هێناو کۆچیان کردو لەڕێگەی خوادا تێکۆشان و ئەوانەش (کۆچەرەکان) یان گرتە خۆیان و کۆمەکیان کردن، بەڕاستی هەر ئەوانەن باوەڕداری ڕاستەقینە، لێبوردن و ڕۆزیەکی چاک وبەنرخ بۆ ئەوانەیە، ئەوانەشی لەدواییدا بڕوایان هێناو کۆچیان کردو لەگەڵ ئێوەدا تێکۆشان، ئا ئەوانە لەئێوەن و ئەوانە خزمی یەکترن و هەندێکیان (بۆ میراتگرتن) شایستەترن بەهەندێکی تریان لەکتێبی خوادا (لە قورئان یا لەلوح المحفوظ)دا، بەڕاستی خوا بەهەموو شتێک زانایە).

جیهادکردنیش بەماڵ وسامان بەمەبەستی پاککردنەوەی دەروون لەرژدی ماڵ و سامان، ئیدی لەدابینکردنی پێویستیەکانی بەرگری لەئومەت و بێدەسەڵاتان بێت لەسەر زەویدا: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾﴾ {التوبة: ٢٠}، واتە:

(ئەوانەی کەبڕوایان هێناو کۆچیان کردووە لەپێناوی خوا بەماڵ و بەگیانیان تێکۆشاون پلەیان لای خوا بەرزترەو هەر ئەوانە سەرکەوتوون). یاخود ئەو کارە بە زەکاتدان بێت لەو ماڵ وسامانەی کەبەمەبەستی دەستەبەری کۆمەڵایەتی و یارمەتیدانی هەژاران زەکاتی تێدا پێویست کراوە. لەڕاستیدا وازهێنانی مرۆڤ لەبەشێکی دیاریکراوی ماڵ وسامانەکەی بەویستی خۆی و لەپیناوی خوادا، نەک بۆ دانەوەی قەرزێک یاخود وەک وەڵامدانەوەی کارێکی جوان یا پاداشتێک لەبەرانبەر خزمەتێک یان گەیاندنی سودێک پێی، بەڕاستی ئەوە پاککردنەوەی دەروون و تەزکییەیەتی: ﴿ٱلَّذِی یُؤۡتِی مَالَهُۥ یَتَزَكَّىٰ ۝١٨ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٍ تُجۡزَىٰۤ ۝١٩ إِلَّا ٱبۡتِغَاۤءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٢٠﴾ {اللیل: ١٨-٢٠}، واتە: (ئەوەی ماڵی دەبەخشێ تا (دڵ ودەروونی) پاک ببێتەوە، لەکاتێکدا کەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نییە کەپاداشت بدرێتەوە، تەنها مەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگاری بەرزو بڵندە). مرۆڤیش سوورە لەسەر ئەوەی ژیانی درێژتر بێت، لەبەر ئەوە خۆی لەهەر شتێک دوور دەگرێت کە گومان بکات دەبێتە هۆکاری مردن: ﴿وَجَاۤءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَ ٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِیدُ ۝١٩﴾ {ق: ١٩}، واتە: (نارەحەتی و بێهۆشی مردن دێت لەگەڵ ڕاستیەکاندا (پێی دەوترێت) ئەمە ئەو (مردنە)یە کەخۆی لێ دەپاراست و لادەدا). هەروەها مرۆڤ سوورە لەسەر بەدەستهێنانی ماڵ وسامان و زۆری خۆش دەوێت، کۆی دەکاتەوە دەیخاتە کارو بەرهەمهێنانەوە: ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبࣰّا جَمࣰّا ۝٢٠﴾ {الفجر: ٢٠}، واتە: (ماڵ وسامانتان زۆر خۆش دەوێت). لەبەرئەوە ئامادەیی مرۆڤ بۆ قوربانیدان بەگیانی، لەپێناوی بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانیدا و لەپەرۆشیەوە بۆ شادبوون بەدیداری پەروەردگاری و بەرەنگاربوونەوەی سووربوون لەسەر ژیان، ئەمە لەخۆیدا جیهادکردی نەفسە. ئامادەبوونیش بۆ وازهێنان لەماڵ وسامان یا بەشێکی ماڵ وسامان و بەجیگەیاندنی حەقی خوای گەورە لەو ماڵ وسامانەدا و بەشداریکردن لەبونیاتنانی کۆمەڵگایەکی بەهێزی دەستبارگروبەسۆز بۆ یەکترو بەرەنگاربوونەوەی خۆشویستی ماڵ وسامان، ئەمەشیان جیهادە بەماڵ وسامان.

**چوارەم: تەزکییەی دەروونی مرۆڤ:**

دەروونی مرۆڤ، جەستە و عەقڵ و رۆحە، ئەگەر لەتواناماندا بێ بەڕوونی و متمانەوە باس لەجەستە بکەین، ئەوا بەهەمان ڕادەی متمانەوە توانای ئەوەمان نیە باس لەرۆح و عەقڵ بکەین، چونکە رۆح لەئەمری خوای گەورەوەیە. لەوانەیە خۆی لەبوونی ژیان لەمرۆڤدا نیشان بدات وەک ئەوەی کەلەژیانی دونیادا دەیبینین بەئەرک و دەرکەوتنەکانیەوە، کە بەکۆتایهاتنی ژیان، ئەو کاتەی جەستە بەجێ دەهێڵێت ئەویش کۆتایی دێت و دەبێتە رۆحێکی چاک وبڕوادار، یان رۆحێکی سەرپێچیکاری پیس. بەڵام عەقڵ ئەمەیان بریتییە لەدەسەڵاتی ژیربوون، واتە تێگەیشتن و بەئاگابوون، لەوانەیە مێشک لەم پرۆسەیەدا رۆڵێکی هەبێت، بەڵام لەدەقەکانی قورئانی پیرۆزدا دڵ ئەو جێگایەیە کەکردەی ژیربوونی تێدایە، ئەو دڵانەی لەسنگدایە شوێنی ژیرێتییە: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ٤٦﴾ {الحج: ٤٦}، واتە: (ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەگەڕاون تا دڵیان هەبێت و بیری پێ بکەنەوە یان گوێیان هەبێت وپێی ببیستن، لەڕاستیدا چاوەکان کوێر نابن، بەڵکوو ئەوە ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لە سینەدان).

بەڵام پێکهاتەی مرۆڤ یەکە، مرۆڤ هەر کارێک ئەنجام بدات بە زنجیرەیەک هەنگاودا تێدەپەڕێت کە عەقڵ ودڵ و جەستە تێیاندا بەشدارن. هەموو کارێک بەبیرۆکەیەک دەست پێدەکات، دەچێت بۆ شوێنی ژیرێتی لەدەرەوەی، یا عەقڵ لەو گەنجینەی هەیەتی لەئەزموونەکانی ڕابردوو دێتەوە یادی و بڕیار دەدات کە بیرۆکەکە دروستە و واباشە ئەنجام بدرێت و دڵیش لەسەلامەتی ئەو ئاراستەیە دڵنیا دەبێت، چونکە دڵیش شوێنی دڵنیابوونە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ {الرعد:٢٨}، واتە: (ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە و دڵیان بەیادی خوا ئارام دەبێت، ئاگاداربن کەهەر بەیادی خوا دڵەکان ئارام دەگرن). ئەو کاتەش جەستەی مرۆڤ بۆ کردارو ڕەفتار دەجولێت و جەستەی مرۆڤیش چەندین پێکهاتەی هەمەچەشنە، لەوانە چاو و گوێ و زمان، دەست و پێ...هتد، ئەو کاتەی چاو سەرنج دەدات و گوێ

دەبیستێت و زمان دێتە گۆ و دەستەکان دەجولێن و پێیەکان دەبزوون و،بەرپرسیارێتی کردەکەش هاوبەشە لەنێوان ئەو پێکهاتانەدا: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾﴾ { الاسراء:٣٦}، واتە: (شوێن شتێک مەکەوە کەزانیاریت دەربارەی نییە، بەڕاستی گوێ و چاو و دڵ هەموو ئەوانە بەرپرسیارن لێیان).

هەموو پێکهاتەیەک لەپێکهاتەکانی خودی مرۆڤ و هەموو بەشێک لەبەشەکانی جەستەی مرۆڤ بەشێک لەبەرپرسیارێتی هەڵدەگرێت، بەرپرسیارێتی ڕاست ودروستی بیرۆکەکە و نیەت باشی و دروستی کردارەکە، بەوەش پاداشت و چاکەی پێ دەدرێت و بەرپرسیارێتی هەڵەو نیەت خراپیش، بەهۆیەوە سزاو دۆڕان بەشی دەبێت.

**١- تەزکییەی جەستە:**

مەبەست لەتەزکییەی جەستە پاکژکردنەوەی هەموو پێکهاتەکانی جەستەیە، پاککردنەوەی دەست بەوە دەبێت لەکاری چاکەو بەخشین و سەدەقەدا بەکار بێت و بەخۆشەویستی و شەوقەوە تەوقە بکات و بەسۆزەوە بەسەری مناڵی بچوکدا بهێنرێت ، حەق وچاکەی پێ بنووسرێت و یارمەتی هەژارانی پێ بدرێت. پاکژکردنەوەی قاچیش بەوە دەبێت کەبەرەو چاکە هەنگاو بنرێت، پاکژکردنەوەی چاویش بەڕامان لە دروستکراوەکانی خواو مەزنێتی گەردوون و سەرنجدانی شێوەو ڕەنگ و قەبارە جیاوازەکان و وردبوونەوە لەپێکەوەسازان و هاوسەنگی و جوانی دروستکراوەکانی خواو بەبەرز سەیرکردن و کڕنووش بردن بۆ مەزنیەکەی، لەهەمان کاتدا چاو تەنها هێندەی بەس نییە، بەڵکو بەردەوام بێت لەسەرنجدان و وردبێتەوە لەشتەکان و ڕابمێنێت لەپێودانگەکان و ئەوەش بەرەو دیاریکردنی تایبەتمەندی و خەسڵەتەکان و سەرنج و وردبوونەوەو داڕشتنەوەی بیردۆزەکان و داهێنانی جیبەجێکردنەکان و... هتد، بەکاری بێنێت. تەزکییەی ورگیش بەوە دەبێت کەبەخۆراکی حەڵاڵ تێر بکرێت، کەپێکهاتەی خۆراکەکەو سەرچاوەی دەستکەوتنی و بڕە کەشی حەڵاڵ بێت. تەزکییەی زمانیش بەوە دەبێت کە قسەکردنی ویرد و بێدەنگیشی بیرکردنەوە بێت، تەنها قسەی حەق وڕاستی پێ بکات و غەیبەت و قسەهێنان و قسەبردن و بڵاوکردنەوەی خراپەکاری و

قسەی نابەجێی پێ نەکات: **(مَنْ كان يُؤْمِنُ بالله واليوم الآخر، فليَقُلْ خيراً أو لِيَصْمُت)** [1]، واتە: هەرکەس لەئێوە باوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، باقسەی چاک بکات یا بێدەنگ بێت.

لەخراپ بەکارهێنانەکانیش ئەوەیە هەر پەلێک لەپەلەکانی مرۆڤ کاری حەرام ئەنجام بدات و ببێتە هۆی ئازاردانو تێکدان. چاو دەکەوێتە زیناوە، زینای چاویش سەیرکردنی ناڕەوایە، زمانیش دەکەوێتە زیناوە، زیناکەشی قسەی نابەجێیە و دامێنیش یا ئەوەتا ئەوانە دەگۆڕێت بۆ ئەنجامدانی کاری حەرام، یا ڕەتی دەکاتەوە[2].

لەتەزکییەی جەستەش، مرۆڤ لەژینگەیەکی چاکدا بێت کەخەڵکی پارێزکارو لەخواترس و کارچاکی تێدا بێت، کە دەبێتە هۆی تەزکییەی خۆی و گەشەی جگە لەخۆیشی، لەو ژینگەیەدا تەنها قسەی چاک دەبیستێت، مرۆڤ تێیدا دامەزراو ئەبێت و دوور ئەکەوێتەوە لەتێکەڵی نەشیاو و هۆگری هاوڕێی

---

[1] االبخاري. صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، كتاب الرقاق، باب حفظ اللسان، حديث رقم ٦٤٧٥، فەرموودەکەش (متفق عليه)، بوخاریش لەچەندین جێگادا بەدەربڕینی نزیک لەمە هێناویەتی، ئەمەش یەکێکیانە:عبدالعزیز کوڕی عبدالله لە ئیبراهیمی کوڕی سەعد ئەویش لە ئیبن شەهاب لەئەبی ئەسلەمەوە گێڕاویانەتەوە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: **(مَنْ كانَ يُؤْمِنُ باللّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فلْيَقُلْ خَيْرًا أوْ لِيَصْمُتْ، مَنْ كانَ يُؤْمِنُ باللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فلا يُؤْذِ جارَه، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ باللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ )**، واتە: (هەرکەس بڕوای بەخوداو ڕۆژی دوایی هەیە باقسەی چاک بکات یان بێدەنگ بێت، هەرکەس بڕوای بەخوداو ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێی نەدات، هەرکەس بڕوای بەخوداو ڕۆژی دوایی هەیە بارێز لەمیوانی بگرێت).

[2] النيسابوري، مسلم بن الحجاج، صحيح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، كتاب القدر، باب كتب على ابن ادم حظه من الزنا، لەئیبن عەباسەوە، وتویەتی: هیچ شتێکم نەبینیوە وەک وردەگوناه بێت لەوەی کەئەبوهورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (إن الله كتب على ابن آدم حظه من الزنا أدرک ذلک لا محالة، فزنا العينين النظر، وزنا اللسان النطق، والنفس تمنى وتشتهي، والفرج يصدق ذلک أو يكذبه) ، واتە: (هەموو ئادەمیزادێ خوای گەورە بەشی خۆی داوێنپیسی لەچارەی نووسیووە، خوانەکا دەکرێ تووشی ئەوە ببێ، داوێنپیسی چاو بریتییە لەڕوانینی ناڕەوا، داوێنپیسی زمانیش گوتەو قسەی نابەجێیە، دڵ خوازیاری ئەو ئەو کارە ناڕەوایە دەکات و، دەروونیش ئاواتی ئەوە دەخوازێ، دامێنیش ئەمە بەکردەوە بەدی دێنێ یا ڕەتی دەکاتەوە) فەرموودەی ژمارە ٢٦٥٧، ص ١٠٦٦..

خراپــەکار و ژینگــەی نادروســت و خــراپ، کەســەرپێچییەکانی خــوای تێـدا دەڕازێنرێتەوە، ئازاردان بڵاو دەکاتەوەو ئاشووب بەرپا دەکات.

هەر لەتەزکییەی جەستە ئەنجامدانی پەرستشـەکان، یەکەمینیان نوێژکردن، واتـە ئەنجامـدانی بـەو شـێوەی داوا کـراوە و بەتـەواوترین شـێوە لەچۆنیـەتی ڕاوەستان و چەمانەوەو کڕنووش و دانیشتن و ئارامبوون لەهەموو حاڵەتەکان، بـەجۆرێک کەهەسـت بکـات لەبـەردەم خـوای گەورەدایـە لەهــەموو جوڵــەو وەستانێکدا. بەهەمان شێوە حەج وعەمرەو سەردانی ماڵی خواو بەجێگەیاندنی مەناسیکەکانی تـەواف وچـوون وهاتنـەوەی سـەفاو مـەروا و ڕەجـم و ڕۆشـتن لەشـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر بـەو جـۆرەی پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسەر بێ) ئەنجامی داوە ئەمانەش تەزکییەن، "خذوا عني مناسككم"، خۆ ئەگـەر بـەجوانی ئەنجامـدانی ئەرکـە کردارییـەکان کـە جەسـتەی مـرۆڤ و پەلـەکانی بــەجێیان دەگەیــەنێت ڕووکــاری دەرەکــی کــارە چاکــەکان بێــت کەحوکمــە فیقهییــەکانی چۆنیــەتی ڕێــک ئەنجامــدانیان خســتۆتە ڕوو لەگــەڵ ئــەوەدا دامــەزراوەیی نیــەت و ئاراســتەی دڵ لەپێویســتیە ناوەکییــەکانی کارەکەیــە و زانایـانی تەزکییـە گرنگـی زۆریـان پێداوە، بـۆ ئـەوە نـا ببێتـە جێگرەوەی چـاک ئەنجامدانی کارەکە بەگوێرەی ئەحکامە فیقهیەکان، بەڵکوو بۆ ئەوەی بـەچاکترو تەواتر ئەنجام بدرێت.

**٢- تەزکییەی عەقڵ:**

تەزکییــەی عــەقڵ لەتەزکییــەی دەروونەوەیــەو عــەقڵ لەقورئانـدا ئامێرێـک، یـاخود شـتێک، یـا بەشـێکی مـادی نییـە، وەک چـاو یـاخود گـوێ، بـەڵکو بریتییـە لەخەسـڵەتێک، کـە مـرۆڤ لەبوونــەوەرە زینــدوو نازینــدووەکانی تــر جــودا دەکاتـەوە، بـەهۆی بـوونی عەقڵـەوە مـرۆڤ ئـەرکبار (مكلف)ەو بەرپرسـیارێتی دەکەوێتـە ئەسـتۆ، ئەمـەش کۆدەنگی زانایـانی ئومـەتی لەسـەرە[١]. ئـەرکی عـەقڵ تێگەیشـتنی زانسـت و مەعریفـەو بەئاگابوونـە لێیـان، یـان خـودی زانسـت و مەعریفەیە.

[١] الايجي، عضد الدين عبدالرحمن بن أحمد. المواقف في علم الكلام. القاهرة: مكتبة المتنبي، (د.ت)، ص ١٤٦.

لەو ئایەتانەی کەلەبارەی عەقڵەوە وەک وەسفی ئەرکەکەی هاتووە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾﴾ {البقرة: ١٦٤}، واتە: (بەڕاستی لەدروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی شەو و ڕۆژو ئەو کەشتیانەی کەلەدەریادا دێن ودەچن بەوشتانە کەقازانج بەخەڵکی دەگەیەنن و ئەوەی کەخوا لەئاسمانەوە باراندی لەئاو (باران)و پاشان زەوی پێ زیندوو کردەوە پاش مردنی و تێیدا هەموو جۆرە زیندەوەرێکی بڵاوکردەوەو بایەکانی بەهەموو لایەکدا گێڕاو ئەو هەورانەی ڕامکراون لەناوەندی ئاسمان و زەویدا چەند بەڵگەن بۆ کەسانێک کەتێبگەن). ئەم ئایەتە گەردوونیانە بۆ ژیربوون و ڕامان و بیرکردنەوەو لێوردبوونەوەو تێگەیشتن هاتوون. دەرئەنجامی ئەوەش بەدەستهێنانی ڕێنوێنییە، پاشان عاقیبەت خێری و پاداشتی ڕۆژیی دوایی. بەڵام ئەوانەی بیرناکەنەوەو هەڵناسن بەکردەی ژیربوون، بەگرتنەبەری هۆکارەکانی بەدەستهێنانی ڕێنوێنی و شوێنکەوتنی ئەوەی خوای گەورە ناردوویەتی، لەبری ئەوە شوینی ئەوە دەکەون کەبینیویانە باوو باپیرانیان ئەنجامی دەدەن با باووباپیرانیشیان تێنەگەیشتبن، بەڕاستی ئەوانە هیدایەت وەرناگرن و عاقیبەت شەڕی و سزای قیامەت بەشیان دەبێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾﴾ {البقرة: ١٧٠}، واتە: (کاتێک پێیان بوترێت شوێن ئەو (قورئان)ە بکەون کەخوا ناردوویەتیە خوارەوە، دەڵێن: نەخێر بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین کەباوو باپیرانمان لەسەری بوون، ئەگەرچی باوو باپیرانیشیان هیچ تێنەگەیشتبن وگومڕا بووبن).

ئایەتی دیکەش هەیە عەقڵ دەکاتە ئەو زانراوەی داواکراوە تێی بگەیت، نەک خودی پرۆسەی تێگەیشتن، لەمبارەیەشەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ {العنكبوت: ٤٣}، واتە: (ئەو

وێنـەو نمونانـە بـۆ خـەڵکی دێنینـەوە، تـەنها زانایـان لـەوە تێدەگـەن). نمونـەکان بریتین لەو زانینەی کە تێگەیشتن وتێگەیاندنی داوا کراوە.

لەسۆز و میهرەبانی خوای گەورەیە، کە هۆکارەکانی هیدایـەت "ئایەتـەکان"ی زۆر دانـاوەو بـۆ تیگەیشـتن و لـێ وردبوونـەوە خسـتونیەتە ڕوو لەئایەتەکانـدا دەرئـەنجامی خـوازراویش کـە بریتییـە لە"هیدایـەت وەرگـرتن" ڕاسـتەوخۆ پەیوەسـتی کـردوە بـەکردەی "بیرکردنـەوەوە"و بـەهۆی "تێگەیشـتنیان"، ئـەو ئایەتانـەش ئایەتـە نوسـراوەکان و ئایەتـە بینراوەکـانن، خـوای گـەورە دەفەرمووێت: ﴿الٓمٓ ١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۚ بَلۡ هُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ٣﴾ {السـجدة: ١٠٣}، واتـە: (بە(ئـەلیف، لام، مـیم) دەخوێنرێتـەوەو خـوا زانـاترە بەواتاکـەی، لەهێنانـەخوارەوەی ئـەم قورئانـەدا هـیچ گومـانی تێدا نییـە، لەلایـەن پـەروەردگاری جیهانیانەوەیـە، ئایـا (بێباوەڕەکـان) دەڵـێن (محمـد) خـۆی (ئـەم قورئانەی) هەڵبەستووە، (نەخێر هەڵینەبەستووە) بـەڵکو ئـەو (قورئـان)ە ڕاسـتەو لەلایـەن پەروەردگارتـەوە (هـاتووە) بـۆ ئـەوەی بـەو (قورئانـە) خـەڵک بترسـێنێ کەلەپێش تۆ ترسێنەرێکیان بۆ نـەهاتووە بـەڵکو ڕێنمـوونی وەربگـرن). هـەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ١٧٠﴾ {البقرة: ١٧٠}، واتـە: (کاتێک پێیـان بوترێـت شـوێن ئـەو (قورئـان)ە بکـەون کـەخوا ناردوویەتیـە خـوارەوە، دەڵـێن: نەخێر بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین کەباوو باپیرانمان لەسەری بوون، ئەگەرچی باوو باپیرانیشیان هیچ تێنەگەیشتبن وگومڕا بووبن).

ئایەتـەکان لێـرەدا ڕێنمونیکـارن و نوسـراونەتەوەو لەقورئانـدا هـاتوون و دەخویندرێنـەوە، خـوای گـەورە لەمبارەیـەوە دەفـەرمووێت: ﴿وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ٣١ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ٣٢﴾ {الانبیـاء: ٣١-٣٢}، واتـە: (لەزەویدا چەندین شاخی دامەزراومان داناوە بۆ ئەوەی جوڵە نـەکات بەوانـەی (بەسەرپشـتیەوەن) و دۆڵ وڕێگامان لەزەویدا سازاندووە تا ئەوان شارەزا بن و پێویستی خۆیـان دابـین بکـەن، ئاسمانەکانیشـمان کـردوون بەسـەقفێکی پـارێزراو بـەڵام ئەوانـە

پشـتیان لـەئایەتـەکانی ئاسـمان وەرگیـراوە). لیـرەدا ئـەو ئایەتانـەی کلیلـی ڕێنموونین بریتین لەئایەتە گەردوونیە بینراوەکان. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٠٣﴾ {ال عمران: ١٠٣}، واتـە: (هـەمووتان دەسـتبگرن بـەهۆی پەیوەسـتیتان بـەخواوە (کەقورئانـە) و لێک جیا مـەبن و بیر لەبـەهرەو چاکـەی خـوا بەسـەرتانەوە بکەنـەوە لەکاتێکدا کـە ئێوە دوژمنی یەکتر بوون، بـەڵام خـوا هـۆگری خسـتە نێوان دڵـەکانتان، ئیتـر بـەهۆی ئەو چاکـەی خـواوە بـوون بـەبرای یـەکتر، لەکاتێکدا ئێوە لەسـەر لێواری چاڵی ئاگر بوون، بەڵام خوا ڕزگاری کردن لێی، بەوشـێوەیە خـوا بەڵگـەو نیشـانەکانی ڕوون دەکاتـەوە بۆتـان تابـەردەوام بـن لەسـەر ڕێنمـوونی). لیـرەدا ئایەتـەکان ئایەتی دەروونی و کۆمەڵایەتین.

ئایەتـەکانی قورئـان لـەزۆر جێگـادا ئایەتـەکانی ڕێنمـوونی (ایـات الهدایـة) لەلایـەک و هـەردوو پرۆسـەی بیرکردنـەوەو تێگەیشـتن پێکـەوەی بەسـتونەتەوە لەلایەکی ترەوە، خوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٣ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٤﴾ {الرعد: ٣-٤}، واتە: ( ئـەو زاتەیـە کـەزەوی ڕاخسـتووەو چەندەها چیا و ڕووباری تێدا داناوەو لەهەموو جۆرە میوەیـەک جووتێک نێرو مێـی تێـدا دروسـت کـردووە و شـەو دەدات بەسـەر ڕۆژدا، بەڕاسـتی لەوانـەدا بەڵگـەو نیشـانە هەیـە بـۆ ئـەو کەسـانەی کـەبیر دەکەنـەوە، لەزەویشـدا چەنـد پارچـەی لـەپاڵ یـەکتردا هـەن، هـەروەها باخـاتی تـرێ و ڕەزو کشـتوکاڵ و دارخورمـای دووقـەدو یـەک قـەد، هـەموویان بەیـەک ئـاو ئـاودەدرێن، کـەچی هەندێکیانمان فەزڵ داوە بەسەر هەندێکی تریاندا لەخواردندا، بەڕاسـتی لەوانـەدا چەنـد نیشـانەی ڕوون هەیـە بـۆ ئەوانـەی تێدەگـەن وبیردەکەنـەوە). لەئایـەتێکی

دیکەدا دەفەرموویێت: ﴿يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ۝١١ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ۝١٢﴾ {النحل: ١١-١٢}، واتە: (بەو (ئاوە خوا) بۆتان دەڕوێنێت کشتوکاڵ وزەیتون و دارخورماو مێو و ڕەزو هەموو بەرو میوەیەک، بەڕاستی لەوەدا بەڵگەیەکی ڕوون هەیە بۆ ئەو کەسانەی بیردەکەنەوە، شەو و ڕۆژو خۆرو مانگیشی بۆتان ڕام هێناوە، هەروەها ئەستێرەکانیش ڕام هێنراون بەفەرمانی خوا، بەڕاستی لەوەدا بەڵگەی ڕوون هەیە بۆ ئەوانەی کە ژیرو تێگەیشتوون). لەئایەتێکی دیکەشدا دەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗۖ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ لَّبَنًا خَالِصٗا سَآئِغٗا لِّلشَّٰرِبِينَ ۝٦٦ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ۝٦٧ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ۝٦٨ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ۝٦٩﴾ { النحل: ٦٦-٦٩}، واتە: (لەبەروبوومەکانی دارخورماو ڕەزەکانیش (خواردنەوەی) سەرخۆشکەر دروست دەکەن و ڕۆزی و بژێوی پاک وچاکیشی (لێ دروست دەکەن وەک مێوژ و دۆشاو)، بەڕاستی لەوەدا نیشانە هەیە بۆ کەسانێک کەتێدەگەن، پەروەردگارت سروشی کرد بۆ هەنگ کەلەچیاکاندا خانوو سازبدەو لە(کلۆری) دارو درەختەکان لەو (شوێن)انەی کەخەڵکی دروستی دەکەن بۆی، پاشان لەهەموو بەروبوومێک بمژە، ئەوسا ئەو ڕێگایانەی پەروەردگارت بگرە بەر بەملکەچی، لەسنگی ئەو (هەنگانەوە) خواردنەوەیەک (هەنگوین) دێتە دەر کەڕەنگەکانی جیاوازەو شیفای تێدایە بۆ خەڵکی، بێگومان لەوەدا نیشانەی گەورە هەیە بۆ کەسانێک کەبیر دەکەنەوە).

لە ئایەتەکانی قورئاندا گرنگی نیشانە ڕێنموونیکارەکان لەلایەک و پرۆسەی بیرکردنەوەو ژیربوون و زانین و هەستانی بەشەکانی مرۆڤ -بەتایبەت گوێ و چاو- بە ئەرکەکانیان لەلایەکی ترەوە لەیەک شوێندا پەیوەست کراون بەیەکەوە، هەروەها لەهەمان شوێندا نیشانە دەروونی و کۆمەڵایەتی و

گەردوونییەکان پێکەوە کۆ کراونەتەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ٢٠ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٢١ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ٢٢ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ٢٣ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَيُحۡيِۦ بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٢٤﴾ {الروم: ٢١-٢٤}، واتە: (لەنیشانەکانی ئەوە (خوایە) کەلە(ڕەگەزی) خۆتان هاوسەرانێکی بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لایان و خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان، بەڕاستی لەوەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێ کەبیردەکەنەوە، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی زمانتان و ڕەگەزتان لەنیشانەکانی (دەسەڵاتی) ئەوە، بەڕاستی لەوەدا بەڵگەی زۆر هەیە بۆ زانایان، خەوتنیشتان بەشەوو ڕۆژداو هەوڵدانتان (لەڕۆژدا) بۆ  بەهرە وەرگرتن لەبەخششی (ڕۆزی) خوا لەنیشانەکانی ئەوە، بەڕاستی لەوەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ کۆمەڵێ کە ببیستن، لەنیشانەکانی خوایە کەهەورە برووسکەتان نیشان دەدات بۆ ترساندن و ئومێد (ترسان لەهەورە بروسکەکەو ئومێدی باران باراین) لەئاسمانەوە باران دەبارێنێ کەزەوی دوای مردنی بەهۆی ئەو بارانەوە دەبوژێتەوە، بەڕاستی لەوەدا چەند بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی ژیرییان بەکار دەهێنن).

لەڕاستیدا هێنانەوەی ئەم نمونانە لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆ گەواهیدانە —چەندەها ئایەتی دیکەش هەن جگە لەمانە- جەخت لەوە دەکەنەوە کەخوای گەورە دەیەوێت عەقڵی مرۆڤ بەسەرنجدان و ڕامان وبیرکردنەوە پاکژ ببێتەوە، بۆ ئەمەش هەر دەبێت هەستێت بەو ئەرکانەی کەکەرەستەکانی ژیربوونیان بۆ دروست کراوە کەئەوانیش بیستن وبینین و جگە لەوانە، جەخت لەوەش دەکەنەوە کە گەڕان بەزەویداو سەرنجدان و وردبوونەوە لەگەردوون و پەند وەرگرتن لەڕووداوەکانی مێژوو زانستی سروشتی و کۆمەلایەتی و دەروونی زۆر دەبەخشێتە مرۆڤ، لەو جیهانەی کە لەم دونیایەدا مرۆڤی تێدا

دەژی، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو نیشانەو بەڵگانە ئاگادارکەرەوە و وەبیرهێنانەوە و هاندانە و ئامانج لێی دەربازکردنی مرۆڤە لەژیانی بێئاگایی و بێهودە و ویست وئارەزووەکان و شوێنکەوتنی ئەوەی کە خەڵکی لەسەر ڕاهاتووە و هۆگری بوون و ئەوەی کەلەباووباپیرانیانەوە لەشێوەکانی گومڕایی و سەرلێشێوان.

بەڵام زانست و مەعریفە سەبارەت بەجیهانی پەنهان (غەیب)ە، خوای گەورە خۆی ئەوەندەی مرۆڤ لەبارەی ئەو جیهانەوە پێویستی بێت فێری دەکات، جەختیش لەوە دەکاتەوە بۆ تێگەیشتنی و زانین لەبارەی جیهانی غەیبەوە، بەهۆی لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوە بەهیچ ناگات، جگە لەوەی کەخوای گەورە بەوەحی ناردوویەتی و هەر هەوڵێک بۆ گەڕان بەشوێن سەرچاوەیەکی تر جگە لەوەحی هەوڵێکی بێهودە و بێسوود دەبێت، باشتر وایە بۆی کەلەشتێکدا بەکار بێنێت کەسوودی هەبێت بۆی، ئەمە بەهەمان شێوە بۆ هەندێ بابەتی شەریعەت و درێژەی بابەتەکانی و مەبەستەکانیشی بەهەمان شێوەیە، وەک نوێژو ڕۆژوو حەج و حوکمەکانی حەڵاڵ وحەرام لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا، لەبەر ئەوەی ڕازیبوون بەوەی کەخوای گەورە تەنها خێرو بەرژەوەندی مرۆڤ و ژیانێکی تێگەیشتوانەی پێگەیشتوانەی دەوێت لەوانەدا بۆ مرۆڤ، ئەوە ئەوپەڕی زانین ومەعریفەیە، پاشان کارکردن بەو زانینە بریتییە لەڕێنموونی و تەزکییەو تێگەیشتن، بەڵام زۆر بگرە و بەردە و مشتومڕ و وروژاندنی گومان و نەیارێتی و پەنابردن بۆ هۆکارەکانی ڕەتکردنەوە و و نکوڵیکردن، ئەوانە ڕێگای گومڕابوونن کە لە دونیا و قیامەتیشدا چاکەیەک بەخاوەنەکەیان ناگەیەنن.

لەڕاستیدا ڕەفتارەکانی مرۆڤ لەهەموو ڕوویەکەوە بەشێوەیەکی بنەڕەتی پشت بەستووە بەو زانست و مەعریفەیەی کە مرۆڤ بەدەستی دەهێنێت و بەڕادەی ئەو تەزکییەیەی کە مرۆڤ لەزانستەکانەوە دەستی دەکەوێت، کە دەبنە تەزکییەی ڕەفتاری لەژیانیداو ڕێنموونیی و دامەزراویی و پێگەیشتنی لەنەفسیدا و لەپەیوەندیشیدا بەپەروەردگاریەوەو لەپەیوەندیشیدا لەگەڵ خەڵکانی دەوروبەری، لەخزمان و کەسانی نزیکی و برایانی ئایینی و هەموو ئەوانەی لەمرۆڤایەتیدا برایینی.

لەکۆتایی باسەکەماندا سەبارەت بەتەزکییەی عـەقڵ، هێندە بەسـە بیهێنینـەوە یادمـان کەزانسـتەکان و مەعریفـە کەڕۆشـنبیریێتی مرۆڤـی موسـڵمان پێکدەهێنن، پێویستە گشتگیر و هاوسەنگ و یەکتر تەواوکار بن، ڕادەیەک لەهەندێ زانسـتی گشـتی هەیـە بـۆ هـەر تاکێـک پێویسـتە بەمەبەسـتی تەزکییـەی ژیـانی دونیـا و قیامەتی، ڕادەیەکیش لەزانسـتە تایبەتمەنـدەکانیش بـۆ تەزکییـەی خـاوەن پیشـەو کـار پێویسـتە بەمەبەسـتی گەیشـتن بـەچاک و تـەواو کـارکردن و باشـتر بـوون لەبەجێگەیاندنیدا، ڕادەیـەکیش لەزانسـتەکان دەبێـت هـەبێت تایبـەت بـە ئەوانـەی کەدەیانەوێت ڕۆڵی ئەم ئومەتە پاکژ بکەنەوە تا بتوانێت ڕکابـەرێتی نەتـەوەکانی تر بکات لەداهێنان و توانابوون لەسـەر زەویدا. لەهـەموو ئاسـتێک لەئاسـتەکانی ئەم زانستانە، لایەنی تیۆری و لایەنی پراکتیکی هەیە، کەتییاندا لایەنەکانی ئیمان و زانست و کار یەکتر تـەواو دەکـەن و تێیانـدا سـەرچاوەکانی زانسـت لـەوەحی خـواو ئـەزموونی مرۆڤایـەتی لـەجیهانی شـتەکان و ڕووداوەکـان و دیاردەکـان یـەکتر تـەواو دەکـەن و ڕێنـوێنی لـە ڕابـردوو وەردەگرێـت و شـارەزای ئێسـتا دەبێت و بۆ داهاتوو دەڕوانێت و تێیاندا پێکهێنـەرەکانی دەروونـی مرۆیی: ڕۆح و عەقڵ و جەستە یەکدی تەواو دەکەن.

### ٣- تەزکییەی دڵ:

خەڵکی وا ڕاهاتوون کە درککردن بەڕاستییەکان و تێگەیشتن لـەڕووداوەکان بۆ عەقڵی مرۆڤ بگێڕنەوە، لەسەر ئەم بنەمایەش قبـووڵی دەکـەن و بـڕوای پـێ دەهێنن، هەر بۆیە -بۆ نموونە- باوەڕدار بڕیار دەدات کەشـەرعی خـوا حەقـە و دەستبەرداری هەر ویست وئارەزوویەک دەبێت کەهەواو هەوسی بیڕازێنێتـەوە بۆی. لەگەڵ ئەوەی کەئیمان بەو حەقیقەتانە لێردا ئەوەیـە کەلەدڵـدا ئەچەسـپێت، کـەچی خـەڵکی وا ڕاهـاتوون کەهەنـدێ کاروبـاری جیـا لەوانـەی بـۆ عـەقڵی دەگێڕنـەوە بگێڕنـەوە بـۆ دڵ، ئەگـەر عـەقڵ شـوێنی زانسـت و مەعریفـەو فیکـر، یـاخود ئـەوەی کـەدژە لەگـەڵ ئەمانـە وەک نـەفامی و نـەزانی و گـەمژەیی و مشـتومڕکاری و نکـوڵی بێـت، ئـەوا دڵـیش شـوێنی نیـەت و ئیمـان و هەسـت وسۆزو ئەوانەشە کە دژن لەگەڵ ئەمانەدا، وەک بێباوەڕی و کینەو نەخۆشـی و ویست وئارەزوو.

هەروەها خەڵک وا ڕاهاتوون کەشوێنی بنەڕەتی تەزکییەی نەفس بریتییە لەدڵ، چونکە تەزکییە تایبەت وپەیوەندارە بەکاروبارەکانی دڵەوە زیاتر لەتایبەتبوونی بەهەر شتێکی ترەوە.

پێشتریش ئاماژەمان بەوەدا کە قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە ڕایدەگەیەنێت کەپرۆسەی ژیربوون (التعقل) –بەواتای بەئاگابوون وتێگەیشتن و زانین- لەدڵدا دەبێت: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ﴾ {الحج: ٤٦}، واتە: (ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا دڵیان هەبێت و بیری پێ بکەنەوە). لەگەڵ ئەوەشدا قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی ڕوون جیاوازیی دەکات لەنێوان ڕووکار، ئەوەی کە بۆ سەیرکەر و تێبینیکار لەوێنەی کاری پەل و بەشەکانی جەستەی مرۆڤدا دیارە، چونکە ئەوانە کاروباری هەستپێکراون و لەگەڵ کاری ناواخن (الباطن) کەمرۆڤ دەتوانێت لەدەروونی خۆیدا بیشارێتەوە: ﴿وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ﴾ {البقرة: ٢٨٤}، واتە: (ئەگەر ئەوەی کە لەدڵتاندایە ئاشکرای بکەن یا بیشارنەوە خوا لێپێچینەوەتان لەسەری لەگەڵ دەکات). دیارە ئەوەی کەمرۆڤ ئەیشارێتەوە لەسنگیدا ئەیشارێتەوە:﴿ قُلۡ إِن تُخۡفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمۡ أَوۡ تُبۡدُوهُ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ﴾ {ال عمران: ٢٩}، واتە: (پێیان بڵێ (ئەی موحەمەد) ئەوەی لەدڵتاندایە ئەگەر بیشارنەوە یان ئاشکرای بکەن خوا پێی دەزانێ). دڵیش لەنێو سنگدایە: ﴿وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ٤٦﴾ {الحج: ٤٦}، واتە: (بەڵام دڵەکان کوێرو نابینا دەکات کەلەسنگدایە).

ئەگەرچی لەڕووکاردا وادەربکەوێت کەلەکاروبارە هەستییەکانە، لەگەڵ ئەوەدا ئەوەی بەرانبەریەتی لەناواخن (باطن) لەکاروبارە مەعنەوییەکانە، چونکە ناواخنی مرۆڤ بەشە مادیە نادیارەکانی وەک سییەکان وگەدەو ریخۆڵەو تەنانەت ئەم ترۆمپایەی خوێنیش کە لە لای چەپی سنگدایە و ناونراوە دڵ ئەوە نییە، ناواخن لێرەدا ئەو کاروبارانەیە کەمرۆڤ ئەنجامی دەدات، وەک نیەت وسووربوون و کرداری بەویست و خورپەو هەڵچوونی دەروونی بەهەستی خۆشەویستی و ڕق ئەو دڵەی کەلەسینەدایە دەیانشارێتەوە، ئەمە وێڕای

تێگەیشتنی بیرۆکەکان و لێوردبوونەوە و پەرۆشی رۆح و پەیوەندییەکانی لەگەڵ خوای دروستکاری بوونەوەرداو لەگەڵ رۆحەکانی دیکەدا[1].

دڵ لێرەدا بەو واتایە رۆح و عەقڵ و ئەو کردەوە ناواخنیانەی کەگوزارشتی لێ دەکەن دەگرێتەوە، لەیەکێک لەواتاکانیشیدا نەفسیشی گرتەوە: ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ﴾ {البقرة: ٢٨٤}، واتە: (ئەگەر ئەوەی کە لەدڵتاندایە ئاشکرای بکەن یا بیشارنەوە خوا لێپێچینەوەتان لەگەڵ دەکات). هیچ سەیر نییە ئەگەر ئەدەبیاتی تەسەووف و پەروەردەو ویژدانیەت کەوەک هەموو لایەنە مەعنەوییەکانی کرداری مرۆڤ باس لەتەزکییەی نەفس و تەزکییەی دڵ بکەن.

نامانەوێت لێرەدا فەرهەنگی دەربڕینەکانی دڵ لەقورئانی پیرۆزدا بخەینە ڕوو چونکە زۆر زۆرن و تەنها هێندە بەسە ئاماژە بەوە بدەین کەدڵ، لەزاراوەی قورئانیدا بەپێی ئەو چاکە و خراپەی کەتێیدا جێگیر دەبێت گۆڕانی بەسەردا دێت، لەکاروبارە مەترسیدارەکانی وەک کافربوون و ئیمان و لەخورپە خێراکانی ئەنجامدانی کارێک یا ئەنجامنەدانی لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەگۆڕێت.

چەندین ئایەتی قورئانیش لەبارەی کارەکانی دڵ و لێپێچینەوە لێی هاتووە: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾﴾ {البقرة: ٢٢٥}، واتە: (خوا سوێندی بێ هوودە (لەدەم دەرچوون)تان لێ ناگرێ، بەڵام سوێندێکتان لێ دەگرێت بەدڵ بتانەوێت ومەبەستان بێت، خوا لێخۆشبوو لەسەر خۆیە). گرنگترینیشیان ئەوەیە کەویستی مرۆڤی لەسەرەو دڵیش بەئەنقەست بیکات: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾﴾ {الاحزاب: ٥}،

---

[1] ئاماژەیە بۆ ئەو فەرموودەیەی کە دایکی باوەڕداران عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە: "دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: "**الأرْواحُ جنودٌ مجنّدةٌ ما تعارفَ منها ائتلفَ وما تناكرَ منها اختلَف**"، واتە: (رۆحەکان سەربازێکی ڕامکراون)، بڕوانە: البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، كتاب أحاديث الانبياء، باب الارواح جنود مجندة، حديث رقم ٣٣٣٦، ص٨٢٠.

واتـە: (هـیچ گوناهێکتـان لەسـەر نییە لـەو (بانگکردنـەدا) کە بەنـەزانین گوتبێتـان (پێش هاتنی ئەم ئایەتە) بەڵام گوناهبار دەبن ئەگەر بەدڵ و بەئەنقەست بیکەن و خوای گەورە لێبوردەی میهرەبانـە). لەگەڵ ئـەوەی پـەنای بۆ دەبـات لەتۆبـەو ترس و گەڕانەوە بۆ لای خوا: ﴿مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ ٣٣﴾ {ق: ٣٢}، واتـە: (ئـەوەی لەپەنهانـدا لـەخوای میهرەبـان ترسـابێ و بـەدڵێکی ڕوو لەخواوە گەڕابێتەوە).

لەچەنـدان ئایـەتی قورئانیشـدا باسـی ئـەو سـیفەتانە کـراوە کـەدڵ بـەهۆی نەرمونیانییەوە بەدەستیان دینێت: ﴿ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ﴾ {الزمـر: ٢٣}، واتـە: (پاشـان پێسـتیان و دڵیـان نـەرم دەبێت بـەیادی خـوا، ئـەوە ڕێنـوێنی خوایـە، بـەو (قورئانـە) ڕێنمـونی هەرکـەس دەکـات کەبیـەوێ). هەروەها سۆزو بەزەیی: ﴿وَجَعَلۡنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأۡفَةٗ وَرَحۡمَةٗۚ﴾ {الحدید: ٢٧}، واتە: (سـۆزو بـەزەییمان لـەدڵی ئەوانـەدا دروسـت کـرد کەشـوێنی کـەوتن). یـان دڵڕەق: ﴿فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ﴾ {ال عمران: ١٥٩}، واتە: (بەهۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان نـەرمونیانی، ئەگـەر تۆ بـەدخو و قسـەڕەق و دڵـڕەق بوویتایـە ئـەوە هـەموویان لـەدەورت بڵاوەیـان دەکـرد). یـا دڵڕەقـی: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم﴾ {الزمـر: ٢٢}، واتـە: (سـزاو لەناوچوون بۆ ئەوانەی دڵیان ڕەقە). یـان بێزاربوونی دڵ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ {الزمـر: ٤٥}، واتـە: (کاتێک یـادی خـوا بـەتاک وتـەنیا بکرێت دڵـی کەسـانێک کـە باوەڕیـان بـەڕۆژی دوایـی نییـە تێک دەچێت و بێزار دەبن).

دڵیش جێگای دڵنیایی و ئاراميیە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ {الرعـد: ٢٨}، واتـە: (ئەوانـەی کـەبڕوایان هێنـاوەو دڵیـان ئـارام دەبێت بـەیادی خـوا، ئاگاداربن کەهـەر بـەیادی خـوا دڵـەکان ئـارام دەگـرن). لەئایـەتێکی دیکەشـدا دەفـەرموویێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ {الفتح: ٤}، واتـە: (ئـەو خوایـە زاتێکە ئـارامی دابەزاندووەتـە نـاو دڵـی ئیمانداران). جێگای هۆگری وخۆشەویستییە: ﴿وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي

ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ﴾ {الانفال: ٦٣}، واتە: (هۆگری خستە نێوان دڵەکانیان، ئەگەر هەرچی لەزەویدا هەیە بتبەخشیایە هۆگریت نەدەخستە نێوان دڵەکانیانەوە).

ئایەتەکان زۆرن سەبارەت بەپێرەکانی خەڵکی کەگیرۆدەی نەخۆشییەکانی دڵن: ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ ٢٩﴾ {محمد: ٢٩}، واتە: (ئایا ئەوانەی کەدڵیان نەخۆشە وا دەزانن کەخوا هەرگیز ڕق و کینەیان دەرناخات و ئاشکرای ناکات). لەڕاستیدا ئەوانە مونافیقەکانن: ﴿يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ﴾ {التوبة: ٦٤}، واتە: (دووڕووەکان مەترسی ئەوەیان هەیە کە دەربارەیان سورەتێک بنێررێتە خوارەوە کە ئەوەی لەدڵیاندایە بیخاتە ڕوو). ئەوانە: ﴿يَقُولُونَ بِأَلۡسِنَتِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ﴾ {الفتح: ١١}، واتە: (بەزمانیان شتیک دەڵێن کە لەدڵیاندا وا نییە). یاخود: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ﴾ {المائدة: ٤١}، واتە: (ئەوانەی بەدەم ئەڵێن بڕوامان هێناوە کەچی دڵەکانیان بڕوای نەهێناوە).



**پێنجەم: ئامرازەکانی تەزکییە:**

پێشتر ئاماژەمان بەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆزدا کەباسی تەزکییەی دەروون و تەزکییەی هەست و تەزکییەی ماڵ وسامان و تەزکییەی تاک و تەزکییەی ئومەت دەکەن و لەوە دڵنیابووین کەمرۆڤ داوای لێکراوە تەزکییەی رۆحی بکات هەتا سەرفراز بێت: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤﴾{الاعلى: ١٤}، واتە: (سەرفرازە ئەو کەسەی دەروونی خۆی پاک دەکاتەوە). ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩﴾{الشمس: ٩}، واتە: (سەرفرازە ئەو کەسەی دەروونی پاک کردووەتەوە). لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە بڕیاری ئەوەیداوە کە تەزکییە لەفەزڵ و ڕەحمەتی خواوەیەو بەوانەی دەبەخشێ کە دەیەوێت و لەوانەی ڕێگای پەروەردگاریان گرتووەتە بەر و خۆیان بەدوور گرتووە لەهەنگاوەکانی شەیتان و دڵسۆزانە داوای فەزڵ و ڕحمەتیان کردووە: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٢١﴾ {النور: ٢١}، واتە: (ئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە هەرگیز کەسێک لەئێوە پوخت وپاک نەدەبووەوە، بەڵام خوا هەرکەسی بوێت (شیاو بێت) پاکی دەکاتەوەو خوا بیسەری زانایە).

باشە دەبێت تەزکییەی دەروون چۆن بێت، ئەو ئامرازانەی کەدەکرێت لەتەزکییەدا بەکار بێن چیین؟

زانایانی تەزکییەو تەسەووف زاراوەی تایبەت بۆ گوزارشتکردن لەئامرازەکانی تەزکییە بەکار دەهێنن، لەوانە: دەستەبەرداری و خۆڕازاندنەوە (التخلية والتحلية)، ئەم دوو دەربڕینە لەزاراوەکانی سۆفیەکانەو چوارچێوەیەکی گشتی ئامرازەکانی تەزکییە دەنوێنێت، لەڕاستیدا تەزکییە بەواتای پاککردنەوەو بێخەوشکردن [1]، بەمانای وازهێنان لەهەموو سیفەتە بێزراوەکان کە خوای گەورە ناپەسەندی کردوون و نەهی کردووە لێیان، ئەم سیفەتانەش زۆرە،

---

[1] زاراوەکە لای ئەو حامدی غەزالی: بریتییە لەتەزکییە و وازلێهێنان، تەزکییەش لای ئەو ئەوەیە کەجگە لەو ناویانناوە وازلێهێنان (التخلية)، کاتێ باسی: " ڕەوشتی ناپەسەند پێویستی بەتەزکییە هەیە لێی و، ڕەوشتی پەسەندیش پێویستی بەڕازاندنەوە هەیە پێی" بڕوانە: الغزالي، الاربعين في أصول الدين، سەرچاوەی پێشوو، ص١٣.

لەوانەیە گرنگترینیان سوو (ڕیبا)و سەرسامبوون بەخۆ و خۆبەزلزانی و لەخۆبایبوون و ئیرەیی بێت. باسکردنی ئەم سیفەتانەش لەکتێبی "الرعایة لحقوق الله"دا کراوە کەدانراوی (حارث المحاسبي)یەو نیوەی کتێبەکەی بۆ تەرخان کردووە (٣٨٦ لاپەڕە لەکۆی ٦٣٠ لاپەڕە) [١]. دەستبەرداربوونیش بەو مانایە نییە کەمرۆڤ بەتاڵ ببێتەوە، بەڵکو بەمانای ئامادەسازییەتی بۆ ئەوەی بەسیفەتە پەسەندکراوەکان پڕ ببێتەوە، کەخوای گەورە ڕازاندویەتیەوەو فەرمانی  کردووە بەئەنجامدانیان، ئەم سیفەتانەش زۆرن، گرنگترینیان هەستانە بەئەنجامدانی فەرز و سوننەتەکان، قورئانی پیرۆزیش بەڵێنی داوە کەبەخوێندنەوەو بیرکردنەوەو ڕامان و خۆڕازاندنەوە بەتەقواو زۆر یادکردنەوەی خوای گەورە، واتە ئامادەبوونی خوای باڵادەست لەدڵی مرۆڤدا و بێئاگانەبوون لێی و لێپێچینەوە لەنەفس و بیرکردنەوە لەمردن و جگە لەوانە. لێرەدا ژمارەیەک لەهۆکارە گشتییەکان دەخەینە ڕوو کەهەریەکەیان زۆرێک لەدەروازەکانی دەستبەرداربوون و خۆڕازاندنەوەی تێدا کۆبووەتەوەو لە ئەنجامدانیدا زۆرێک لەئامرازە ناسەرەکییەکان لەخۆ دەگرێت.

### ١- قورئانی پیرۆز:

هیچ قسەیەک لەوە جوانتر نییە کەقورئان لەبارەی خۆیەوە بدوێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢﴾ {البقرة: ٢}، واتە: (ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تێدا نییە (کە لەلایەن خوداوە نێردراوە) ڕێنیشاندەری پارێزکارو لەخواترسانە)، هەر ئەویش: ﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ۝١﴾ {هود: ١}، واتە: (بە (ئەلیف، لام، ڕا) دەخوێنرێتەوەو خوا زاناترە بەواتاکەی، ئەمە کتێبێکی پتەو و داڕێژراوە ئایەتەکانی، پاشان لەلایەن کار دروستی زاناوە ڕوون کراوەتەوە)، تێیدا هاتووە: ﴿ٱلۡحَقُّ وَمَوۡعِظَةٞ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ {هود: ١٢٠}، واتە: (حەق و ئامۆژگاری و پەندیشی تیایە بۆ

[١] المحاسبي، أبو عبدالله الحارث بن أسد. الرعاية لحقوق الله. تحقيق: عبدالقادر أحمد عطا، القاهرة: دار الكتب الحديثة، ط ٣، ١٩٧٠م.

بڕواداران)، ڕینمـوونی دەکـات بـۆ لای ڕاسـتترین ڕێبـازو بەرنامـە: ﴿إِنَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾﴾ {الاسـراء: ٩}، واتـە: (بەڕاسـتی ئـەم قورئانـە ڕێنمـوونی دەکـات بـۆ ڕێبـازو بەرنامەیـەک کەڕاسـتترینەو مـوژدەش دەدات بـەو باوەڕدارانـەی کـەکردەوە چاکەکان دەکەن کە بەڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە). ئەگەر پەیڕەوانی پەڕاوە ئاسمانییەکانی پێشوو گۆڕانکاری و لادانیان تیدا کردبێت و زۆرێک لـەو حوکمانەی لـەو کتێبانـەدا دانراوە شـاردویانەتەوە، لەبـەر ئـەوە ئـەم کتێبـە ئـەوە ئاشـکرا دەکـات و بەرنامـەو ڕێبـازی کۆتـایی پێشـکەش دەکـات کـەگۆڕانی تیـا نەکراوە و هێندە ڕۆشنایی و ڕێنوێنی تێدایە کە لەگەڵ ئەمـەدا پێویسـت بـەهیچ پەڕاوێک لەپەڕاوە دێرینەکان نـەکات: ﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَـٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَـٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾﴾ {المائدة: ١٥-١٦}، واتە: (ئـەی خـاوەن پەڕاوەکان بێگومان نێردراومان هـاتووە بـۆ ئێوە تـا زۆر لـەوەی کـەئێوە دەتـان شـاردەوە لەپەڕاوەکـەتان (تـەورات وئینجیـل) ڕوونـی دەکاتـەوە بۆتـان و چاوپۆشی دەکات لەزۆرێک لەوانە و بێگومـان ڕووناکییـەکی گـەورەو نامەیـەکی ڕوون کەرەوەیـە لەلایـەن خـواوە بۆتـان هـاتووە، خـوا ڕێنـوێنی کەسـێکی پـێ دەکـات کەشـوێن ڕازامەنـدی ئـەو بکـەوێت بـۆ ڕێگاکـانی ئـارامی وئاشـتی ولەتاریکیەکانەوە (بێباوەڕی) دەریان دەهێنێت بۆ ناو ڕووناکی (ئیمان وئیسلام) بەفەرمانی خۆی و ڕێنموونیان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست).

لەبـەر ئـەوە هـیچ تەزکییەیـەک نییـە کەبـەقورئان دەسـت پـێ نـەکات و بەگەیشتنی بەو کۆتایی نەیەت، هیچ تەزکییەیەک نییە بەدەروونی مرۆڤ دەست پـێ نـەکات و هەربـەویش کۆتـایی نەیـەت، بۆیـە تەزکییـەی دەروون بووەتـە چـەترێکی گشـتی بـۆ هـەموو شـێوەکانی تەزکییـە. بـۆ نەفسـیش لـەزاراوەی قورئانیدا باسی پێویست و درێژ هەیە کەبابـەتی سروشتی نـەفس بەجەسـتەو عـەقڵ و ڕۆحـەوە دەگرێتـەوە، حاڵەتـەکانی نـەفس: دڵنیـابووەوە (المطمئنـة) و سەرکۆنەکار (اللوامة)و فەرمانکار بەخراپە (الامارة بالسوء) و نهێنیەکانی نـەفس

و نەخۆشـییەکانی نـەفس و... هتـد، خوێنــەر دەتوانێـت درێـژەی ئـەم باسـانە لەسـەرچاوە تایبەتــەکانی ئـەو بابەتانـەدا بدۆزێتــەوە. هێنـدە بەسـە کـەبڵێین خوێندنـەوەو وردبوونـەوە لـەقورئان و وەرگرتنـی ڕێنموونییـەکانی بناغەیـە بـۆ هــەموو جۆرەکـانی تەزکییـە، چونکـە تەزکییـەی زمـانی تێدایـە: بـەهێزکردنی دەربڕینــەکانی زمــان و باشــترکردنی شــێوازەکانی خســتنە ڕوو هــەروەها تەزکییـەی دڵیشـی تێدایـە: بەوشـێوەیەی دڵ ئـارام بکاتـەوەو تەزکییـەی مـاڵ وسامانیشـی تێدایـە: پاکژکردنـەوەی نـەفس لـەڕژدی و بەدەسـتهێنانی فـەڕو بەرەکـەت لـەماڵ وسـاماندا و چەنـد هێنـدە زیـادکردنی. لەبـەر ئـەوە هەرکـەس تەزکییـەی ویسـت پێویسـتە لەسـایەی قورئانـدا بـژی و ڕەحمـەتی خـوا لـەو کەسـەی کەلەسـایەی قورئانـدا ژیـاوەو هەنـدێک یـادو بەسـەرهاتی بـۆ تۆمـار کـردووین سـەبارەت بـەژیان لەسـایەی قورئانـدا و ئـەوەی ڕوون کردووەتـەوە کەئەوە نیعمەتێکە تەمەن درێژ و بەرەکەتدارو پاکژ دەکاتەوە:

"ژیـان لەسـایەی قورئانـدا نیعمەتـە، نیعمـەتێک تـەنها ئـەو کەسـە ئاشـنایەتی کە تێیدا ژیا بێت. نیعمەتێک تەمەن بەرزو بەرەکەتدارو پاکژ دەکاتـەوە. سـوپاس بـۆ خـوا.. سـۆزی بەسـەردا رژانـدم بـەژیان لەسـایەی قورئانـدا بـۆ ماوەیـەک، بەڕاسـتی نیعمــەتێکم تێـدا چەشـت کـە لــەوە خۆشـترم لەژیانـدا، هــەرگیز نەچەشتووە. تێیدا ئەو نیعمەتەم چەشت کەتەمەن بەرز دەکاتەوەو بەرەکەتدارو پاکی دەکاتەوە".

"لەگـەل ژنـەوتنی خـوای گـەورە ژیـام کەبـەم قورئانـە دەدوا بـۆم.. مـن بەندەیەکی کەمی بچووک.. چ ڕێزیکە بـۆ مرۆڤ ئـەم ڕێزەی خـوای باڵادەست لێی گرتووە؟ چ بڵندیەکە بۆ تەمەن بەهۆی ئـەم قورئانـەوە؟ چ پایەیـەکی بـەرێزە کەبەدیهێنەری بەرزی بەمرۆڤی دەبەخشێت؟ {...} - لەسایەی قورئاندا- ژیام و هەستم بەپێکەوە گونجانی جوانیی نێوان جووڵـەی مرۆڤ کرد بـەو شـێوەیەی کـەخوای گـەورە دەیـەوێت و جووڵــەی ئــەم گەردوونــەش کەبــەدیهێنراوی پەروەردگارە...".

" ـلەسـایەی قورئـان- ژیـام و بـوونم زۆر لـەرووکاری بینـراوی گـەورەتر بینـی... گـەورەتر لەحەقیقەتەکـەی و گـەورەتر لـەفرەیی لایەنـەکانی... بەڕاسـتی جیهانی پەنهان و ئاشکراکانە جگە لەو کـەس زانـا نییە ئاشـکراکان. ئـەو دونیـاو

قیامەتە، نەک تەنها ئەم دونیایە {...} بەجۆرێ کەئەم قۆناغەی کە لەسەر ئەم هەسارەیە دەیگوزەرێنێت تەنها گەشتێکە لەگەردوونێکی زیندووی هۆگر بووەوە، چ متمانەیەکە بەسەر دڵیدا دەبارێنێ ئەم تێڕوانینە گشتگیرە تەواوە پاراوە ڕاستە؟ {...} ژیام —لەسایەی قورئان- مرۆڤم بینی زۆر ڕێزدارتر لەو ڕێزەی کەمرۆڤایەتی ئاشنای بووە لەوەو پێش بۆ مرۆڤ و دواتریش ئاشنای دەبێت.. بەڕاستی ئەمە مرۆڤە بەفوویەک لەرۆحی خودا {...} ئەو هەر بەو فووە بووە جێنشین لەسەر زەوی {...}هەموو ئەوەی لەسەر زەویدا ڕام کراوە بۆی {...} لەبەرئەوەی مرۆڤ بەم ڕادە ڕێزو بەرزیەوە خوای گەورە وایکردووە کەئەو تاڵە دەزووەی کەمرۆڤایەتی لەسەری کۆکە بریتی بێت لەو دەزووەی کە لەفووی پەروەردگارەوە وەرگیراوە. کردوویەتییە دەزووی عەقیدەی خواپەرستی...".

"پاشان ژیام —لەسایەی قورئان- دڵئارام و دڵنیا، ویژدان ئاسوودە.. ژیام و لەهەموو ڕووداو و کارێکدا خودام دەبیینی. ژیام لەسێبەرو و چاودێری خوا. ژیام و هەستم بە ئەرێنی سیفەتەکانی پەروەردگاری باڵاو کارابوونیان دەکرد {...} مرۆڤ خۆی ئەو بوونەوەرەیە، بەفیترەت وئارەزوو ئامادەسازیەکانییەوە. تا ئەوپەڕی پلەکانی تەواوەمەندی بۆدانراو بەگوێرەی پێکهاتە و ئەرکەکەی بەرنامەی خوایی دەگرێتە دەستی و بەرز ببێتەوەو ڕێز لەخودی خۆیی و فیترەتەکەی و تواناکانی، کەلەسەر ڕێگای تەواوەمەندی بەرزبووەوە بۆ لای خوا دەیبات بگرێت {...} حەقیش لەبەرنامەی خوادا لەبونیاتنانی ئەم بوونەدا ڕەسەنە. تەنها فەڵتەیەکی ڕاگوزەر، یا ڕێکەوتێکی بێ مەبەست نییە.. لەڕاستیدا خوای گەورە حەقەو لەبوونی زاتی ئەوەوە هەموو بوونەکانی بوونیان وەردەگرن {...} چاکەو خێر و باشە وەک حەق ڕەسەنن، تا زەوی بمێنێت ئەوانیش دەمێنن...".

"چ دڵئارام کەرەوەیەکە ئەم تێڕوانینە؟ چ هێمنایەتی بەخشێکە بەسەر دڵیدا دەبارێنێ؟ چ متمانەیەکە بەحەق و خێرو چاکەویستی؟ چ هێزو بەرزییەکە بەسەر واقیعی بچووکدا کە لەویژداندا دەیچەسپێنێت؟...".[1]

---

[1] قطب، سيد. في ظلال القران. القاهرة: دار الشروق، ج١، ص١٠-١٨ (پێشەکی نووسەر).

## ٢- ویردو بیرکردنەوە (الذکر والفکر):

مەبەست لەویرد لێرەدا: ویردی خوای گەورەبە لەناو و سیفەتەکانی و بیرکردنەوەو وردبوونەوە لەئایەتەکانی. ئایەتەکانیشی دوو جۆرن: ئەوەی کەلەقورئاندا وشەیە و دەخوێندرێتەوەو ئەوەشیان کە لەگەردووندایە لەدروستکراوەکان و دەبینرێت. بناغەی ویردی خوای گەورە بریتییە لەبوونی خوا لەدڵی مرۆڤی باوەڕداردا لەهەر خورپەیەکدا کە بێت بەبیرو دڵیدا و لەهەموو کارێکدا کەبەشەکانی جەستەی ئەنجامی بدات، لەم فەرمایشتەی خوای گەورەشدا ویرد بەراورد کراوە بەتەزکییە: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ١٥﴾ {الاعلی: ١٤-١٥}، واتە: (بەڕاستی سەرفراز بوو ئەوەی کەخۆی پاک ڕاگرت، ناوی پەروەردگاری خۆی دەبات و کەوتە نوێژکردن (پاڕانەوە)). بەم ویردەو ئەو ئامادەسازییە مرۆڤ لەپلەکانی تەزکییەدا بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە پلەی (الاحسان): "أن تعبد الله كأنك تراه، فإن لم تكن تراه فهو يراك"، واتە: بەجۆرێک خوا بپەرستی وەک ئەوەی ببیبنیت، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت، ئەوا ئەو تۆ دەبینێت"[1]. نەوەوی لەڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: "ئەگەر وامان دانا کەیەکێکمان هەستا بەپەرستش و پەروەردگاری باڵادەستی خۆی دەبینی، ئەوەی لەتوانایدا بێت لەملکەچی و خشوع و جوان ڕاوەستان و ڕێکوپێکی ڕووکارو ناوەوەی لەسەر گرنگیدان بەباش ئەنجامدانی بەجوانترین شێوەی کە بکرێت، ئەوە بەوجۆرە ئەنجامی دەدات...

کەسانی حەقویست لەسەر دانیشتن لەگەڵ پیاوچاکان ڕاهاتوون، تا ئەوە ببێتە ڕێگر لەوەی هیچ ناتەواویەکیان تووش ببێت، وەک ڕێزو شەرم لێیان، ئەی دەبێت کەسێک خوای گەورە ئاگاداری بێت لەنهێنی و ئاشکرادا چۆن بێت؟!"[2].

لەزۆرێک لەو جێگایانەی کە ویردی لەقورئاندا تێدا هاتووە لەگەڵیدا داواکاری زۆر ویرد کردن هاتووە: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ كَثِيرٗا وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ٤١﴾

---

[1] الامام مسلم. صحیح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، کتاب الایمان بیان الاسلام والایمان والاحسان، حدیث رقم ٨، ص٣٦.

[2] النووي، أبو زكريا يحي بن شرف. شرح النووي على مسلم. دمشق: دار الخير. ١٩٩٦م، ج١، حديث رقم ٨، ص٣٦.

{ال عمران: ٤١}، واتە: (زۆر یادی پەروەردگارت بکە و تەسبیحاتی خوا بکە بەئێواران وبەیانیان). ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾﴾ {الاحزاب: ٣٥}، واتە: (پیاوانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن و ئافرەتانێ کەزۆر یادی خوا دەکەن، خوالێخۆشبوون وپاداشتی گەورەی ئامادە کردووە بۆیان)، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾﴾ { الاحزاب: ٤١}، واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە زۆر یادی خوا بکەن)...هتد. ئەمانە دەری دەخەن کەیادی خوا تەنها وتنی (سبحان الله و الحمد لله و لااله الا الله)و حاڵەت و هەڵوێستی دیاریکراو نییە، بەڵکوو بریتییە لەئامادەبوونی بەردەوام لەعەقڵ و دڵدا، بەهیچ شێوەیەک نائامادە نابێت و چاودێری هەستەکانە لەهەموو ئەوەی بەخەیاڵدا بێت و لێپێچینەوە لەدەروون دەکات لەسەر ئەوەی دەیکات و ئەوەی نایکات. ئیبن قەیمی جەوزی دەڵێت: "لێپرسینەوە لەنەفس هەتا بزانرێت چی هەیە و چی لەسەرە و لێنەگەڕێت لەمافەکاندا بێت وبچێت و ونی بکات وفەرامۆشی بکات. بەهەمان شێوە زەکات و پاکبوونەوەی لەسەر لێپێچینەوەی وەستاوە، هەربۆیە پاک وبێگەرد نابێتەوەو هەرگیز باش نا بێت بەبێ لێپێچینەوە. حەسەن (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: سوێند بەخوای گەورە باوەڕدار هەموو کاتێ چاودێرە بەسەر نەفسی خۆیەوە: مەبەستم لەو وشەیە چی بوو؟ مەبەستم لەو خواردنە چی بوو؟ مەبەستم لەو چوون و لەو هاتنە چی بوو؟ مەبەستم لەوە چییە؟ چیمداوە لەوە؟ سوێند بەخوا ناگەڕێمەوە بۆ ئەوە! هاوشێوەی ئەم قسانە. بەلێپرسینەوە لێی ئاگاداری نەنگی و ناتەواویەکانی دەبێت و دەتوانێت هەوڵی چاککردنیان بدات" [1].

لەکاتێکدا عیلمی خوای گەورە هەموو شتێکی گرتبێتەوە: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾﴾ {الطلاق: ١٢}، واتە: (بێگومان خوای گەورە (بەزانست و زانیاری) دەوری هەموو شتێکی داوە (واتە ئاگاداری هەموو بوونەوەرە))، هەروەها خوای گەورە لەگەڵ مرۆڤدایە لەهەرکوێ بێت: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ

---

[1] ابن قيم الجوزية، محمد بن أبي بكر. مدراج السالكين بين منازل إياك تعبد وإياك نستعين. بيروت: دار الكتاب اللبناني، ط٢، ص٥١٠-٥١١.

﴿وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٤﴾ {الحديد: ٤}، واته: (دەزانێت چی دەچێتە ناو زەوی و چی لێ دێتە دەرەوەو چی لەئاسمانەوە دێتە خوارو چی بۆ سەردەکەوێ، لەهەرکوێ بن خوا لەگەڵتانەو بینایە بەهەرچی کەدەیکەن)، خوای گەورە هەموو کردەوەکانی مرۆڤ لەکتێبێکدا تۆمار دەکات: ﴿هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٢٩﴾ {الجاثية: ٢٩}، واتە: (ئەمە پەڕاوەکەمانە، بەڕاستی لەبارەتانەوە دەدوێ، بەڕاستی ئێمە ئەوەی ئێوە دەتانکرد وەک خۆی نوسیومانەتەوە).

ئاساییە کەمرۆڤ لەهەموو حاڵەتەکانیدا پارێزکار بێت و شەرم لەخوا بکات و سوپاسگوزاری بێت لەسەر چاکەو نیعمەتەکانی و ملکەچی فەرمانەکانی بێت و خۆی لابدات لەسەرپێچیکردنی و هەموو ئەمانە بەهۆی خۆشەویستنیەوە ئەنجام دەدات و خوازیاری خۆشەویستیەتی، ئائەمەیە (احسان): "بەجۆرێک خوا بپەرستیت وەک ئەوەی ببینیت"، ئەگەر مرۆڤ گەیشتە ئەم پلەو پێگەیە، ئەوا شایستەی خۆشەویستی خوایە: ﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٤٨﴾ {ال عمران: ١٤٨}، واتە: (بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە پاداشتی دونیاو پاداشتی چاک و شیرینی ڕۆژی دوایی پێ بەخشین، خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت).

کارەکە قورس نییەو ئەرکەکە لەتوانا بەدەر نییە، بەڵکو بەدیهێنانی واتای بەندایەتییە بۆ خوای گەورە: " خوا وا بپەرستیت وەک ئەوەی کەببینیت". پەرستشیش بریتییە لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیانی لەلایەن مرۆڤەوە بەشێوەیەکی ڕەوا کەخوای گەورە پێی ڕازی بێت، چونکە ئەو پەرستشانەی فەرز کراون لەسەری وەک نوێژو ڕۆژوو حەج و خواردن و خواردنەوەو جل پۆشین و ئەو چێژە ڕێگەپێدراو (مباح)انەی ئەنجامیان دەدات و ئەو کارو پیشانەی دەیکات و پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکیدا، هەموو ئەوانە دەبنە پەرستش ئەگەر لەپێناوی خوای گەورە و نیەتی لەئەنجامدانی گوێڕایەڵی خوا بێت و بەشێوەیەکی ڕەوا ئەنجامی بدات. ئەمەش لەسەرەتای کارەکەدا تێکۆشانێکی دەروونی و سەرکزکردنی پێویستە، پاشان ئەم ڕەفتارە دەبێتە

خویــەکی خۆشویســتراو و سروشــتی و ئاســان، کــە لــەتوانادا بێــت و چێــژی هــەبێت، کــە هــیچ خۆنوانــدن و زۆر لــەخۆکردن و ناڕەحــەتی ئـازاری لەگەڵـدا نەبێت.

لەڕاستیدا تێبینی پەیوەندی نیوان سەرفرازی (الفلاح) و تەزکییەو یادی خواو نوێژمان لەم فەرمایشتەدا کردووە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾ {الاعلی: ١٤-١٥}، واتە: (بەڕاستی سەرفراز بوو ئەوەی کەخۆی پاک ڕاگرت، ناوی پەروەردگاری خۆی دەبات و کەوتە نوێژکردن (پاڕانەوە)). لەبەر ئەوە باشترین حاڵەتەکانی یادی خوا بریتییە لەنوێژ کەفەرزە، چونکە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیە لەگەڵ خوای گەورە، بەبێ ناوەندگیر. خوای گەورەش نوێژی بۆ ئەوە داناوە تا مرۆڤ لەگوناهـ و خراپەکاری دوور بکەویتەوەو وازی لێ بهێنێت: ﴿ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ﴾ {العنکبوت: ٤٥}، واتە: (ئەو کتێبە (قورئانە) بخوێنەرەوە کەبەوەحی بۆت نێردراوەو نوێژ بکە، بێگومان نوێژ ڕێگری دەکات لەکاری ناشیرین و ناپەسەند و یادی خوا گەورەترە). بۆ ئەوەی یادی خوای گەورە وەک مەبەستی مەزن و هەرە گەورە ئەنجام بدرێت، یادی خوا هاوشانی هەموو کردارەکانی نوێژو جووڵەکانیەتی، چونکە خوێندنەوەی قورئان پاش (اللە اکبر)ی دەستپێکردنی نویژ یادی خوایەو (سبحان اللە)ی کاتی چەمانەوەو کڕنووش زکری خوایەو (الحمد للە) و(بەرزڕاگرتن) لەکاتی هەستانەوە لەچەمانەوە یادی خوایەو تەحیات لەکاتی دانیشتندا زیکرە. بەڵام ئەگەر باوەڕدار لەپاڵ نوێژە فەرزەکەدا وەک سوننەت شەو نوێژی کردو لەو نوێژەدا قورئانی خوێند، ئەوە ئەو شوێنە پەسەندەیە کەبەندە پێی دەگات و بەهۆیانەوە بەپلەکانی تەزکییەدا بەرز دەبێتەوە: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾﴾ {الاسراء: ٧٨-٧٩}، واتە: (نوێژ بەجێ بهێنە (ئەی موحەمەد) لەکاتی لادانی خۆر (لەناوەڕاستی ئاسمان) هەتا (هاتنی) تاریکی شەو هەروەها نوێژی بەیانی (بەجێ بێنە)، بەڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی هەمیشە دەبینرێت، لەبەشێکی شەویشدا (ئەی موحەمەد) هەستە شەونوێژ بکە بەقورئان خوێندن تێیدا، ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بەتۆیە، ئومێدەواربە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەندکراو)، لەوانەیە ئەو پلەو پایە

پەسـەندكراوە لـەم فـەرموودە قودسـیەی پێغەمبـەردا (درودی خـوای لەسـەر بـێ) ڕوون ببێتـەوە: لەئـەبو هـورەیرەوە (خـوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبـەری خـوا دەفەرمووێت: :إن الله تعالی قال: من عادى لي وليا اذنته بالحرب، وما تقرب إلي عبدي بشيء أحب إلي مما افترضته عليه، ولايزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى احبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر فيه، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، ولئن سألني لأعطيتنه، ولئن استعاذني لأعيذنه" [1]، واتە: (خوای گەورە فەرموویەتی: هەركـەس دوژمنایـەتی دۆسـت و (ولی)یـەكی من بكات، ئەوە جـەنگ لـەدژی بـەرپا دەكـەم، بەندەی مـن بـەهیچ شـتێك لـێم نزیك نابێتـەوە بـەڕادەی ئـەو شـتانەی لەسـەرم فـەرز كـردووە، هـەروەها بەبـەردەوام جێبـەجێكردنی سـونەتەكانیش لـێم نزیـك دەبێتـەوە، تـا وای لێدێت خۆشـم دەوێت، كەخۆشم ویست (كاریگەری خۆشویستیەكە لەهەموو ئەندامانیدا بەدیار دەكەوێت)، ئەو گوێیەی پێی دەبیستێت و ئەو چاوەی پێی دەبینێت و ئـەو دەسـتەی كـاری پـێ دەكـات و ئـەو پێیـەی پێی دەڕوات، ئەگـەر دوعـا بكـات و داوای شـتێكم لـێ بكـات، بەدڵنیایی پێی دەبەخشم، ئەگەر پەنا بگرێ پێم، پەنای دەدەم).

لەبـەر ئـەوە خۆشـەویسـتی خـوا بـۆ ئـەو بەنـدەی كەبـەهۆی ئەنجامـدانی سونەتەكانەوە لەپەروەردگاری نزیك دەبێتـەوە پایەیـەكی ستایشكراوەو خـوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا پێی دەدات، ئەمـە چ تەزكییەیـەكی گـەورە و مەزنـەو چ هۆكـارێكی نزكیبوونـەوە لـەیادی خـواو نزكیبوونـەوە لێـی لـەوە گـەورەترو مـەزنترە؟! بـەڵام لـەدونیادا، ئـەوەی بـاوەڕداران بـۆی تێدەكۆشـن بریتییـە لەسەقامگیری دڵیان و دڵئاراميیان و دڵنیاییان لەڕەزامەندی خوای گـەورەو ئـەو هۆكارەی كـە دەبێتـە هـۆی بـەدیهێنانی ئـەم مەبەسـتە و بەهۆیـەوە دەگاتـە ئـەو پایەیە  بریتییە لەیادی خوای گـەورە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ {الرعد:٢٨}، واتـە: (ئەوانـەی كـەبڕوایان هێنـاوە و دڵیـان بـەیادی خـوا ئـارام دەبێت، ئاگاداربن كەهـەر بـەیادی خـوا دڵـەكان ئـارام دەگرن).

---

[1] البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، كتاب الرقاق، باب التواضع، حديث رقم ٦٥٠٢، ص ١٦١٧.

## ٣- هاوڕێیەتی پیاوچاکان:

یـــەکێک لـــەهۆکارەکانی تەزکییـــە مـــرۆڤ تێکـــەڵاوی پیاوچـــاک بکـــات و لـەپارێزکاران نزیک بێت و بـەهاوەڵیکردنیان گوێڕایـەڵ بێت و ژیـانێکی چاکی زانستی و کار لەگەڵیاندا بژی و لەسـەر حـەق دامـەزراو و ئارامگر بێت لەسـەر ناڕەحـەتی و فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگری لەخراپە و جگە لەچاکە هیچیان لێ نابیستێت، چونکە زمانیان لەقسـەی نابەجێ و درۆو غەیبەت پاک بۆتەوەو تـەنها قســەی ڕاســت و حــەق دەکــەن، لەگــەڵ ئەوەشـدا کاروکردەوەیـان ڕوونتـرە لەقسـەکانیان. بـە بینینیـان خـوای گـەورە دەکەوێتـەوە یـاد و نزیکبوونـەوە لێیان لەسەرپێچی دوور دەخاتەوە. بەڕاستی ئەوان پێشـەنگن لەو کردارانـەی ئـەنجامی دەدەن و ئامۆژگاریکـــارن لـــەوەی کـــەدەیڵێن و تازەپێگەیشـــتوانیش زیـــاتر هاوشێوەی خەڵکی دەوروبەریانن لە گوفتارو ڕەفتاردا.

بەڕاستی سیفەتی یەکەمی باشترین ئومەت کە هاتبێت، پێش سیفەتی ئیمـان، بریتییـە لـەئامۆژگاریکردنی یـەکتر لـەنێوان خۆیانـدا و فـەرمان بەیـەککردن بـۆ کاری چاک و ڕێگری لەکاری خراپ: ﴿كُنـتُمۡ خَـيۡرَ أُمَّـةٍ أُخۡرِجَـتۡ لِلنَّـاسِ تَـأۡمُرُونَ بِـٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَـوۡنَ عَـنِ ٱلۡمُنكَـرِ وَتُؤۡمِنُـونَ بِـٱللَّهِۗ﴾ {ال عمـران: ١١٠}، واتـە: (ئێـوە باشـترین ئومــەت بـوون بـۆ خـەڵکی هێنرابێتـە دی، فـەرمان دەدەن بەچاکـەو جڵەوگیری دەکەن لەخراپەو باوەڕ دەهێنن بەخوا).

بەسیفەتی ئیمـان بـاوڕدارانی پیـاوو ئـافرەت لەحاڵـەتی پشـتیوانی یـەکتردان، هەنـــدێکیان پشـــتیوان ویارمەتیـــدەری هەنـــدێکی تریـــانن: بەسەرخســـتن و ئامۆژگـاریکردن و یارمەتیـدان، لەڕێگـەی فـەرمان کـردن بەچاکـە و جڵـەوگیری لەخراپـە، کاروباریـان کۆیـە لەئەنجامـدانی نـوێژو زەکاتـدان و گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبەرەکـەی، بـەوەش سـۆز و بـەزەیی خـوای گـەورە بـۆ کۆمەڵەکـەیان دێتـە دی:

﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَـنِ ٱلۡمُنكَـرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِـكَ سَـيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ﴾ {التوبـة: ٧١}، واتـە: (پیـاوان وئافرەتـانی بـاوەڕدار هەنـدێکیان پشـتیوان و یارمەتیـدەر و خۆشەویسـتی هەنـدێکی تریـانن، فـەرمان دەکـەن بەچاکـە و جڵـەوگیری دەکـەن

لەخراپــە، بــەڕێکوپێکی نــوێژ دەکــەن و زەکــات دەدەن و گوێڕایــەڵی خــواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەوانە لە داهاتوودا خوا ڕەحمیان پێ دەکات).

لەگەڵ ئەوەی ئومەتی ئیسلامی بەتێکڕای ئومەتێکە فەرمان دەکات بەچاکە و جڵـەوگیـری دەکـات لەخراپـە، لەهــەمان کاتـدا خـوای گـەورە فـەرزی کـردووە کەلەنێو تاکەکانی ئەم ئومەتەدا "کۆمەڵێک" تایبەتمەند دەکات کەئەرکی فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەکە بگرنە ئەستۆ: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ {ال عمران: ١٠٤}، واتە: (دەبێت لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێک ببێت بانگەواز بکەن بۆ چاکەو فەرماندەن بەهــەموو چاکەیــەک و ڕێگـری بکـەن لەهــەموو خراپەیــەک، ئەوانــە خۆیــانن سەرکەوتوو سەرفرازن).

لەڕاسـتیدا پەیوەسـتبوونی بـاوەڕدار بەئومـەتی ئیمانـەوە، بەبەڕاسـتزانین و تـەواوی دڵنیاییـەوە لەعـەقڵ و دڵـدا و کـارکردن پێـی لـەکارو ڕەفتـاردا، بـەژیان لەگـەڵ بـڕواداردا پتـەو دەکـات و کـە وەلائـی هــەبێت بۆیـان و پــەنایان بـۆ ببـات، هۆکارەکـانی بەلاڕێـدا چـوونیش خـۆی لـە هـەواو ئـارەزوو وسوەسـەی خراپەکاران لەشەیتانەکانی مرۆڤ وجنۆکەو دوعـای خـراپ دەبینێتـەوە، لەگـەڵ کۆمەڵ بووندا ڕەحمەتە و پەرتەوازەیش نارەحەتییە، وەک وتراوە گورگ مەڕی دابڕاو دەخـوات. هـەرکاتێ ئاشـووب بڵاوبوویـەوەو بەلاڕێـدا چـوون بـووە بـاو بـاوەڕدار پێویسـتی بەکۆمــەڵ هەیـە کـەخۆی لـەڕێگای باوەڕدارانـدا دەنوێنێـت، پەیوەست دەبێت پێیانەوە، وەلائی دەبێت بۆیـان و بەهۆیانـەوە پارێزکـار دەبێـت و بەهێزی دەکات. هەرکەسیش لەپەیوەسـتی بـەباوەڕدارانی ڕێنمونیکراو لایداو بـووە پاڵپشـتی سەرلێشـێواوانی نـەیاری خـواو پێغەمبەرەکـەی، بەدڵنیاییـەوە سەرئەنجامی دۆزەخ و پاشـەڕۆژی ڕەش دەبێـت: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥﴾ {النسـاء: ١١٥}، واتـە: (هەرکەسـێک دژایـەتی پێغەمبـەر بکـات پـاش ئـەوەی کـەڕێبازی ڕاسـتی بـۆ ڕوون بوویـەوە و شـوێن ڕێگایـەکی تـر بکـەوێت بێجگـە لـەڕێگای بڕواداران ڕووی وەردەگێڕین بۆ ئـەو ڕێبازەی کۆمـەڵی بژاردووەو دەیخەینـە دۆزەخ، ئـای چ پاشـەڕۆژێکی خراپـە). لەگـەل ئـەوەی خـوای گـەورە

مرۆڤـی ڕاسـپاردووه بـەچاکبوون لەگـەڵ دایـک وبـاوکی و فـەرمانی کـردووه سوپاسـیان بکـات و گوێڕایـەڵیان بێت، لەهـەمـان کاتـدا ئـەو فـەرمانی گوێڕایـەڵ بوونـه تـا ئـەو شـوێنەیە کەسـەرپێچی خـواو هاوبـەش بڕیـاردانی تێدا نـەبێت، لــەکاتی بــوونی ئەوانــەدا تــەنها مــافی ئــەوەی لەســـەر دەمێنێــت بــەچاکی هاوڕێیـەتییان بکـات و پێویسـتە لەسـەری کەشـوێن ڕێبـازی ئەوانـە بکـەوێت کە بەدڵسۆزی گەڕاونەتەوە بۆ لای خـوا:﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّـهُۥ وَهْنًـا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَـيْنِ أَنِ ٱشْـكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْـكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِـيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَـٰهَـدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِـعْ سَـبِيلَ مَـنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنـتُمْ تَعْمَلُـونَ ﴿١٥﴾﴾ {لقمـان: ١٤-١٥}، واتـە: (فەرمان کردووه بەمرۆڤ (بەچاکی هەڵسوکەوت لەگەڵ) دایک وباوکیدا، دایکی کـاتی دووگیـانی هــەڵی دەگـرێ، لاوازی لـەدوای لاوازی و بڕینـەوەی لەشـیر لەدووسـاڵییەوه، (فـەرمانی کـردووه بـەمرۆڤ) کەسوپاسـگوزاری مـن (خـوا) و دایـک وباوکـت بـە، تـەنها بـۆلای منـە گەڕانـەوەتان، ئەگـەر (دایـک وباوکـت) ئەوپەڕی هەوڵیان لەگەڵتدا بۆ ئەوەی کارێ ئەنجام بدەی هاوبەشـی بۆ مـن تیا بێت کەهیچ زانیاریەکت پێی نییه، ئـەوا گوێڕایـەڵیان مەکە، بـەڵام لـەدونیادا زۆر بـەچاکی هاوڕێییـەتی و هەڵسـوکەوتیان لەگـەڵ بکـەو شـوێن ڕێبـازی کەسـێک بکەوه کە بەدڵسۆزی گەڕاوەتـەوه بـۆ لای مـن، گەڕانـەوەتان تـەنها بۆ لای منە، ئەمجا هەواڵتان دەدەمێ لەبارەی ئەو کردەوانەی کەکردووتانه).

بـامرۆڤی بـاوەڕدار لەسـەردەمی ئاشـووبدا بـەدوای ئەوکەسـانەدا بگـەڕێت لەنێو خەڵکیدا کەکلیلی چاکە و داخـەرەوەی خراپـەکارین، لەگـەڵ ئـەوان بژی و لەگەڵ ئەواندا هاوڕێیەتی باش و ژینگەی لەبار هەیەو تێیدا کارەباشـەکان گەشـە دەسەنێت و دڵەکان پاکژ دەبنەوه. دانیشتن لەگەڵ هاوڕێی پیاوچاک تەنها خێرو بەرەکەت و سوودی هەیەو دانیشتن لەگەڵ هاوڕێی خراپەکاریش بەپێچەوانـەوه تــەنها خراپــەو زیــانی هەیــە. پێغەمبــەری خــوا (درودی خــوای لەســـەر بــێ) دەفەرمووێت: "مثل الجليس الصالح والجليس السوء كمثل صـاحب المسـك وكير الحداد، لايعدمك مـن صـاحب المسـم إمـا تشـتريه أو تجـد ريحـه، وكيـر الحداد

يحرق بدنك أو ثوبك أو تجد منه ريحا خبيثة"[1]، واتە: (نموونەی هاونشینی چاک و هاونشینی خراپ وەک نمونەی بۆنفرۆش و کورەی ئاسنگەر وایە، بۆنفرۆش یا ئەوەتا لێی دەکڕی یا بۆنە خۆشەکەیت بۆ دێت، کورەی ئاسنگەریش لاشەت یان پۆشاکەکەت دەسوتێنێ یا بۆنێکی ناخۆشت بەسەردا دێنێ).

لەبەر ئەوەی هاوڕێیەتی پیاوچاکان هۆکارێکی کارایە لەهۆکارەکانی تەزکییە، بەهۆیەوە دەروونەکان لەرووبەڕبوونەوەی بەرپابوونی ئاشووب و بڵاوبونەوەی خراپەکاری دەپارێزێت و دڵەکان پاکژو بێگەرد دەکات و هیمەت بەرز دەکات و خەم و ناخۆشی لادەبات و لەگەڵ ئەودا باوەڕدار کارەکانی زیاترو باشتر ئەنجام دەدات و پاکەرەوەی ڕەوشتی و یادی زۆری پەروەردگاریشی دەبێت. خۆ ئەگەر لەبیرکرا دەبینێت کەسانێ هەیە یادی دەکەن و ئەگەر باسیش کرا ئەوا دەبینێت کەسانێک هەیە پشتیوانین.

هەروەک چۆن لەهاوەڵێتی پیاوچاکاندا دەربازبوون لەئاشووب و تیاچوون هەیە، بەهەمان شێوە هاوەڵێتی پیاوخراپان دەبێتە هۆی سەرلێشێوان و دوورکەوتنەوە لەڕێگای باوەڕداران لەدونیاداو پەشیمانی و نارەحەتی لەرۆژی قیامەتدا: ﴿وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ٢٩﴾ {الفرقان: ٢٧-٢٩}، واتە: (رۆژێکە کەستەمکار قەپ دەکات بەهەردوو دەستی خۆید او دەڵێ خۆزگە ڕێگای ڕاستم لەگەڵ پێغەمبەردا بگرتایەتە بەر، ئای تیاچوون بۆمن، خۆزگە فلان کەسم نەکردایە بەهاوەڵ و خۆشەویستی خۆم، بەڕاستی ئەو (کەسەی کە کردم بەهاوەڵ) منی لەقورئان وێڵ کرد، دوای ئەوەی قورئانم پێ گەیشت وباوەڕم پێ هێنا و شەیتان هەمیشە پشت تێکەر و پشت هەڵکەرە بۆ ئادەمیزاد). لەبەر ئەوە دۆستایەتی خراپەکاران و خۆشەویستی و هۆگربوونیان لەدونیادا، بەدڵنیاییەوە دەگۆڕێت بۆ ڕقلێبوون و بوغزو کینە و دوژمنایەتی: ﴿ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۢ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا

---

[1] Ibid., p85-139.

ٱلۡمُتَّقِـــينَ ﴿٦٧﴾﴾ {الزخـرف: ٦٧}، واتــه: (دۆســت وخۆشەویســتەکان ئــەو رۆژە دوژمنی یەکترن، جگە لەپارێزکاران و لەخواترسان نەبێت).

باشترین هاوەڵێتی لەدونیادا هاوەڵێتی مزگەوتە، باشترین کۆمەڵیش نوێژی بەکۆمەڵە لەمزگەوتدا، هەتا ژمارەی نوێژخوێنان زیاتر بێت، پلەو پایەی باشترە. چونکە "نویژی کەسێ لەگەڵ کەسێکی تردا باشترە لەنوێژی بەتەنهاو نوێژی لەگەڵ دووکەسدا باشترە لەنوێژی لەگەڵ یەک کەسدا، تا زیاتر بن ئەوا لای خـوا خۆشەویسـتترە"(١). چونکـە لەمزگەوتـدا: نـوێژی بەکۆمــەڵ و وانــەکانی فێربـوون وفێرکـردن هەیـەو تێیـدا بـاوەڕدار بـۆ خـۆی و بـاوەڕدارانی دیکـەش دەپارێنــەوە و بــاوەڕداران تەوقــە لەگــەڵ یــەکتر دەکــەن و گوناهــەکانیان هەڵدەوەرن، لەحوزەیفەی کوڕی یەمانـەوە (خـوا لێی ڕازی بێ) لەپێغەمبـەرەوە (درودی خـوای لەسـەر) فەرموویـەتی: ((إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا لَقِيَ الْمُؤْمِنَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ وَأَخَذَ بِيَدِهِ فَصَافَحَهُ تَنَاثَرَتْ خَطَايَاهُمَا كَمَا يَتَنَاثَرُ وَرَقُ الشَّجَرِ)) (٢)، واتـە: (بـاوەردار کـاتێ بە باوەڕدار گەیشت و سڵاوی لێ کرد و تەوقەی لەگەڵدا کرد، گوناهەکانیان هەڵدەوەرێت، هەروەک چۆن گەڵای دار هەڵدەوەرێت).

هاوەڵێتی مزگەوت تەنها بەوە ناوەستێت، بەڵکوو دەگاتە هەموو شێوەکانی سەردانی کردنی یەکترو یەکتر خۆشویستن و هاریکاری و دەستبارگرتن، لەناو مزگەوت و دەرەوەی و لەنێو کۆمەڵگای ناوخۆییدا.

**قورئانی پیرۆز + یادی خوا و فیکر + هاوەڵێتی پیاوچاکان + ... + ...**

هەندێک هۆکاری تەزکییەی دەروون

(١) العسقلاني، أحمد بن علي بن حجر. فتح الباري شرح صحيح البخاري. القاهرة: دار الريان للتراث، ١٩٨٦م، ص١٥٩. ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە ئەحمەدو خاوەن سوننەکان گێڕاویانەتەوەو ئیبن خوزەیمە و جگە لەو لەفەرموودەی ئوبەی کوڕی کەعب بە(مرفوع)ی ڕاستیان کردۆتەوە.

(٢) الطبراني، أبو القاسم سليمان بن أحمد بن أيوب. معجم الطبراني الاوسط. تحقيق: طارق بن عوض الله وعبد المحسن الحسيني، القاهرة: دار الحرمين، ١٤١٥هـ ج١، حديث رقم ٢٤٥، ص٨٤.

# کۆتایی

بەمشـــێوەیە قورئـــان ســـەبارەت بەتەزکییـــە، وەک مەرجـــەعی قســـەکردن بـــەجوانی ڕوونـــی کردووەتـــەوەو بەهاکـــەی خســـتووەتە ڕوو، بوارەکـــانی و ئامرازەکانی دیاری کردووە، چونکە تەزکییە لەقورئاندا بۆ تـاک: بۆ هەسـتەکانی دەروونی و خورپەکانی دڵی و ڕەفتـاری ئەندامـەکانی جەسـتەیەتی. تەزکییـە بۆ کۆمـەڵ و ئومەتیشـە، پێغەمبـەریش کـەبۆ ئومـەت نێـردراوە تـا پـاکی بکاتـەوەو پەیوەندییەکانی خەڵک و سیستەمەکانی ژیانیش پاکژ بکاتـەوە. تەزکییـە بۆ مـاڵ وسامانیشە، زەکاتدان ماڵ وسامان پاک دەکاتەوە، بەرکـەت و گەشـە بەسـامانی تاک و سامانی کۆمەڵ دەبەخشێت.

ســـەرفرازە ئـــەو مرۆڤـــەی تەزکییـــەی دەروونـــی دەکـــات و خـــوای گـــەورە بەتەزکییـە فـەزڵی لەگـەڵ دەکـات ، هەرکەسـیش لەتەزکییـەی خـوا بـۆی بێبـەش بێت، ئەوا تەزکییەی مـرۆڤ بۆخـۆی و تەزکییـەی خـەڵکی بـۆی هـیچ سـوودێکی نابێت و زیانی زۆری پێدەگەیەنێت.

قسەکردنیشـــمان ســـەبارەت بەتەزکییـــە وەک یـــەکێک لەڕشـــتەبەندی بـــەها باڵاکـان، کەتایبـەتن بـەو مرۆڤـەی خـوای گـەورە هـەڵیبژاردووەو کردویەتییـە جێنشـــینی لەزەویـــدا، هـــەتا ئـــاوەدانی بکاتـــەوە. لەبـــەر ئـــەوە خـــوای گـــەورە خستویەتەڕوو بۆی کەچۆن لەجەسـتە و عـەقڵ و ڕۆح و هەڵسـوکەوت وڕەفتـار و سامان و ماڵ وموڵک و سیستەمەکان و پەیوەندییەکانیدا بەپلەکانی تەزکییەدا بـەرز دەبێتـەوەو بڕیاریـداوە کەسـەرفرازی مـرۆڤ لـەدونیا و قیامەتیـدا بـەو تەزکییەیـــەی کەبەدەســـتی دەهێنێـــت بەســـتراوەتەوە. لەبەرئـــەوە ئەنجامـــدانی ئاوەدانکـاری لەزەویـدا بـەوجۆرەی کـەخوای گـەورە ویسـتوویەتی لەهـەموو بوارەکاندا بەبێ ئەم تەزکییەیە نایەتـەدی. چونکـە هـەموو شـێوەکانی پێشـکەوتن و گەشەسـەندنی زانسـتی و تـەکنیکی و ئـاوەدانی و فراوانبـوونی دەروازەکـانی بەرهەمهێنان وبەکارهێنانی بەرهەمـە پیشەسـازی و بازرگـانی و کشـتوکاڵیەکان و پەرەپێدانی ڕێکخسـتنی کـارگێڕی هـیچ بەهایـەکی نییـە ئەگـەر ڕەنگدانـەوەی نـەبوو لەسـەر خەسـڵەتەکانی مـرۆڤ بەپاککردنـەوەو بێگـەردکردن، بەمەبەسـتی

هێنانــەدی مەبەســتەکانی بەدیهێنــەر لــەبونیاتی کۆمــەڵگای مرۆیــی لەســەر یەکترناسین و هۆگربوون و تەواومەندی و سـەقامگیری قەناعـەت و ڕازیبوون و دڵئارامی و دڵنیایی لەدڵی مرۆڤدا.

خۆ ئەگەر یەکترتـەواوکردنی مـەعریفیمان کردە سـەرچاوە بۆ مەنهەجیـەتی ئیسلامی لەبیرکردنـەوە و گـەڕان و ڕەفتـاردا، ئـەوا ئـەوە دەبێتـە یارمەتیدەرمان لەتێگەیشـتنی ئـەو پێگەیـەی بـەهای تەزکییـە هەیـەتی و بنـەما مەنهەجیـەکانی کــەدەکرێت لێــی ببنــەوە. لــەو بنەمایانــەش تــەنها وەک نموونــە: بنــەمای یەکترتەواوکردنی جەستە و عەقڵ و ڕۆح و بنـەمای یـەکتر تـەواوکردنی بوونی مرۆیی لەنێوان تاک وکۆمەڵگادا و بنەمای یەکتر تەواوکردنی زانست و کار.

کۆمەلگای مرۆیش هەردەم لەبەردەم هەڕەشەی ئاریشـەی لەناوبەری بواری ئابووری وسیاسی و کێشە چارەسەرنەبووەکانی بواری مرۆیی و کۆمەڵایـەتی و نەخۆشیەکانی دڵەڕاوکێ وبێئومێدی و داڕووخان وناخۆشـی لـەبواری عـەقڵی و دەروونــی، هــەتا مــرۆڤ بــەهای تەزکییــەی لەهــەموو بوارەکانــدا دەســت بکەوێتـەوە. ئـەو کاتـە بۆی دەردەکـەوێت کەتەزکییـە بریتییـە لـەکۆی باشـێتی و ڕەوشت وخەسڵەتی چاک، کەپێویستە مرۆڤ تییدا بێت ، ئەم بەها باڵایەش ئـەو سەرچاوەیەیە کەتەواوی بەها لاوەکیەکانی لێ دەبێتـەوە، کە باڵادەستن بەسـەر ڕەفتـاری فـەرمانڕەوا و فەرمانبـەردار ، دەوڵەمەنـد و هـەژار، زانـاو فێرخـواز، لـەنێوان تاکـەکان و لـەنێوان کۆمەڵـەکان و لەسـەر ئاسـتی نێوخـۆی ئومـەت و لەسـەر ئاسـتی پەیوەندییـە دەرکییـەکانی بـە نەتـەوەکانی دیکـەوە. ئەوکاتـە بۆی دەردەکــەوێت کەهــەر بەرنامەیــەکی چــاککردنی واقیــع، لەهــەر بوارێــک لەبوارەکانیدا، بەشێوەیەکی بنەڕەتی پشت بەمرۆڤ و ئـەو ئاسـتەی لەتەزکییـەی دڵ و ویژدانی و لەتەزکییەی کارو ڕەفتاری پێی دەگات دەبەستێت.

خودایـا دەروونمـان پارێزکـار بکـە و پـاکی بکـەرەوە، هـەر تـۆ باشـترین پاکژکاری دەروونی... ئامین

## ئاوەدانکاری لەڕشتەبەندی بەها باڵاکاندا[1]

لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ ئەوەی کە مامۆستا تەها جابر عەلوانی ناوینـاوە سـێ بـەها بـاڵا باڵادەسـتەکە: یەکخواناسـی ، تەزکییـە، ئاوەدانکـاری، بـۆ باسـکردنی بـەهای ئاوەدانکـاری، وەک چـەمکێکی ناوەنـد (مرکزي) لەچەمکـەکانی قورئـانی پیـرۆز ، هەوڵـدەدەین تێڕوانینێکـی مـەعریفی ئـەم چەمکـە لەمەرجەعیـەتی قورئانەوە بخەینەڕوو. قسەکردنەکەشمان سەبارەت بە ئاوەدانکاری لەڕوانگەی "فیقهـ"ەوە دەبێت بۆ بەهای ئاوەدانکاری و پەیوەندی ئـەم "بەهایـە" بـەو ژیانـەوە کەخوای گەورە بۆ مرۆڤەکانی دەوێت، ئـەوەش تێگەیشـتنی ویسـتراوی گوتـاری خـوای گەورەیـە کەپەیوەنـدارە بـەکردەوەکانی خـەڵک کەگوتارەکـە ئاڕاسـتەی ئـەوان کـراوە، لـە ڕوونکردنـەوەی ئـەوەی کـە دەیـەوێت و پەسـەندی دەکـات، یـاخود لێیـانی حـەرامکردووەو دووریـان دەگرێـت لێـی. کەواتـە ئاوەدانکـاری بەهایەکە فیقهی کارکردن لەژیانی دونیا دیاری دەکات، بەتایبەت کـاری کۆمـەڵگا کە پەیوەندارە بەسیستەمی کارگێڕی وچاودێری کاروباری خەڵکییەوە، ئەمـەش بەئاسـانکردنی ڕێگـای ژیـان بۆیـان و لادانـی ناڕەحـەتی لەسـەریان. هـەروەک چۆن فیقهـی ئاوەدانکـاری لـەم ڕووە مادیانـەی ژیـانی کۆمـەڵگاوە ، لەباڵەخانـەو ڕێگا و کشـتوکاڵ وپیشەسـازیدا دەدرەوشـێتەوە، لەلایەنـە مەعنەویـەکانی ژیـانی کۆمەڵگاشدا کە دابینکردنـی ئاسـایش و بـەرپاکردنی دادپـەروەری و ئەنجامـدانی ڕاوێژە بەهەمان شێوە دەدرەوشێتەوە، بەمەش باری تایبەت بەدەوڵەمەندەکان وفەرمانڕەوایان بریتی دەبێت لەشـەونخوونی بـەدیار بەرژەوەندییـەکانی خـەڵکی و سۆزو بەزەیی بەرانبەریان و بـاری گشـتی خـەڵکیش نـزا و داواکردنـی خێرو بەرەکەت و هێزی زیاترە بۆ دەوڵەمەندو فەرمانڕەواکان.

ئەو رۆژەی موسڵمانان بەمشێوەیە لە"فیقهی ئاوەدانکاری" تێگەیشتن، خێر و خۆشی لەنێویاندا زۆر بـوو دەزگـاو دامـەزراوەی زانسـتی بڵاوبوویـەوە، خـوای گـەورە لەئاسـمان و زەوییـەوە بەرەکـەتی بەسـەردا ڕژاندن، لەهـەموو لایەکـەوە

---

[1] ئـەم بەشـە لەبنەڕەتـدا وتـارێکی کـورت بـوو لـەگۆڤاری (إسـلامية المعرفـة)دا بڵاوکرایـەوەو، دواتر گەشەی پێدرا، بڕوانە:

- ملکاوي، فتحی حسن. "العمران في منظومة القيم الحاكمة"، إسلامية المعرفـة، ع٥٩، خريـف ٢٠١٠م، ص٥-٢٤.

رزق و ڕۆزییـــان پێـــدرا، لـــەهۆکارەکانی خۆشـــگوزەرانیدا داهێنانیـــان کـــرد و بـەهاکانی پێشـکەوتن و شارسـتانیەتیان بڵاوکـردەوە، بـەجۆرێک کـە بـوون بـە ڕووگە بۆ نەتەوەکانی تر.

ئەو رۆژەشی موسڵمانان " فیقهی ئاوەدانکارییان" فـەرامۆش کرد، پێگـەیان لاواز بوو و دەسەڵاتیان داڕوخا و ئاوەدانکارییەکەیان وێران بـوو دوژمنیشـیان بەسـەریاندا زاڵ بـوو. لێرەشـدا یـەکێک لـەڕووەکانی بێئاگـابوون لاوازبـوونی هیممـەت و دەسـتەپاچەیی لەبـەرەو لووتکـە چـوون و ڕازیبـوون بـەژیانی سەرکزی و تەمبەڵی بوو.

لەمەشدا هەندێجار زانستی سەیرو نـامۆ و تێگەیشـتنی نـەزۆک هۆکاربوون، کـەهیچ پەیوەندییـەکیان بەشـەریعەتەوە نـەبوو برەویانـدا بـە رق لێبـونی ژیـانی دونیـا و سـووک سـەیرکردنی بـەهاکانی و گوێنـەدان بـەکاروبارەکانی و فەرامۆشکردنی چاودێری کاروبـاری کۆمـەڵگاو پاراستنی بەرژەوەندییـەکانی و پەیوەست نەبوون بەئومەت وبەجێنەهێنانی مافەکانیان.

قسەکردنمان سەبارەت بە ئاوەدانکـاری –بەهـەمان شـێوەی قسـەکردنمان لـە بـەها قورئانییـەکان دەبێـت- بەخسـتنە ڕووی ئـەوەی لەبارەیـەوە لـەقورئانی پیرۆزدا هاتووە دەست پێدەکەین، پاشـان قسـە لەسـەر ئـەو پەیوەندییـە دەکـەین کەقورئانی پیرۆز لەنێوان ئاوەدانکردنەوەی زەوی و سروشـتی ژیـان لەسـەریدا و چارەنووسـی دواتـری دروسـتی کـردووە. گونجـاو نییـە قسـەکردن سـەبارەت بـــەئاوەدانکاری بـــەبێ ئامـــاژەکردن بـــە عەبـــدوڕەحمانی کـــوڕی خەلـــدوون کە لەقورئانەوە ڕێنوێنی وەرگرت و زانسـتێکی نـوێی دانـا و نـاوی لێنـا زانسـتی ئاوەدانکاری مرۆیی.

**یەکەم: ئاوەدانکاری لەزاری قورئانەوە:**

وشـەی (عَمَـرَ) بیسـت وپێنج جـار لـەقورئانی پیرۆزدا هـاتووە، سـیان لەوانـە بەشـێوەی نـاو (إسـم علـم) هـاتووە: "خانـەوادەی عیمـران": ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٣٣﴾ {ال عمـران: ٣٣}، واتـە: (بێگومـان خوای گەورە ئادەم ونووح وخانەوادەی ئیبراهیم و خانەوادەی عیمرانی بەسـەر هەموو جیهانیاندا هەڵبژاردووە) ، "کچەکەی عیمـران": ﴿وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ ١٢﴾ { التحـریم:١٢}، واتـە: (مەریـەمی کچـی عیمـرانیش کـە داوێنـی خـۆی پـاک ڕاگرت، ئەوسا ئێمە فوومان پیا کرد لەڕۆحێک کە خۆمان دروستمان کردووەو بـاوەڕی هێنـابوو بـە وتـەکانی پـەروەردگاری خـۆی و کتێبـەکانی و لـەڕیزی گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداراندا بوو) ، "ژنەکـەی عیمـران": ﴿إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٣٥﴾ { ال عمران: ٣٥}، واتە: (کاتێک کە ژنی عیمران وتی: ئـەی پـەروەردگارم مـن ئـەوەی لەسـکمدایە نـەزرم کـردووە بـۆ تـۆ ئـازاد کـراو بێت (بـۆ خزمـەتی تـۆ کـە بیت المقدسە) تۆش ئەمەم لێ گیرا بکە).

سـێجاریش وەک نـاوی مەناسـیکی عـومرە هـاتووە، کەلەتـەواوی ڕۆژەکـانی ساڵدا ئەنجام دەدرێت، ئەمەش وادەکات کەعبەی پیرۆز پڕ بێت لـەعومرەکاران و بەدرێژایی ساڵ ئاوەدان بێت بەوان، ئەمە لەکاتێکدا کەحەج لەسـاڵێکدا یـەکجار ئەنجام دەدرێت: ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِۚ فَإِنۡ أُحۡصِرۡتُمۡ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۖ وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ بِهِۦٓ أَذٗى مِّن رَّأۡسِهِۦ فَفِدۡيَةٞ مِّن صِيَامٍ أَوۡ صَدَقَةٍ أَوۡ نُسُكٖۚ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۚ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ فِي ٱلۡحَجِّ وَسَبۡعَةٍ إِذَا رَجَعۡتُمۡۗ تِلۡكَ عَشَرَةٞ كَامِلَةٞۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمۡ يَكُنۡ أَهۡلُهُۥ حَاضِرِي ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ١٩٦﴾ {البقـرة: ١٩٦}، واتـە: (حـەج و عـومرە (کەدەسـتان پێکـرد) تـەنها بـۆ خـودا تـەواوی بکـەن، ئـەمجا ئەگـەر هـەر (قەدەغـەکران) ئەوسـا چیتـان بـۆ هەڵسـوڕا لـەقوربانی (سـەری بـڕن) و سـەرتان مەتاشـن تـا قوربانییەکـە دەگاتـە جێـی

دیاریکراوی خۆی، ئـەمجا هەرکەسـێک لـەئێوە نـەخۆش بـوو یـان ئازارێـک لەسـەریدا بـوو لـەبری ئـەوە بـەرۆژوو بێت (کەسـێ رۆژە)، یـا خێرێـک یـان قوربانییـەک بکـات، جـا کاتێـک دڵنیا بـوون (تـرس نـەبوو)، ئـەمجا ئەوکەسـەی بەهرەمەنـد بـوو بەبـەجێهێنانی عـومرە تاکـاتی حـەج ئـەوە چـی بـۆ هەڵسـوڕا لـەقوربانی (بیکـات)، ئەگـەر یـەکێک نـەبیوو باسـێ رۆژ بـەڕۆژوو بێت لـەکاتی حەجداو حەوت رۆژی تریش کاتێک کەگەڕانـەوە، ئەمـە دەبێتـە دە رۆژی تـەواو ئەمە بۆ کەسێکە کە (خۆی و) کەسوکاری دانیشتووی دەووروبەری (مسجد الحرام) نەبێت و لەخوا بترسن و بزانن کەبەڕاستی خوا خاوەنی تۆڵەو سزای سەختە).

سـێجاریش پەیوەسـتە بەئاوەدانکردنـەوەی مزگەوتـەکان و بونیاتنـان و خزمەتکردن و مانەوە تێیاندا: ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِي ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ۝١٧ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ۝١٨ ۞أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١٩﴾ {التوبة: ١٧-١٩}، واتە: ( (ئەی بێباوەڕان) ئایا پێتـان وایـە ئـاودان بـەحاجیان و (سەرپەرشتی و) ئاوەدانکردنـەوەی مزگـەوتی حـەرام (کەعبـەی پیـرۆز) وەکـوو کەسێکە کەباوەڕی هێنـا بێت بـەخواو بـەڕۆژیی دوایـی و لـەڕێی خـوادا تێکۆشـا بێت؟ ئەوانـە لای خـوا چـوون یـەک نـین و خـوا ڕێنمـونی کۆمـەڵی ستەمکاران ناکات)، جارێکیش ئاماژەیە بۆ (بیت المعمور): ﴿وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ۝٢ فِي رَقٍّ مَّنشُورٍ ۝٣ وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ ۝٤﴾ {الطور: ١-٤}، واتـە: (سـوێند بـەکێوی طور، بـەکتێبی نووسـراو (مەبەسـت قورئانـە)، لەچەنـد لاپەڕەیـەکی بڵاوکـراوە، سـوێند بەو خانە ئاوەدانە)، لەوانەیە مەبەست کەعبـەی پیرۆز بێت، کەخـەڵکی ئاوەدانی دەکاتەوە، یاخود ماڵێک بێت لەئاسمان فریشتەکان ئاوەدانی دەکەنەوە.

سـێجاری دیکـەش بـەواتای مانـەوەو جێگیربـوون لەسـەر زەوی و کشتوکاڵکردن و بونیاتنانی خان و تـەلارو کۆشـک و دەستگرتن بـەهۆکارەکانی شارسـتانییەت و وازهێنـان لـەژیانی کۆچـەری و بیابانشـینی هـاتووە،

لەمبارەشەوە باسی چەند هۆزێک کراوە کە بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر زەویدا خاوەن هێزبوون و کاری کشتوکاڵیان کردووە و کانزاکانیان دەرهێناوە: ﴿أَوَ لَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٩﴾ {الروم: ٩}، واتە: (ئایا ئەوان بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا سەرئەنجامی ئەوانەی پێش خۆیان ببینن چۆن بووە،کەئەوان زۆر لەمان بەهێزتریش بوون، زیاتر لەمانیش زەوییان کێڵاو ئاوەدانییان کردەوە، پێغەمبەرانیان بەموعجیزە ڕوونەکانەوە بۆ هات، بۆیە خوای گەورە ستەمی لێ نەکردوون (کەلەناوی بردوون)، بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد)، لەوانەیە ئەوانە عاد، هۆزەکەی هود پێغەمبەر بن، کەلەسەر شوێنە بەرزەکان کۆشک وتەلارو قەڵایان بونیات ناوە: ﴿أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةٗ تَعۡبَثُونَ ١٢٨ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمۡ تَخۡلُدُونَ ١٢٩﴾ { الشعراء: ١٢٨-١٢٩ }، واتە: (ئایا ئێوە لەهەموو شوێنێکی بەرز بەبێ هودە بورجێک دروست دەکەن و چەند کۆشک وقەڵای بەهێز دروست دەکەن)، واگومان دەبەن کە بەدرێژایی کات لەسەر زەویدا نەمر دەمێننەوە. یەکجاریش بە واتای ژیان هاتووە، کاتێ کەخوای گەورە سوێند بەژیانی  پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەخوات: ﴿لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ٧٢﴾ {الحجر:٧٢}، واتە: (سوێند بەتەمەن و ژیانی تۆ (ئەی موحەمەد) بەڕاستی ئەوانە لەمەستی خۆیاندا سەرگەردانن).

جارەکانی دیکە هەموویان ئاماژەن بۆ تێپەڕبوونی کات لەژیانی مرۆڤدا تا ساڵەکان لەتەمەنی دەڕۆن، یاخود تەمەن درێژ دەبێت، یا دەگاتە تەمەنی لاوازی: ﴿بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ٤٤﴾ { الانبياء: ٤٤ }، واتە: (بەڵکو ئێمە ئەوان وباووباپیرانیانمان بەخۆشی ژیاندووە تاتەمەنی زۆریان بەسەر برد، ئایا ئەوانە (قوڕەیشیەکان) سەرنج نادەن کەئێمە دێینە ناو خاک و وڵاتی (ئەوان)و لەهەموو لایەکیەوە کەمی دەکەینەوە (بەرزگارکردنی لەلایەن موسڵمانانەوە) دەی ئایا ئەوان زاڵ وسەرکەوتوون (یا ئێمە)؟)، ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمۡۚ

وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡ لَا يَعۡلَمَ بَعۡدَ عِلۡمٍ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ۝٧٠﴾ { النحل: ٧٠ }، واتە: (بێگومان خوا ئێوەی دروست کردووەو پاشان دەتان مرێنێت، هەندێک لەئێوە (زۆر پیر دەبێت تا) دەگەڕێنرێنەوە بۆ لاوازترینی تەمەن، بۆ ئەوەی لەپاش زانین هیچ شتێک نەزانێت (هەموو شتێکی لەبیر بچێتەوە) بەڕاستی خوا زانای بەتوانایە).

گومانی تێدا نییە کە بۆ ئەنجامدانی کارەکان و جێبەجێکردنی ئەرکەکان و بەدیهێنانی ئامانجەکان پێویست بەتێپەڕبوونی کات دەکات، چونکە کات یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی گەشەی تاک و بەدیهاتنی هەندێک لەخەسڵەتەکانی و تەواوکردنی هەندێک لە داخوازییە مادی و مەعنەوییەکان. تێپەڕبوونی کات یەکێکە لو توخمەکانی گەیشتنی کۆمەڵگا بە ئاستێکی دیاریکراو لەئاستەکانی بونیاتنان و پێکهێنانی شارستانی.

لەمبارەیەشەوە (مالک بن نبی) هاوکێشەیەکی هەیە کەتێیدا توخمەکانی شارستانی کۆدەکاتەوە و رۆڵی هەریەک لە هەوڵیی مرۆڤ لەکۆکردنەوەی هۆکارە مادییەکان و تێپەڕبونی کاتی پێویست بۆ گەشەپێدانی دامەزراوەکانی شارستانییەت و کەرەستەکانی دەخاتەڕوو. بەڵام بۆچوونی وایە کە کۆبوونەوەی ئەم سێ توخمە: (مرۆڤ و خاک و کات) [1]، وەک پێویست حاڵەتی شارستانی لێ ناکەوێتەوە، بەڵکوو پێویستی بەبەشێک لەتوانای رۆحی، یاخود مەشخەڵێک هەیە کەتوانای بەگەڕخستنی ئەم سێ توخمە و وەبەرهێنانییانی هەبێت بەجۆرێک کە رۆڵییان لەدەستکەوتی شارستانیدا بەجێ بگەیەنن.




پێکهاتەکانی بنیاتنانی شارستانی لای مالک بن نەبی

---

[1] ابن نبي، مالک. شروط النهضة. ترجمة: عبد الصبور شتاهين وعمر كامل مسقاوي، دمشق: دار الفكر، ١٩٧٩م، ص٤٤.

بەگوێرەی دەربڕینی قورئان ئەوەی لەبەرانبەر ئاوەدانکاریدا هەیە بریتییە لە: خراپەکاری و کوشتن و خوێنڕێژی و وێرانکاری و تێکدان و لەناوچوون و چۆڵەوانی و کاولبوون هەیە، بەجۆرێک کەهەمووئەم دەربڕینانە لەقورئانی پیرۆزدا لەبەرانبەر مانەوەی ژیان و بەردەوامبوونی بەپێی یاساو ڕێسا بەڕێوەبەرەکانی و مانەوەی مزگەوت بەئاوەدانبوونی کەخواپەرستان یادی خودای تێدا دەکەن و ڕێکبوونی ژیان لەسەر ڕێنوێنی خوای گەورە هاتوون.

بەمجۆرە ئاوەدانکاری لەدەربڕینەکانی قورئانی پیرۆزدا، بەچەند واتایەکی بەیەکداچوو هاتووە کەچەندان مانا دەگەیەنێت، واتاکانی یەکتر تەواو دەکەن، بەواتای: حاڵەتی ژیان و جێگیربوون و نیشتەجێبوون و بونیاتنان لەشوێندا و بەواتای ئاوەدانکاری مادی و ئاوەدانکاری رۆشنبیری و فیکریش هاتووە. لە بڕگەکانی دواتردا ڕوونکردنەوەی پوخت لەبارەی ئەم مانایانەوە دەدەین و لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا نموونەیان بۆ دەهێنینەوە.

### ١- حاڵەتی ژیان:

ژیانی تاک بە تێپەڕبوونی کات و بەدوای یەکداهاتنی رۆژ وساڵەکان بەدرێژایی تەمەنی لەسەر زەوی دێتە دی: ﴿قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾﴾ { الشعراء: ١٨}، واتە: ( (فیرعەون) وتی: ئایا ئێمە تۆمان بەمنداڵی لەناو خۆماندا پێنەگەیاندو چەند ساڵێک لەتەمەنت لەناو ئێمەدا نەمایتەوە)، چونکە مرۆڤ ژیانی لەسکی دایکییەوە دەست پێدەکات، پاشان دێتە دەرەوە بۆ ژیانی دونیا، دواتر ژیانی کۆتایی دێت و دەمرێت و دەچێتە سکی زەوییەوە، تا ئەو کاتەی رۆژی قیامەت دێت و بۆ ژیانی هەمیشەیی قیامەت هەڵدەستێتەوە ، تاکی مرۆڤ ژیانی دونیای بەلەدایکبوون دەست پێدەکات، پاشان منداڵێک کەهێشتا باڵغ نەبووە، پاشتر باڵغبوون وپێگەیشتن، دواتریش پیربوون وچوونە تەمەن، تادەگاتە تەمەنی لاوازی. هەربۆیە هەروەک چۆن مرۆڤ لەم ژیانەدا تەمەنی خۆی هەیە، بەهەمان شێوە ئومەتیش تەمەنی خۆی هەیە، کاتەکان بە ساڵ و نەوەکان بەسەریدا دەگوزەرێن ، بە مانەوە و هەبوونی دەسەڵات و سەقامگیریی پارێزگاری لە ژیانی خۆی دەکات، ، لە

بوونێکی دیاریکراودا، کاتێ کەتەمەنی تەواو بوو بوونەکەی ڕادەوەستێت، ئیدی پەرتــەوازە دەبێــت و ناســنامەکەی ون دەبێــت و دەســەڵاتی تیــا دەچێــت و بەویرانبوون کۆتایی دێت، ئەو ماڵانەی کە بەخاوەنەکانیان ئاوەدان بوون دەبنە چۆڵەوانی و کەسیان تیا نامێنێت: ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ۝٥١ فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ۝٥٢﴾ { النمل: ٥١-٥٢ }، واتە: (سەرنج بدە سەرئەنجامی ئەوان چی لێهات، چۆن ئێمە ئەوان وگەلەکەیانمان هەموو پێکەوە لەناوبرد، ئەمجا ئەوە (جێ) خانووەکانیانە چۆڵ و خاڵییە لەبەر ئەوەی ستەمیان کرد، بەڕاستی لەو بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگاری وبەڵگە هەیە بۆ کۆمەڵێک کەدەزانن (چیمان بەسەر ئەوان هێناوە))، تەمەنیش بەتێپەڕبوونی کات لە ڕووی بەهاو ئەرزشەوە بەژیان دانانرێت ئەگەر بەو جۆرەی کەخوای گەورە داوای کردووە لە مرۆڤ ئاوەدان نەبووەوە کەهەر ئەوەش حەقیقەتی ژیانە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ﴾ { الانفال: ٢٤ }، واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە وەڵامی خواو پێغەمبەر بدەنەوە، کاتێک کەبانگتان دەکەن بۆ لای ئەو (ئاییــەی) کەزینــدووتان دەکاتــەوە)، بــەبێ بەدەمــەوەچوونی خــەڵکی بــۆ بانگەوازەکەی خوای گەورە لەپێناوی ئەوەی ژیانیان دێنێتە دی، بەوەی کەتەمەنیان پڕ بێت لەبەهاکانی حەق و خێر و چاکەویستی، ئەگەر وانەبێت، ئەوا تەمەنیان هیچ بەهایەکی ڕاستەقینەی نابێت و لەکۆتایشدا ژیانیان تەنها بەلاڕێداچوون و پوچ دەبێت.

ئەوەی لەبەرانبەر واتای ژیان هەیە کاتێ مرۆڤ لەسەر زەویی دەژی، بریتییە لەکۆتایهاتنی ژیان بەمردن، لەبەر ئەوە ئاوەدانکاری زەوی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەژیان لەسەر زەوی بەوشکانی و ئاسمان و دەریا و پاراستنی ژیانی زیندەوەران لەژینگە جیاوازەکانی ژیان و دورکەوتنەوە لەکۆتاییپێهێنانی ژیان بەکوشتن و خراپکردنی هۆکارەکانی ژیان و کەرەستەکانییەوە هەیە. چونکە زیندوو کردنەوە بەو واتایەی خستمانە ڕوو، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەئاوەدانکاری سەرزەوی و بوژاندنەوەیەوە، لەسەر ئاستی چاک بەکارهێنانی

هەموو ئەوەی کەخوای گەورە تییدا دروستی کردووە، لەوشکانیی و دەریاو ئاسمانیدا، لەشتومەک و دیاردەو وزەکانەوە هەیە.

لەبەرئەوە قورئانی پیرۆز بەستەم و ناڕەوا کۆتایی هاتنی ژیانی مرۆڤێکی چواندووە بەکۆتایهاتنی تێکڕای مرۆڤایەتی و زیندوو کردنەوەشی بە زیندووکردنەوەی هەموو مرۆڤایەتی چواندووە، چونکە ئەو: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي الْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾﴾ { المائدة: ٣٢ }، واتە: (لەبەر ئەوە لەسەر نەوەی ئیسرائیلمان پێویست کرد، کەبێگومان بڕیار ئەمەیە: ئەوەی تەنیا کەسێک بکوژێت، کە لەتۆڵەی کەسێکی کوژراوی تردا نەبێت، یان لەتۆڵەی خراپەکاری و ئاژاوە نانەوە لەسەر زەویدا نەبوو ئەوە وەک ئەوە وایە هەموو خەڵکی کوشتبێت، ئەوەش بێتاوانێک ڕزگار بکات لەکوژران، وەک ئەوە وایە هەموو ئادەمیزادی رزگار کردبێت و زیندووی کردبنەوە، سوێند بەخوا بێگومان، پێغەمبەرەکانمان بەبەڵگە ڕوونەکانەوە هاتن بۆلایان، کەچی لەپاش ئەوانە زۆرێک لەوانە زیادەڕەوویان کرد لەسەر زەویدا)، هەربۆیە بەرزکردنەوەی بەهای ژیان و بڕیاری پیرۆزبوون وپارێزگاری لێکردنی: بریتییە لەئاوەدانکردنەوەی زەوی و کوشتنی ژیانیش خراپەکارییە تییدا. لەوانەیە "الراغب" واتای (العُمُر)ی لە ئاوەدانکردنەوەی جەستەی مرۆڤەوە بەژیان هێنا وەرگرتبێت[1]، هەروەک چۆن ئاوەدانێتی داواکاری ئاوەدانبوونەوەیەو کردەی ئاوەدانکاری و ئاوەدانکردنەوەش ئەو شێوەیەیە کەجێنشینایەتی لەسەر زەوی دێنێتە دی، تێکڕای سەر زەوی، تا ئەوکاتەی ژیان لەسەر زەویدا هەبێت: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ { البقرة: ٣٠ }، واتە: (من جێنشینێک لەسەر زەوی دادەنێم)، لەبەر ئەوە ڕووە دژەکانی کردەی ئاوەدانکاری و بەدیهاتنی جێنشینایەتی لەزەویدا، بریتییە لەهەوڵدان بۆ

---

[1] الاصفهاني، الرغب. معجم الفاظ القران الكريم. تحقيق: إبراهيم شمس الدين، بيروت: دار الكتب العلمية، ١٩٩٧م، ماده عمر.

خراپەکاری. خراپترین شێوەی خراپەو خراپەکاریش بریتییە لەکوشتنی مرۆڤ و کۆتایی پێهێنانی ژیانی.

لەڕاستیدا بەجێگەیاندنی سپاردەی جێنشینایەتی لەسەر زەوی و کاری ئاوەدانکاری تێیدا، ئەو ئەرکەیە کەژیانی تاک تاکۆتایی هاتنی بەمردن ئاوەدان دەکاتەوە، ئەمە درێژەی دەبێت، بەجۆرێک کەپاش مردنیشی ژیانی کەسانی تر ئاوەدان دەکاتەوە، ئەمەش بە چاکەی بەردەوام (الصدقة الجارية) و زانستی سوودبەخش و منالّی چاک، دێتە دی: "إذا مات العبد انقطع عمله الا من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له"[1]، واتە: کە مرۆڤ مرد ئیدی کردەوەکانی دەپچڕێت لەسێ ڕێگاوە نەبێت: چاکەیەکی بەردەوام، یاخود زانستێکی سوودبەخش، یان مندالّێکی چاک بۆی بپارێتەوە، ئەمە وێڕای ئاوەدانکردنەوەی ژیانی هەمیشەیی لەقیامەتدا. ئەوەش بەهەمان شێوە درێژە دەکێشێت بۆ جۆری مرۆڤەکان، لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر و لەئومەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە، بەدرێژایی مانەوەی جۆری مرۆڤەکان لەسەر ئەم زەویەدا. خۆ ئەگەر ئەم ئاوەدانکارییە بەهۆی خراپەکارییەوە ناتەواوی و ڕاوەستانی تێکەوت، ئەوا ژیانی مرۆڤ بۆ گوزەرانێکی ناخۆش وتەنگ دەگۆڕێت: ﴿وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ١٢٤﴾ { طه: ١٢٤}، واتە: (هەر کەسێک ڕوو وەرگێڕێ لەڕێبازو یادی من، ئەوە بێگومان ئەو کەسە ژیانێکی سەخت وتەنگی دەبێت)، لەبەر ئەوە بەڕاستی بەپێی ڕێنوێنی خوای گەورە ئاوەدانکاری ژیانەو خێرو بەرەکەتی دونیاو قیامەتەو خراپەکاریش ژیانیکی ناهەموار و سەخت و تەنگە لەدونیا و قیامەتدا.

مرۆڤیش لەم ژیانەدا بۆ تەمەندرێژی هەوڵ دەدات، هەتا ژیانی بەجۆرەها کار و کەسابەتی مادی و مەعنەوی ئاوەدان بکاتەوە. لەوانەیە هەولّدانی لەمەدا هەمووی لەپێناوی قیامەتدا بێت، بەجۆرێک خەریک بێت بەشی خۆی لەدونیا لەیاد بکات: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ {القصص: ٧٧}، واتە: (لەوەی خوا پێی داویت ئەو دونیای پێ بەدەست بێنە و

[1] النيسابوري، مسلم بن الحجاج. صحيح مسلم. بيروت: دار ابن حزم، ط١، ١٩٩٥م، كتاب الوصية، باب ما يلحق الانسان بعد وفاته، حديث رقم ١٦٣١، ص ١٠١٦.

بەشی خۆشت لەم دونیایە لەبیر نەچێت)، لەمجۆرە حاڵەتانەشدا مرۆڤ ماڵی فانی ئەم دونیایە و ماڵی هەمیشەیی جێگیربوونیشی ئاوەدان دەکاتەوە: ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧﴾ { النحل: ٩٧}، واتە: (هەرکەس لەئێوە لەنێر یان لەمێ کردەوەی چاکی کردبێت و بیکات و بڕواداریش بوو بێت، ئەوە سوێند بەخوا ژیانێکی خۆش دەیان ژیەنین و سوێند بێ بەچاکتر لەوەی کەئەوان دەیانکرد پاداشتیان بدەینەوە). خەڵکیش هەیە هەوڵ و کۆششی بۆ ئاوەدانکردنەوەی ژیانی دونیایەتی بەجۆرەها ڕەنگی مادی و مەعنەوی و بەتەواوەتی بێئاگا دەبێت لەئاوەدانکردنەوەی قیامەتی، هەربۆیە سەرئەنجامی هەوڵ وکۆششی لەدونیا و ئاوەدانکردنەوەی تێیدا جگە لەبەفیڕۆچوون هیچی تر نابێت: ﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا ١٠٤﴾ { الكهف: ١٠٤}، واتە: (ئەو کەسانە کەکردەوەو کۆششیان بەفیڕۆ چوو لەژیانی دونیادا، واشیان گومان دەبرد بەڕاستی ئەوان کارێکی زۆرچاک دەکەن).

لەبەر ئەوە ئاوەدانکردنەوەی ژیانی دونیا لەگەڵ وێرانکردنی قیامەت، سەرئەنجام ئاوەدانکردنەوە نابێت، لەمبارەیەشەوە (أبو الفتح البستي) [١] لەشیعرێکیدا ئەڵێت:

**(یاعامرا لخراب الدار مجتهدا            بالله هل لخراب العمر عمران)**

واتە: ئەی کۆششکار بۆ ئاوەدانکردنەوەی وێرانەی ماڵەکەت ، توخوا وێرانکردنی تەمەن ئاوەدانکردنەوەی هەیە.

هەربۆیە ئەنجامدانی ئەرکی ئاوەدانی لەسەر زەویدا، بەدەمەوەچوونی بانگەوازی خوای گەورەیە بۆ ئەو ژیانەی کەتێیدایە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ

---

[١] ئەو: موحەمەد کوڕی عەلی بوستییە، بوستی نازناوی بۆناوچەی (بوست) لەوڵاتی ئەفغانستان دەگەڕێتەوە، لەسەدەی چوارەمدا ژیاوەو ساڵی ٤٠٠ی کۆچی لەبوخارا کۆچی دوایی کردووە. ئەو دێڕە شیعرەشی لەقەصیدە نونیەکەیەتی کەسەرەتاکەی بەم بەیتە دەست پێدەکات:

زيادة المرء في الدنيا نقصان            وربحه غير محض الخير خسران

واتە: زیادەی مرۆڤ لەدونیادا کەمییەو، قازانجیشی جگە لەچاکەی پوخت لەدەستدانە.

وَأَنَّـهُۥٓ إِلَيۡـهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ { الانفال: ٢٥ }، واتـه: (خۆتـان بپـارێزن لەئاشـووب و بەڵایـەک کەبەتایبـەت تووشـی سـتەمکارانتان نابێـت (هـەمووتان دەگرێتـەوە)و بشزانن کەبەڕاستی تۆڵەو سزای خوا زۆر سەختە)، لەبەرانبەردا ڕەتکردنـەوەی بەدەمــەوەچوونی خــواو پێغەمبــەر و پشــت هــەڵکردن لێیــان، هەوڵدانــە بــۆ خراپەکاری و تیاچوون: ﴿وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ {البقرة: ٢٠٥ }، واتـە: (کـاتێ پشـتی هـەڵکرد هەوڵدەدات لەزەویدا بۆ ئەوەی خراپەی تێدا بکات و کشتوکاڵ و وەچە و نەوە لـەناو ببـات، خوا خراپەکارەکانی خۆش ناوێت)، جا هەرکەسێک پشت بکاتە بانگەوازی خـوا بۆ بەرپاکردنی ژیان و هـەوڵی خراپـەکاری بدات لەسـەر زەویدا و کشـتوکاڵ و وەچە و نەوە لەناو ببات، ئەوا سـەرئەنجامی ئـەو سـتەم و خراپەکارییـەی تـەنها خۆی ناگرێتەوە، بەڵکو دەرئەنجامەکەی گشتی دەبێت و هەموو چاندن و نەوەو وەچەیـەک دەگرێتـەوە، ئەگـەر هـاتوو کۆمـەڵی خەڵکەکـە دەسـتیان نـەگرت و ڕێگرییــان لەئەنجامــدانی ســتەم و خراپەکارییەکــەی نــەکرد، هــەر ئومــەتێک لەئومەتـەکانیش پشـت بکاتـە بانگـەوازی خـوای گـەورە بـۆ بـەرپاکردنی ژیـان و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و گەیشتن بەتێگەیشـتن و هـەوڵی ئەنجامدانی سـتەم و خراپــەکاری بــدات لــەڕێیخوێنڕێژی لەجەنگــە ســتەمکارەکانداو لەکارخســتنی بەرژەوەندییەکانی خەڵکی لەبەدەستهێنانی رزق و ڕۆزیی و خێر و بێری زەوی و زیادەڕەوی لەبەکارهێنانی وزەکانی زەوی بەشێوەیەکی خراپ و پڕکردنیان بەژەهر و مادە پیسکەرەکان، ئـەوا دەرئـەنجامی ئـەو کـارە لـەناوچوونی چاندن ونـەوەو وەچـە دەبێـت لەهـەموو زەویـداو ئاشـووبێکیش کـەتێکڕای نەتـەوەکان دەگرێتەوە، ئەگەر هاتوو نەتەوەکانی سەر زەوی لـەدژی ئـەو نەتـەوە سـتەمکار و خراپەویسـتە ڕانەوەسـتان. ئـەم زەوییـە کـەخوای گـەورە مرۆڤـی کـردووە بەجێنشــین تێیــدا وەک کەشــتییەک وایــە، ئەگــەر نغــرۆ بــوو ئــەوا هــەموو سەرنشــینەکانی بــەپیاو چــاک و خراپەکاریشــەوە وەک یــەک نغــرۆ دەبــن، ســەبارەت بەلێپرسینەوەشــیان لەقیامەتــدا، ئــەوا خــوای گــەورە بــەزانین و ڕەحمەت و دادپەروەری خۆی لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات.

چیرۆکـە قورئانییـەکانیش پـڕن لەنموونـەی حاڵـەتی دەسـتکەوتی دونیـایی کەنموونـەی خراپـەو خراپـەکارین و نموونـەی دەستکەوتی دونیـایش کـەخۆیان

لـەئاوەدانکاری و چاککردنیـدا دەبینێتـەوە. نموونـەی ئەمانـەش ئـەوەی خـوای گـەورە سـەبارەت بـەقاروون کەلـەهۆزی موسـا (سـەلامی خـوای لـێ بـێ) بـوو هۆزەکـەی سـەبارەت بەخراپـەکاری و کـاری نـاڕەوا هۆشـداریان پێـدا و ئامۆژگارییان کرد کە لەو سامانای کۆی کردووەتەوە قیامەتی لـەبیر بێت و بۆ بەرژەوەنـدی خـەڵک و ئاسـانکاری کاروبـاری ژیانیـان بـەکاری بێنێت و بەشـی خۆشی لەخۆشی و جوانییەکانی دونیا و هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی فـەرامۆش نەکات، بەڵام ئـەو لەگـەڵ فـەرمانڕەوای خراپەکاردا هاوپـەیمانی بەسـت و هێنـدە مـاڵ و سـامانی کـۆکردەوە کـە کلیلـی گەنجینـەکانی مرۆڤـی زۆر بـەهێزیش نەیدەتوانی هەڵیان بگرێت، بانگەشـەی ئەوەشی دەکرد کە ئەو مـاڵ و سـامانەی کۆی کردووەتەوە موڵکی خۆیەتی ، بەئەزموون و لێهاتوویی خۆی، یان بـەهۆی بەڕێزییـەوە لای خـوای گـەورە و بەباشـزانینی خـوا بـۆی بەدەسـتی هێنـاوە[1]، کاتێ کـە گـوێی بـەئامۆژگاری هۆزەکـەی بەبەخشـین لـەماڵ وسـامانەکەی نـەداو ئاوەدانکاری دونیایی کـەخۆی لـە کۆکردنـەوەی مـاڵ وسـاماندا دەبینێتـەوە وای لێکـرد کـە داببڕێـت لـە ئاوەدانکـاری بەسـوود، سـەرئەنجامەکەشـی ئـەوە بـوو کە خوای گەورە خۆی و ماڵ وسامانەکەشی لەناوبرد و هیچ سـوودێکی نـەبوو بۆی.

لەبەرانبەر ئەمەدا چیرۆکی (ذی القرنین) دێت کەنموونەیـە بۆ بەگەڕخستنی لەخواترسانەی زانین و ئـەزموون وسـوود گەیانـدن بەدروسـتکراوەکانی خـوای گەورە و ئاوەدانکـاری چـاکی پەیوەسـت بەبـەهای یارمـەتیدان و پێشکەشـکردنی هاریکـاری و بونیاتنـانی بەسـوود. لەکاتێکدا خەڵکەکـەی لـەنێوان دوو بەربەسـت (سد)ەکەدا بوون، داوایان لێکرد لەدروسـتکردنی دیـوار بـەدەوری ناوچەکەیاندا

[1] إبـن القيم الجـوزي، محمـد بـن أبـي بكـر. شـفاء العليـل فـي مسـائل القضـاء والقـدر والحكمـة والتعليـل. بيـروت: دار المعرفـة، ١٩٧٨م، ل٣٨، دەڵێت: "مەبەسـت ئەوەیـە کەقسـەکەی لـەبارەی ئـەو زانینەی هەیەتی ئەوە بەپێی ویست خۆی فێری بووە، واتاکـەی بـەوەی کەلـە لام هەیـە لـەزانین و ئـەزموون و مەعریفـە کەبەهۆیـەوە گەیشـتوومەتـە ئـەوەو بەهۆیـەوە بەدەسـتم هێنـاوە، خـۆ ئەگـەر مەبەسـت لـەزانینی خـوا بێـت ئـەوا واتـای بـەهۆی ئـەو زانینـەی خـوا لای مـن لـەخێرو باشـەو شایستەبوون هەمەو منیش شایانم بۆی بەهۆی بەڕێزبوونەوەمەوە بەسەریدا، ئەم مانایـەیان زیـاتر نزیکە، چونکە ئەڵێت بەهۆی زانین ومەعریفەمەوە هێناومە(أوتيته)و ناڵێت بەدەسـتم هێنـاوەو فێری بووم (حصلته واكتسبته)".

یارمەتیان بدات، لەبەرانبەر ئەوەدا مافی خۆی بدەنێ، ئەویش ئەو زانین و ئەزموونەی کەخوای گەورە پێی بەخشیبوو خستەگەڕ و تەنها داواکاریشی لەهۆزەکە ئەوە بوو کە خۆیان لەگەڵیدا کار بکەن و کەرەستەی خاوی پێویست بۆ بونیاتنان کۆبکەنەوە، ئەم خزمەتەشی بێ بەرانبەر بۆ ئەنجامدان.

کەواتە ژیانی باش لەدونیادا بەهۆی ئاسوودەیی دەروون و چاکەویستی و خێر و بێر بەگشتی و کۆبوونەوەی خەڵکی لەسەر خۆشەویستی و هۆگری و هەبوونی هێمنایەتی و ئاسایش و بەدیهاتنی یەکتر ناسین و هاریکاریکردنی یەکتر و فەراهەمهێنانی هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی دێتە دی... ئەو کاتەی کردەوەی چاک و چاکساری ئاوەدانی دەکەنەوە: ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧﴾ { النحل: ٩٧}، واتە: (هەرکەس لەئێوە لەنێر یا مێ، کردەوەی چاکی کردبێت و بیکات و بڕواداریش بوو بێت، ئەوە سوێند بەخوا ژیانێکی خۆش دەیان ژیەنین و سوێند بێ بەچاکتر لەوەی کەئەوان دەیانکرد پاداشتیان بدەینەوە)، ئەو کاتەشی کەخراپەو خراپەکاری تێدەکەوێت، ژیان دەگۆڕێت بۆ لەناوچوون و تەنگی و سەختی. ئەمەش حاڵەتی تاک و کۆمەڵ و ئومەتیش دەگرێتەوە، بەڵام ژیانی باشی قیامەت پاداشتی ئەوانەیە باشترین کار و چاکترین ئەنجامیان هەبووە، ئەوەش بەهۆی ئاوەدانی ژیانی دونیاوە بەکردەوەی چاک و هەوڵ و کۆششی چاکەخوازیەوە دەبێت.

ژیانی مرۆڤیش لەسەر زەویدا بەکۆبوونەوەی خەڵکی و هاریکاری نێوانیان لەکاروبارەکانی ژیاندا نەبێت نایەتەدی، چونکە "مرۆڤ بەسروشتی خۆی مەدەنییە"و ناتوانێ بەتەنها بژی، بەڵکو لەخێزاندا دەژی و ژیانیشی بەهۆی ئەحکامەکان و سیستەم و بەرپرسیارێتییەکانەوە ڕێکخراوە و خێزانیش لەچەندین کۆمەڵ و گەل و هۆز و نەتەوەدا کۆ بووەتەوەو دابەشبوون بەسەر کۆمەڵگاو وڵاتەکاندا و پەیوەندی یەکترناسین و هاریکاری و ئاڵوگۆڕی سوود بەخش لەنێوانیاندا دێتە ئارا، ئەو کاتانەی کەلەحاڵەتی ئاشتیدان، بەهەمان شێوە دژایەتی و ڕکابەری و جەنگیش لەنێوانیاندا دروست دەبێت. جۆرەها شێوازی ژیانی جیاوازیش لەجۆری خواردن و خواردنەوە و پۆشاک و باڵەخانە و هۆکارەکانی گواستنەوە و پەیوەندییەکان دروست دەبێت، بەجۆرێک کە هەر

تاکێک حاڵـەتی خـۆی لەدەوڵەمەنـدی و هـەژاری ، تەندروسـتی و نەخۆشـی ، زانین و نـەزانین دەبێت و هـەر ئومـەتێکیش مێژووی خـۆی دەبێت لەکۆچـەری وشارسـتانی ، پێشـکەوتن و دواکـەوتن و زانسـت و پیشـەسـازییەکان و... بەوجۆرە.

پاشـان کەسـانیک دێـن بەسـەرهات و مێـژوو دەنووسـنەوە، پێویسـت بەتێگەیشـتنی دروسـت لەسروشـتی ئاوەدانکـاری مرۆیـی و یاسـاکانی ئـەو ئاوەدانکارییە لەبارو گۆڕانکارییەکانیدا دەکات، تابتوانێت ڕووداو و بەسـەرهات و گێڕانەوەکان تۆمار بکات وبیانکاتە بەڵگەنامەو بەهۆی ئەو زانینەی سـەبارەت بەحەقیقەتی شتەکان و سروشتی کاروبارەکان کە هەیەتی بەرچاو ڕوون بێت.

لەڕاسـتیدا مـرۆڤ لەسـەر زەویـدا بێهـودە دروسـت نـەکراوە، بـەڵکو دروسـتکردنی مـرۆڤ بـۆ ئامـانجێکی دیـاریکراو بـووە، کەپەرستشـی خـوای گەورەیـە: ﴿وَمَـا خَلَقْـتُ ٱلْجِـنَّ وَٱلْإِنـسَ إِلَّا لِيَعْبُـدُونِ ۝٥٦﴾ {الـذاريات:٥٦}، واتـە: (جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئـەوە دروسـت کـردووە کەبەندایـەتی مـن بکـەن)، بـۆ تێگەیشـتنی واتـای پەرستشـیش بەوشـێوەیەی کەمەبەسـتە لەدروسـتکردنی مـرۆڤ، چەنـدان ئایـەتی دیکـەش هـاتووە: ﴿وَإِذْ قَـالَ رَبُّـكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَـةِ إِنِّي جَاعِـلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةًۖ﴾ {البقرة:٣٠}، واتە: (کاتێک کەپەروەردگاری تۆ وتی بەڕاستی مـن جێنشـینێک لەسـەر زەوی دادەنـێم)، بەڕاسـتیش جێنشـینایەتی لەسـەر زەویـدا واتای پەرستشە و ئاوەدانکاریش بریتییە لەئاوەدانکردنەوەی زەوی: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُـودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰـهٍ غَـيْرُهُۥۖ هُـوَ أَنشَـأَكُم مِّـنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيـبٌ ۝٦١﴾ { هـود: ٦١}، واتـە: (سـاڵح پێغەمبـەری برایانمـان نـارد بـۆ گـەلی سـەموود، وتـی: ئـەی گەلەکـەم خواپەرستن، هـیچ پەرستراوێکتان نییـە بێجگـە لەئـەو ئـەو دروسـتی کـردوون لەزەویـداو کردوونـی بەئاوەدانکـەرەوە تێیـدا، کەواتـە داوای لێخۆشـبوونی لـێ بکـەن، پاشـان بگەڕێنـەوە بـۆ لای، بەڕاسـتی پـەروەردگارم زۆر نزیکـی دوعـا وەرگـرە)، هەربۆیـە ئاوەدانکـاری ئـەرکی مرۆڤـە لـەژیانی دونیایـداو لـەم سـەر زەویەدا، تـا ئـەو سپاردەیەی لەئەستۆیدایە بـەجێ بگەیـەنێت. خۆئەگـەر تێکڕای دروسـتکراوەکان –جگـە لـەمرۆڤ – بـەبێ ویسـت و سـەرپشـک بـوون خـوا

بپەرستن و سوپاسی بکەن و ملکەچی ڕیساکانی بن ، ئەوا مرۆڤ لەژیانی دونیایدا پەرستشی بەویستی خۆیەتی، هەروەک چۆن بەویستی خۆی باوەڕ بەیەکخواناسی دێنێت.

لەڕاستیدا مرۆڤ لەخۆڵ دروست کراوە، لەبەر ئەوە زەوی پێش مرۆڤ هەبووە، پاشان مرۆڤ هاتووە تا ببێتە جێنشین لەسەر زەویدا، هەربۆیە خوای گەورە پاش ئەوەی کەساقامگیری کرد تێیدا، سپاردەی جێنشینایەتی زەوی پێدا: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ﴾ { الاعراف: ١٠}، واتە: (بێگومان ئێمە ئێوەمان نیشتەجێ و جێگیر کرد لەزەویداو جۆرەها هۆی ژیانمان تێیدا بۆ ڕەخساندوون)، هەموو شتیکیشی بۆ ڕامکردووە: ﴿أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾﴾ { لقمان: ٢٠}، واتە: (ئایا نەتانبینیوە کەبەڕاستی خوا ئەوەی لەئاسمانەکان وئەوەی لەزەویدایە ڕامی هێناوە بۆتان و نیعمەتەکانی ڕشتووە بەسەرتاندا، چ دیارو ئاشکرا، چ پەنهان و نادیار، هەندێ کەس مشتومڕ و دەمەقاڵێ لەبارەی خواوە دەکات بەبێ هیچ زانیارییەک یان ڕێنموونییەک یان کتێبێکی ڕوون و ئاشکرا)، لەبەر ئەوە ئەو بەرپرسیارە لەبەجێگەیاندنی ئەو جێنشینییە بەو شێوەیەی کە پێویستە. هەر ئەمەش پەرستشی ڕاستەقینەیە و ئامانجی ڕاستەقینەی دروست بوونە.

دەتوانین پێگەی ئاوەدانکاری لەژیانی مرۆڤدا لەم هێڵکاریەدا بخەینە ڕوو کەڕشتەبەندی بەها قورئانییەکان نیشان دەدات، بەجۆرێک کەئامانجی ڕاستەقینە لەدروستکردن لەسەرەتای هێڵکاریەکەدا دەردەکەوێت، مەبەستی مرۆڤیش لەژیانی دونیادا بریتییە لەخواپەرستی ، هەر ئەمەش جێنشینایەتییە لەزەویدا. بۆ ئەوەی جێنشینایەتیش بێتە دی لەزەویدا، مرۆڤ تێیدا جێگیر کراوەو زەویش ڕامکراوە بۆی ، مرۆڤیش لەم زەویەدا نامۆ نییە، چونکە لەو دروست کراوە، لەبەر ئەوە خوای گەورە داوای لێدەکات ئاوەدانی بکاتەوە: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾ { هود: ٦١}، واتە: (سالح پێغەمبەری برایانمان نارد بۆ گەلی سەموود، وتی: ئەی گەلەکەم خواپەرستن، هیچ پەرستراوێکتان نییە

بێجگە لەئـەو ئـەو دروسـتی کـردوون لەزەویـداو کردوونـی بەئاوەدانکـەرەوە تێیـدا)، کەواتـە ئەنجامـدانی ئاوەدانکـاری بەدەمـەوەچوونی بانگـەوازی خـوای گەورەیە بۆ ئەوەی بەباشی لەزەویدا بژی و ژیانی لەباخ و باخاتی پڕ نیعمەتدا بێت، ئـەوەش پەرستشـە بـەواتا گشـتگیرەکەی، لەبـەر ئـەوە پەرسـتش لـەکۆتایی ئــەم هێڵکاریــەدا دەبینرێــت، بــەو پێیــەی کەگوزارشــتە لــەتێکڕای مەبەســتی ئاوەدانکاری لەزەویدا.




**٢- نیشتەجێبوون و سەقامگیری و بونیاتنان لەشوێنێکی دیاریکراودا:**

ئاوەدانکاری لەخۆیدا جێگیربوونە لەشوێنێکی دیاریکراو و نیشتەجێبوون تێیداو وازهێنـان لـەژیانی کۆچـەری و گواسـتنەوە لەشـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر و پـەنا بردن بۆ کشتوکاڵ وچاندن و بونیاتنانی خانو و کۆشک و دامەزراندنی کارگـەکان بــۆ دابینکردنــی پێداویســتیەکانی ژیــانێکی جێگیــرو گەشــەپێدانی ئــامراز و کەرەستەکانی، ئـەم جێگیربوونـەش بـەژیان لەگونـدو شـارەکان و بونیاتنـانی خـانو تێیاندا دەبێت، ئەمەش ژیانێکی شارستانییە کەلەئاوەدانی گوندو شـارەکاندا جێگیـر بـبن، لــەبری ژیــانی کۆچــەری گواســتنەوە لەجێگایەکــەوە بــۆ جێگایــەکی دیکــە. لەقورئانی پیرۆزیشدا لەسـەر زاری یوسـف پێغەمبـەرەوە (سـەلامی خـوای لێ بێ) هاتووە کە کۆتایهاتنی خانەوادەی یەعقوب لـەژیانی کۆچـەری وچوونیـان بـۆ شـار

فەزڵ وباشە بووە لەخواوە بۆیان: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ١٠٠﴾ { یوسف: ١٠٠}، واتە: (باوک و دایکی لەسەر تەخت داناو هەموو کەوتن بەڕوودا بۆی بەسوژدە بردنەوە، (یوسف) وتی: ئەی باوکی خۆشەویستم ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەم بوو کەلەمەو پێش (بینیم)، بێگومان پەروەردگارم بەڕاستی گێڕاو بەڕاستی خوا چاکەی لەگەڵ کردم کاتێ لەزیندان دەری هێنام و ئێوەشی لە لادێ وبیابانەوە هێنا، دوای ئەوەی شەیتان ناخۆشی و ناکۆکی خستە نێوان من براکانم، بەڕاستی پەروەردگارم میهرەبانە بەرانبەر ئەوەی بیەوێت، بەڕاستی هەر ئەو زانای کاردروستە)، لەوانەیە ژیانی کۆچەری هەندێ ئاوەدانکاری مادی یاخود مەعنەوی هەبێت، بەڵام وەک ئاوەدانی شار نییە، چونکە زەوی ئەو ناوچانە لەوانەیە بۆ ماوەیەک هەندێ کەسی تیا نیشتەجی بوویێت، پاش چۆڵ دەبێت و کەسی تیا نامێنێت ئاوەدانی بکاتەوە، خەڵکیش ئەم مانای ئاوەدانکاریەیان لەقورئانەوە وەرگرتووەو وتوویانە: ماڵی ئاوەدان، واتە ئەو ماڵەی خەڵکەکەی تێدا نیشتەجێ ببێت و ئاوەدانیش (المعمورة): واتە هەسارەی زەوی پڕ مرۆڤ[1]، ئاوەدانکاریش لەوڵاتدا بڵاو بوویەوە، واتە خەڵکی و خانو وماڵ و نیشتەجێبوانی زۆر بوو.

### ٣- ئاوەدانکاری مادیی:

ئاوەدانکاری مادی زەوی، بریتییە لەلایەنی مادی شارستانییەتی مرۆڤ، ئەمەش دەرئەنجامی کەڵەکەبوونی پسپۆڕی و ئەزموون، لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و گەشەسەندنی مەعریفەی مرۆڤ و دۆزینەوەی یاساو ڕێساکان کەحوکمی شت و دیاردەکان دەکەن ، پاشان سوودمەندبوون لەو دەرفەتانەی دێنە پێش و خۆلادان لەبەربەستەکان دێتە دی ، بەمەش زانستەکان گەشە دەکەن و جێبەجێکردنەکانیان پەرە دەسەنێت و جێگیربوون لەسەر زەوی دێتە دی و زەوی دەکەوێتە خزمەتی و هەڵدەستێت بەبونیاتنانی خانو و تەلارو

---

[1] تا ئێستا بەپێی ئەو زانیاریەی مرۆڤ پێی گەیشتووە زەوی تاکە هەسارەیە خەڵکی لەسەر نیشتەجێ بێت.

کۆشک و ڕێگاوبان و پرد دروست دەکات و کارگەکان دادەمەزرێنێت و کەرەستەو شمەک بەرهەم دێنێت و گەشە بەهۆکارەکانی گواستنەوە دەدات: ئۆتۆمبێل و شەمەندەفەر لەسەر وشکانی و پاپۆڕ لەدەریاداو فڕۆکە لەئاسماندا و ... لەگەڵ دیاردەکانی دیکەی ئاوەدانی و پڕ دەبێت لەشێوازە ئاساییەکانی شارستانییەت، ئەمە وێڕای ئەوەی شارستانییەتی ژمارەییە گریمانەییەکان لەداهێنانی هاوچەرخ پێی گەیشتووە، بەجۆرێک کەخەڵکی بەیەک دەگەن و قسە لەگەڵ یەک دەکەن و زانست و هونەر و بەرهەمەکان ئاڵوگۆڕ دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ یەکێکیان لەژووری خەوتنیان چووبێتە دەر!

ئاوەدانکاری زەویش بەچاککردنی بەچاندن وکشتوکاڵ و گەشەپێدانی ڕێگاکانی ڕۆزی دەبێت، هەتا لەسەر زەویدا هیچ ڕووبەرێک نەمێنێت کەبەرهەم نەهێنرابێت و لەنیو خەڵکیشدا کەسی بێکار نەبێت ، ئاوەدانکردنەوەی زەویش بەبونیاتنان لەسەری و ئاسانکردنی ڕێگاکانی هەوڵدانیش تێیدا لەڕێگەی هۆکارەکانی گواستنەوەو پەیوەندی نێوان ئەوانەی تێیدا نیشتەجێن دەبێت: ﴿أَوَ لَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٩﴾ {الروم: ٩}، واتە: (ئایا ئەوان بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا ببینن سەرئەنجامی ئەوانەی پێش خۆیان چۆن بووە، کەئەوان زۆر لەمان بەهێزتریش بوون، زیاتر لەمانیش زەوییان کێڵاو ئاوەدانییان کردەوە و پێغەمبەرانیان بەموعجیزە ڕوونەکانەوە بۆ هات، بۆیە خوای گەورە ستەمی لێ نەکردوون (کەلەناوی بردوون) بەڵکوو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد).

ئاوەدانکاری زەویش بەئاوەدانکردنەوەی وشکاوی دەبێت، خوای گەورەش وشکانی و دەریای لەحاڵەتی خراپووندا بەهۆی کارەکانی مرۆڤەوە کە لەسەر زەوی ئەنجامیان دەدات پێکەوە هێناوە: ﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٤١﴾ { الروم: ٤١}، واتە: (خراپە لەوشکانی و دەریادا بەهۆی ئەو خراپەکارییانەی خەڵکی کردویانە دەرکەوت، بۆ ئەوەی (تۆڵەی) هەندێ (لەخراپانەی) کردوویانە پێیان بچێژێ، بەڵکو (لەخراپەکاری) بگەڕێنەوە). بۆ دوورکەوتنەوە لەو خراپەکاریانەش،

پێویسته هەروەک چۆن وشكانی ئاوەدان دەكرێتەوە، بەهەمان شێوەش دەریاش ئاوەدان بكرێتەوە. ئەوەی هەندێک لەكۆمەڵگاكانیش پێی هەڵدەستن لەژێرخاكنانی پاشماوەكانی ناوەكی و تیشكدەر لەدەریاو وشكانیدا خراپكردنی وشكانی و دەریایەو ئەو دوكەڵەی كەكارگەو ئامێرەكان بڵاوی دەكەنەوە ئەویش خراپكردنی كەش وهەوایە، ئەمە وێڕای خراپكردنی وشكانی و دەریا.

٤- ئاوەدانكاری رۆشنبیریی و فیكری:

ئەمیش لایەنی مەعنەوی شارستانیەتی مرۆیی دەگرێتەوە، لەئەنجامی گەشەسەندنی ئەزموونی كۆمەڵ و گەلەكان لەوەی پەیوەنداره بەرێكخستنی كاروبارەكانی ژیانی كۆمەلایەتی و ژیانی ئابووری و ئەو رێساو سیستەمانەی كەپەیوەندییەكانی نێوان خەڵكی نیشتەجێی یەک جێگا رێک دەخات دێتەدی و رۆشنبیرییەكان دروست دەبن و داب ونەریتەكان دەچەسپێن و بەمەبەستی هێنانەدی ئاسایش وسەقامگیری خەڵكی ملكەچبوون بۆ دەسەلاتی كارگێڕی و فەرمانڕوایی قبوڵ دەكەن. لەوانەیە ئەو توانایانەی كەخوای گەورە بەمرۆڤی بەخشیووە بەسەر تەواوی دروستكراوەكاندا تەنانەت فریشتەكانیش، ئەوكاتەی هەموو ناوەكانی فێركرد، بەشێک بێت لەپرۆسەی نیشتەجێبوون لەزەویدا، هەتا بتوانێت ئەركی ئاوەدانكاری بەجێ بگەیەنێت، لە لایەنە مەعنەوی و رۆشنبیرییەی شارستانیەتی مرۆییەوە.

خوای گەورە كاتێ ستایشی ئەو كەسانە دەكات كەماڵەكانی خوا ئاوەدان دەكەنەوە، لەبەرانبەر ئەوەدا لۆمەی ئەوانە دەكات كەهەڵدەستن بەوێرانكردنی: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾﴾ {البقرة: ١١٤}، واته: (كێ لەوكەسە ستەمكارترە، كەرێگری لەمزگەوتەكانی خوا دەكات، لەوەی كەناوی خوایان تێدا ببرێ و هەوڵ دەدات بۆ وێران كردنیان، ئەوانە بەترسەوە نەبێت بۆیان نییە بچنە مزگەوتەكانەوەو لەژیانی دونیادا ریسوایی بۆ ئەوانەو لەرۆژیی دوایشدا سزای گەورەیان بۆ هەیە)، هەروەها خوای گەورە هەندێ رێسای لەژیانی مرۆڤدا چەسپاندووە كەحیكمەتی دروستبوون و هەمەچەشنەیی و جیاوازی دێنێتە دی، لەوانە رێسای

بەیەکداپژان (التدافع) لەنێوان خەڵکیدا، ئەمەش سونەتێکە ئەو ماڵانەی خوای گەورە دەپارێزێت کە بۆ پەرستش و یادکردنەوەی بونیات نراون لەوەی کە هەرکە بونیات نرا وێران بکرێت: ﴿ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًاۗ﴾ { الحج: ٤٠}، واتە: (ئەوانەی بەناهەق لەماڵ و وڵاتیان دەرکران، تەنها گوناهیان ئەوە بوو کەدەیان وت پەروەردگارمان خوایە، ئەگەر خوا خەڵکی لەناو نەبردایە هەندێکیان بەهەندێکی تریان، بێگومان دەڕوخێنرا دێر (خەڵوەتگە)و کڵێساو کەنیسەو مزگەوتەکان کەیادی خوا (لەو پەرستگایانەدا) زۆر دەکرا، بێگومان خوا یارمەتی کەسانێک دەدات کەیارمەتی (دینی) خوا دەدەن، بەڕاستی خوا بەهێز و باڵادەست وبەتوانایە)، هاندانی خوای گەورەش بۆ ئەوەی بەندە باوەڕدارەکانی بەرەنگاری دوژمنەکانیان ببنەوە، دەبێتە هۆی مانەوەی ئەو دامەزراوانەی کەخەڵکی بۆ خواپەرستی بونیاتیان ناوەو خەڵک بەپەرستش و یادی خوا ئاوەدانی دەکەنەوەو وێران نابێت، یاخود ئاوەدانییەکەی ڕاناوەستێت. هەروەها هاندانی خوای گەورە بۆ هێزی چاکە بۆ بەرەنگاربوونەی هێزی خراپەکاری وستەم، دەبێتە هۆی ئاوەدانبوونی وڵات بەئاسایش و دادپەروەری و بەدیهاتنی شێوەکانی ئاوەدانکاری.

لەو سونەتانەش کۆبوونەوەی خەڵکی لەسەر سیستەم ویاساکانی ڕێکخەری کاروبارەکانیان ، بەوەش ڕازی دەبن بەفەرمانڕەوایەک کەکاروبارەکانیان بەڕێوە ببات ، فەرمانڕەواش پەنا بۆ ڕاوێژ لەگەڵ کەسانی پسپۆڕ دەبات کەلەلایەن خەڵکییەوە هەڵدەبژێردرێن و بۆچوونی خۆی ناسەپێنێت و لەنێوان خەڵکیشدا دادوەر و قازی دادەنرێت کەناکۆکی و ململانێکانیان یەکلا بکەنەوەو مافەکانیان ڕێکبخەن.

لەو سونەتانەش جیاوازی خەڵکی لەبەدەستهێنانی زانین ومەعریفەدا، هەربۆیە ئەوانەی زانینیان کەمە پرسیار لەوانە دەکەن کەزانینیان زیاترە، بەمەش قوتابخانەو زانکۆکان و پەیمانگاکانی پێگەیاندن و توێژینەوەو مەڵبەندەکانی لیکۆڵینەوە و چارەسەری کێشەکان دروست دەبن، هەموو ئەمانەو هاوشێوەکانی لەدیاردەکانی گەشەو پێشکەوتنی ئاوەدانی فیکرو ڕۆشنبیری و ڕێکخستن و کارگێڕین، چونکە خەڵکی شانازییان پێوە دەکەن و

ڕکابەرییانـە لەسـەری  و بـەگوێرەی ئـەوەی بەدەسـتی دەهێـنن تێیـدا پـۆلێن دەکـرێن، هەیانـە لـەوڵاتانی جیهـانی یەکەمـە لـەڕووی پێشـکەوتنیەوە، هەشـیانە لەوڵاتانی جیهانی سێهەمە لەدواکەوتنیدا.

لەسونەتە جێگیر و یاسا چەسپاوەکانیش کەژیانی خـەڵکی بـەگوێرەی ئـەوان لەسـەر زەوی بـەڕێوە دەچێـت، ئەوەیـە کـە ئاوەدانکـاری وڵات و وێرانبـوونی، خۆشـی و ناخۆشـی ژیـان، دەرئـەنجامی کـردەوەو هەڵسـوکەوتەکانی مرۆڤـە، قورئـانی پیـرۆزیش بەسـەرهاتی گـەلانێک بۆمـان باسـدەکات کەگەیشـتبوونە ئـاوەدانیی مـادی و مەعنـەوی زۆر، بـەڵام سوپاسگوزاری خـوا نـەبوون لەسـەر ئـەو نیعمەتـە، پشـتیان بەسـتەم بەسـت، سـتەم لـەخۆ و سـتەم لەکەسـانی تـر، سـونەتەکانی خـوای گـەورە بڕیـاری بەلـەناوچوونی ئـەو خەڵکـە بـوو بـەهۆی سـتەمکردنیانەوەو ئیـدی وڵات و ناوچەکـەیان وێـران و خـاپوور بـوو بەسـەر یەکـداو رووکارەکـانی شارسـتانی و ئاوەدانکـاریش مادییـەو رۆحـی تیـا نییـە، هەربۆیە ئەو کۆشک وتەلارانەی بونیاتیان نابوو هێشتا ماوە، بـەڵام ئـەو خەڵکە ستەمکارەی تێیاندا نیشـتەجێ بـوو نـەماون، کۆشـک یـاخود ئاوەدانکارییەکـەیان دادی نەدان و فریایان نەکەوتن. بەڵام ڕووکاری شارستانی و ئاوەدانی، کە ئـاو رۆحیـەتی، هـەتا ئێسـتاش بـۆ بـەکارهێنان دەسـت دەدات، بـەڵام لەکارکـەوتووە، چونکە هیچ مرۆڤێک نابینی بەکاری بێنێت و لێی سوودمەند بێت و وەک شاهێد لەســەر ئــەوەی خەڵکەکــەی ئــەو شــوێنە لــەئاوەدانیی پێــی گەیشــتوون و نـەیانتوانیووە بیپـارێزن و ئـەو نیعمەتانـەی هـەیان بـووەو سوپاسـگوزاری خـوا نەبوون لەسەری ماوەتەوە: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئۡرٖ مُّعَطَّلَةٖ وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ ٤٥﴾ { الحـج: ٤٥}، واتـە: (چەنـدەها شـارو شارۆچکەمان لەناوبرد لەکاتێکا دانیشـتوانی سـتەمکار بـوون، (ئەوەتـە دەبینیت) خانووەکانیـان بەسـەریەکدا تـەپیووە، بیـری ئـاوی لـەکارخراو کۆشـک وتـەلاری بەرزو بڵندی زۆریشمان بەچۆڵی هێشتووەتەوەو بێ خاوەن ماوەتەوە).

تیـاچوون لێرەدا، وێرانبـوونی خـانو و کۆشـکەکان  بـەهۆی بومەلەرزەیـەکی وێرانکـارەوە ، یـان دەرئـەنجامی لەکارکـەوتنی هۆکـارە بنەڕەتییـەکانی ژیـان نـەبووە، وەک نـەمانی سـەرچاوەکانی ئـاو: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا

يُؤۡمِنُونَ ۝٣٠﴾ { الانبياء: ٣٠}، واته: (ئێمه لەئاو هەموو شتێکمان فەراهەم هێناوه)، ئەو لەناوچوونەی تووشی خەڵکی بووه، ئاوەدانییه مادییەکەی هەر ماوەتەوه، هۆکارەکانی ژیانیش ماوەتەوه هێشتا دەستەبەر و زۆره. لەوانەیه ئەم حەقیقەته ڕاڤه بێت بۆ ئەو حاڵەتەی کەهەندێک کۆمەڵگای عەرەبی وئیسلامی بەدەستییەوه گیرۆدەیه، لەکاتێکدا زۆرێک لەڕووکارەکانی ئاوەدانی مادی وهۆکارەکانی خۆشگوزەرانی ژیانی مادییان تێدا دەستەبەره، بەڵام خەڵکەکەی پەنایان بۆ ژیانی تەمبەڵی و بەکاربردن و پشت بەستن بەکەسانی تر لەدابینکردنی هۆکارەکانی ژیان بردووه و هیچ توانایەکیان نییه بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنەکەیان و هیچ بەرهەمێکیان نییه تا پێویستیان بەبەرهەمی خەڵکی تر نەبێت و لەحوکمڕانیشدا سیاسەتێکی دادپەروەرانه پەیڕەو ناکەن تا سەقامگیری وئاسایشیان بۆ دابین بکات و گیانی پەیوەستبوون بەکۆمەڵگاو سووربوون لەسەر بەهێزکردنی تیایاندا بچێنێت و سیستەمێکی دادپەروەریان لەئابووریدا نییه، کەهەلی کار بۆ خەڵکی دەستەبەر بکات و ئامانجی هاریکاری پرۆژه لەپێشه پێویستەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و پیشەسازی بێت.

لەمجۆره واقیعەدا ژیان لای زۆرێک لەخەڵکی وەک حاڵەتی "لەناوچوون" و "کەوتن"ی لێهاتووه. لەبری ئەوەی کەژیان پڕ بێت لەکردەوەی چاک و هەوڵ وکۆششی چاکەخوازانه و بەخشینی بەردەوام و ئومێدی فراوان و بەشداریکردنی داهێنەرانه، کەبەهۆی ئەوانەوه پێگەیەکی پێشکەوتوویان لەشارستانییەتی هاوچەرخدا هەبێت، یاخود لانی کەم بەشداری کاراو پشکداری باشیان هەبێت تێیدا، ژیانییان پڕ بووه لەسکاڵاو ئیرەیی و نەفرین لەیەککردن و تۆمەت لەیەکدان، بەجۆرێک کە گەیشتونەته حاڵەتی بێئومێدبوون لەتوانای چارەسەرکردنی، چونکه ئەوان تیاچوو و مردوون و پەیکەری بێ رۆحن لەم ژیانەدا.

## مانابەخشینەکانی ئاوەدانکاری لەزمانی قورئاندا

| ژمارە | مانابەخشی ئاوەدانکاری | ئەوەی بەرانبەر ئەم واتایە هەیە |
|---|---|---|
| ١ | ژیان، ژیانی مرۆڤی تاک و لەبەرانبەریدا مردن و ژیانی ئومەت هەیە، بەئامادەبوونی کارایەوە و ژیانی مرۆیش لەدونیادا | لەبەرانبەریدا مردنی تاک و ئامادەنەبوونی شارستانیی ئومەت و لەناوچوونی کۆتایی و دەستپێکردنی ژیانی قیامەت هەیە |
| ٢ | نیشتەجێبوون لەجێگایەکدا (شارو گوندەکان) و سەقامگیربوون و بونیاتنانی خانو ئاوەدانکردنەوەی ئەم هەسارەیەی کەمرۆڤی تێدا نیشتەجێیە | لەبەرانبەریدا گواستنەوەو حاڵەتی چوونی بەردەوام، یاخود نەبوونی خەڵک لەشوێنێک یان وێرانبوونی |
| ٣ | ئاوەدانکاری مادی، دروستکردنی باڵەخانەو کۆشک و کردنەوەی ڕێگاو دروستکردنی پردو گەشەپێدانی هۆکارەکانی گواستنەوەو کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی | زەوی لەکارکەوتوو لەبەرهەمهێنان و بێکاری و دەستەوسانی ونەخۆشی و هەژاری |
| ٤ | ئاوەدانیی رۆشنبیری و فیکری: گەشەپێدانی زانستەکان و بونیاتنانی دامەزراوەکان و دانانی یاساو سیستەم و گەشەی رۆشنبیری و قبوڵکردنی ملکەچبوون بۆ دەسەڵاتی کارگێڕی و حوکم | سەروەری نەزانین و نەخوێندەواری و ئاژاوەو خراپەو ستەمکاری |

**دووەم: ئاوەدانکاری لەزمانی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە (د.خ)**

وشـە داتاشـراوەکان لـەڕەگی (عَمَـرَ) لـە سـی ودوو سـتوونی کتێبـی (المعجـم المفهـرس لألفـاظ الحـديث النبـوي)دا هـاتووە کـە رۆژهەڵاتناسـی هۆڵەنـدی (ئارنـدجان فنسـنک) بـڵاوی کردوەتـەوە و (موحەمـەد فوئـاد عبـدالباقی) لێـی کۆڵیوەتـەوەو لەهـەر سـتوونێکدا نزیکـەی سـی فـەرموودە لەگێڕانـەوەکانی نـۆ کتێبەکەی فەرموودە هەیـە: هـەردوو صـەحیحەکەی (بوخـاری و مسـلم)و چـوار سـونەنەکە: ترمـزی و نەسـائی و ئیبن ماجە و ئـەبو داود و (موطأ)ی مالیک و مەسـنەدی ئەحمـەد و سـونەنی دارمـی. بـەڵام پۆلێنی بابـەتی بۆ دەقـەکانی ئـەو فەرموودانـەی لـەو نـۆ کتێبـەدا هـاتووە بـەپێی سـەرژمێری ئـەو فەرهەنگـەی باسمان کرد تەنها چەند واتایەکی دیاریکراو دەگەیەنێت، هەمان ئـەو مانایانـەیان هەیـە کەلـەقورئانی پیـرۆزدا هـاتبوو تـەنها ئـەوەیان نـەبێت لـەبارەی (العمـری) بـەمانای ئـەو بەخشـیینە هـاتووە کەئـەو کەسـەی ئـاوەدانی دەکاتـەوە دەبێتـە خاوەنی، هەربۆیە هی ئـەوەو ئـاوەدانی دەکاتـەوەو بـەکاری دەهێنێـت وسـوودی لێ وەردەگرێت. بەڵام زیندەوەرەکانی نێو ماڵ (الحيات العوامر) مانەکەی دوور نییە لەئاوەدانکاری ماڵ بەمانای نیشتەجێیەکان تێیدا.

١. تەمەن (**العُمُر**)بەواتای ئەو کاتەی کە لـەژیانی تـاک تێدەپـەڕێت: بوخـاری دەروازەیەک لەدەروازەکانی کتێبی (الرقاق) ناوناوە: (کتاب الرقـاق، بـاب مـن بلـغ سـتين سـنة فقـد عـذر اللـه إليـه فـى العمـر). تێیدا فەرموودەیـەک هـاتووە کەئەمـە دەقەکەیـەتی: "لەئـەبو هـورەیرەوە، پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: "أعـذر اللـه إلـى امـرىء أخـر أجلـه حتـى بلـغ سـتين سـنه"[(١)]، واتـە: (خوای گەورە پاساوی بۆ کەسێک نەهێشتووەتەوە کەئەجەلەکەی دوا خستبێت تـا گەیشـتبێتە تەمـەنی شـەسـت سـاڵی)، لەئەنەسیشـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گێڕاویانەتـەوە، وتوویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرموویەتی: "يكبر إبن ادم ويكبر معـه اثنـان: حب المـال وطـول العمـر"[(٢)]، واتـە:

---

[(١)] البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، کتاب الرقاق، باب من بلغ ستيتن سنة، حديث رقم ٦٤١٩، ص ١٥٩٩.

[(٢)] سەرچاوەی پێشوو، کتاب الرقاق، باب من بلغ ستيتن سنة، حديث رقم ٦٤٢١، ص ١٦٠٠.

(ئادەمیزاد گەورە دەبێت و دوو شتیش لەگەڵیدا گەورە دەبن: خۆشەویستی ماڵ وسامان و تەمەن درێژی).

٢. یاخود ماوەی درێژ: (مكث معه عمرا) واتە: تەمەنێكی درێژی لەگەڵ بەسەر برد. ئەبو معاویە گێڕاویەتیەوە، ئەعمەش لەعومارەو ئەویش لە ئەبو شەعسائەوە، دەڵێت: چووم بۆ حەج هەتا گەیشتمە كەعبە، كە گەیشتمە نێوان دووستوونەكە، چووم هەتا لەلای دیوارەكە ڕاوەستام، ئیبن عومەر هات و لەتەنیشتمەوە چوار ڕكات نوێژی كرد، كە لەنوێژەكەی بوویەوە وتم: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) لەكوێی كەعبەدا نوێژی دەكرد، وتی: ئوسامەی كوڕی زەید هەواڵی پێداوم كە ئالێرەدا نوێژی دەكرد، وتم: چەند نویژی دەكرد؟ وتی: وەک دەبینی سەرزەنشتی خۆم دەكەم كەعومرێک لەگەڵی ژیام و لێم نەپرسی چەند نوێژی دەكرد..." [(١)].

٣. سوێندخواردن بەعومر: لەعەرەبیدا دەڵێن (لعمرک ولعمر الله). لە (عبید اللە كوڕی عبداللە)ەوە، گێڕایەوە: ژمارەیەک لەفەرموودەگێرەوان بۆیان باسكردم، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هەستایەوە و پۆزشی بۆ (عبدالله كوڕی ئوبەی) هێنایەوە، (أسید كوڕی حضیر) هەستایەوە، (سعد كوڕی عبادة) وتی: "لعمر الله لأقتلنه"[(٢)].

٤. ئاوەدانكاری (العمران) كەپێچەوانەی وێرانكارییە: لە (یەحیای كوڕی سەعید)ەوە، ئەبوبەكری صدیق چەند سوپایەكی نارد بۆ شام، لەگەڵ یەزیدی كوڕی ئەبو سوفیاندا ڕێی دەكرد، كەئەمیری چارەكێكی ئەو چوار سوپایە بوو دەڵێن گوایە كە یەزید بەئەبووبەكری وتووە: یان ئەوەتا تۆش ئەبێت سوار بیت، یان منیش دێمە خوارەوە، ئەبووبەكر وتوویەتی: نەتۆ دادەبەزیت و نەمنیش سوار دەبم، ئەم هەنگاوانەم لەپێناوی خوا دادەنێم، پاشا پێی وت: "بەخەڵكانێک دەگەیت وا دەزانن خۆیان لەپێناوی خوادا بەند كردووە (مەبەستی

---

(١) بن حنبل، الامام أحمد. مسند الامام أحمد بن حنبل، تحقیق: شعیب الارنؤوط واخرون، بیروت: مؤسسة الرسالة، ٢٠٠١م، مسند النساء، حدیث: أم كرر الخزاعیة رضی الله عنها، ج٤٥، حدیث رقم ٢٧٦٣٣، ص ٦٠٤.

(٢) البخاري، صحیح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، كتاب الایمان والنذور، باب قول الرجل لعمر الله، حدیث رقم ٦٦٦٢، ص١٦٥٠.

روهبانەکانـە)، لێیـان گـەڕێ بـا بـەوجۆرە بـن کـە خۆیـان تێگەیشـتوون، ئـەوان خۆیان بۆ خوا بەند کردووە، پاشان کەسانێک دەبینی کە قژیان لەتەوقە سـەردا وەک هێلانە (قۆچکە تاش) لێکردووە (مەبەستی ئەوەیە ئەوانە سەرکردەکانی بێباوەڕانن)، ئەوەی کەهێشتبوویانەوە بەشمشێر قژەکەی بەشمشێر ببڕە، من دە ڕاسـپاردەم بـۆت هەیـە: ئـافرەت و منـاڵ و پیـری پەککەوتـە مـەکوژە، داری بـەردار مـەبڕەوە، ئـاوەدانی وێـران مەکـە، مـەڕ و وشـتر مـەکوژەوە مەگـەر بـۆ خـواردن پێویسـتتان بێـت، شـانەی هـەنگ مەسـووتێنە و مەیخـەرە ئـاوەوە، غەنیمەتیش پێش دابەشکردنی لێی هەڵمەگرە، ترسنۆکیش مـەبە (واتـە لـەدوژمن مەترسە) [(١)].

٥. ئاوەدانکـاری ڕۆح بـۆ جەسـتە یـاخود بـۆ ژیـان: لەئـەبو هـورەیرەوە، دەگێڕێتـەوە: (کـاتێ ڕۆحـی بـاوەڕدار دەردەچێت دوو فریشـتە پێـی دەگـەن و بەرزی دەکەنەوە، حەماد وتی: باسی خۆشی بۆنەکەی کرد و ناوی میسکیشـی برد، دەڵێت: خـەڵکی ئاسـمان دەڵێن ڕۆحێکی بـاش لەزەوییـەوە هـاتووە، درووود لەسـەر تۆ و ئەو جەستەیەش بێت کەئاوەدانت دەکردەوە..." [(٢)].

٦. ئاوەدانکاری دڵەکان و ماڵەکان بەقورئان: (معلي کوڕی أسد) لـە (سـلام واتە ابن أبي مطیع)ەوە گێڕایەوە بۆمـان: قـەتادە دەیـووت: " دڵتـانی پـێ ئـاوەدان بکەنەوەو ماڵەکانتانی پـێ ئـاوا بکەنـەوە، دەڵێت: وای دەبینم مەبەسـتی: قورئـان بوو"[(٣)].

٧. ئاوەدانکردنـەوەی مزگەوتـەکان واتـە دروسـتکردنی مزگـەوت یـاخود ئامـادەبوون بـۆ نـوێژ و وانـەکانی زانسـت تێیدا: لـە (نعمـان کـوڕی بشـیر): لای

---

[(١)] بن أنس، مالک، موطأ الامام مالک، تحقیق: محمد فؤاد عبدالباقي، القاهرة: مصطفی البابي الحلبي، ١٩٨٥م، کتاب الجهاد، باب النهي عن قتل النساء والولدان في الغزو، ج٢، حدیث رقم ١٠، س ٤٤٧-٤٤٨.

[(٢)] الامام مسلم، صحیح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، کتاب الجنة، باب عرض مقعد المیت من الجنة أو النار علیه، حدیث رقم ٢٨٧٢، ص١١٥١.

[(٣)] الدارمي، عبدالله بن عبدالرحمن، مسند الدارمي، المعروف بسنن الدارمي. تحقیق حسین سلیم الداراني، الریاض: دار المغني، ١٤٢٠ هـ کتاب فضائل أهل القران، باب في تعاهد القران، حدیث رقم ٣٣٨٥، ص٣٧٥.

مینبەرەکـەی پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لـێ بـێ) بـووم، پیاوێـک وتـی: بەلامەوە گرنگ نییە پاش موسڵمانبوون هیچ کارێکی دیکە بکەم جگە لەئاودان بەحاجییەکان، یەکێکی تر وتی: بەلامـەوە گرنـگ نییـە پـاش موسـڵمانبوون هـیچ کـارێکی دیکـە بکـەم جگـە لەئاودانکردنـەوەی کەعبـە، یـەکێکی دیکـە وتـی: جیهادکردن لەپێناوی خوا باشترە لەوانەی کـەئێوە وتتـان، عومـەر سـەرزەنشـتی کردن و وتی: دەنگتان لای مینبـەری پێغەمبـەری خـوادا (درودی خـوای لەسـەر بێ) بـەرز مەکەنـەوە، ئەمـە لـەڕۆژی هەینیـدا بـوو بـەڵام کەلـەنوێژی هـەینی بوویەوە چوومە لای و لەبارەی ئەوەی ناکۆک بوون لەسەری پرسیارم لێکرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خـوارە: ﴿أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ تـا کۆتـایی ئایەتەکە،{التوبـة: ١٩}، واتـە: (ئایـا پێتان وایە ئاودان بـەحاجییان و سـەرپەرشـتیکردنی ئاوەدانکردنـەوەی مزگـەوتی حەرام وەکو کەسێکە کەباوەڕی هێنا بێت بەخوا و بەڕۆژی دوایی) [١].

٨. ڕێگایەکی ئاوەدانی بەکارهاتووی تەختکراو ، پرسیاری لـێ کـردو وتـی: ئـەگـەر شـتێک لەڕێگایـەکی ئاوەدانـدا بدۆزینـەوە چـی لـێ بکـەین، فـەرمووی: بـۆ مـاوەی سـاڵێک بانگـەوازی بـۆ بکـە، ئەگـەر خاوەنەکـەی نـەهات، ئـەوا بـۆ خۆتـە. وتـــی: ئـــەی پێغەمبـــەری خـــوا ئـــەی ئـــەوەی کەلەویرانـــەی ئاســـاییدا هەیـــە بدۆزرێتـەوە، فـەرمووی: ئـەوەی تێیدایـەو ئـەوەی لەژێریـدا دەدۆزرێتـەوە ئـەوا پێنج یەکی لێ دەردەکەیت[٢].

٩. ئـاوەدان بـەو زیندەوەرانـەی کەلەگـەڵ مرۆڤـدا لەماڵەکانـدا دەژیـن، (عبدالله) دەڵێت: لەکاتێکدا بەشوێن مارێکەوە بووم تـابیکوژم، (أبـو لبابـة) بـانگی کردم: نەیکوژیت، وتم: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێ) فەرمانی کردووە

[١] الامام مسلم، صحیح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، كتاب فضائل الامارة، باب فضل الشهادة في سبيل الله،، حديث رقم ١٨٧٩، ص٧٨٣.

[٢] ابـن حنبـل، الامـام أحمـد. مسـند أحمـد بـن حنبـل، الريـاض: دار الافكـار، ١٩٩٤م ، حـديث رقـم ٦٨٩١، ص٥٢٣.

بەکوشتنی مار، وتی: پاش ئەوە نەهی کردووە لەکوشتنی ئەو زیندەوەرانەی لەماڵدا دەژین، ئەوانیش ئاوەدانکەرەوەن"[١].

١٠. خانەی ئاوەدان (بيت المعمور) لەئاسمانی حەوتەم: "لەئەنەسەوە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ... ئەمجا چووینە ئاسمانی حەوتەم... چوومە لای ئیبراهیم و سڵاوم لێ کرد، وتی: بەخێر بێیت وەک رۆڵەم وەک پێغەمبەر، (بيت المعمور)م بۆ بەرزکرایەوە، پرسیارم لەجبریل کرد، وتی: ئەمە (بيت المعمورة)، هەموو رۆژێک حەفتا هەزار فریشتە نوێژی تێدا دەکەن، کەدەچنە دەرەوە ئیتر نایەنەوە ناوی ..." [٢].

١١. بەواتای عومرە کە هاوشێوەی حەج زیارەتی کەعبەی پیرۆز دەکرێت: لەئەبو هورەیرەوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: "العمرة إلى العمرة كفارة لما بينهما والحج المبرور ليس له جزاء الا الجنة"، واتە: (عومرەیەک تا عومرەیەکی تر دەبێتە کەفارەتی نێوانیان و حەجی مەبروریش پاداشتەکەی تەنها بەهەشتە) [٣].

١٢. زەوییەکی ئاوەدانکردەوە وئەرکی ئاوەدانییەکەی گرتە ئەستۆ، واتە چاککردن و بەکارهێنانی: لەعائیشەوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: "من عمر أرضا ليست لاحد فهو أحق بها"، واتە: (هەرکەس زەوییەک ئاوەدان بکاتەوە کەهی کەس نەبێت، ئەوا ئەو لەپێشترە بۆی) [٤].

---

[١] البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، كتاب بدء الخلق، باب قوله تعالى: "وبث فيها من كل دابة"، حديث رقم ٣٢٩٨، ص٨١٢.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، كتاب بدء الخلق، باب ذكر الملائكة، حديث رقم ٣٢٠٧، ص٧٩٣.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، كتاب العمرة، باب العمرة: وجوب العمرة وفضلها، حديث رقم ١٧٧٣، ص٤٢٧.

[٤] بن حنبل، الامام أحمد، مسند الاما أحمد بن حنبل، المعروف . تحقيق: شعيب الاناؤوط واخرون، بيروت: مؤسسة الرسالة، ٢٠٠١م، مسند عائشة، ج٤١ ، حديث رقم ٢٤٨٨٣، ص٣ ٧٥. فەرموودەی دیکەش زۆرە: (من أحيا أرضا) بوخاری لەصەحیحەکەیدا (٨٣٢/٢) هێناویەتی: (باب من أحيا أرضا مواتا) ئاشکرایە کەئاوەدانکردنەوەی زەوی یاخود بونیاتنانەوەی واتە چاککردنەوەی

١٣. خوای گەورە بە مرۆڤ زەویی ئاوەدان کردەوە و دوای لێکرد بنیاتی بنێت و ئاوەدانی بکاتەوە: پێشەوا بوخاری واتای (العمرى) لەو فەرموودەیەدا ڕوون کردووەتەوە کە(باب)ەکەی بەم وتەیە دەستپێکردووە: (دەروازەی ئەوەی سەبارەت بە (العمرى و الرقبى) گوتراوە، (عمرى) واتە ماڵەکەی پێ ئاوەدان کردەوە، کردییە هی ئەو (استعمركم فيها) واتا بەئێوە ئاوەدانیکردەوە. لە فەرموودەشدا هاتووە لە جابرەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بڕیاری لەسەر (عمرى-پێ ئاوەدانکردنەوە) داوە کە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە [1].

١٤. (العمرى-پێ ئاوەدانکردنەوە) بەخشین ودیارییە، دەوترێت: ماڵێک یاخود زەوییەکی پێ ئاوەدان کردەوە، ئەگەر پێی بەخشی، منیش پێم وت: ئەوە بۆ تۆیە تا لەتەمەندا بم یاخود تا تۆ لەژیاندا بیت، جا ئەگەر مردیت ئەوا دەگەڕێتەوە بۆم، لە(جابری کوڕی عبداللە ئەنصاری)یەوە، هەواڵی پێداوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "أيما رجل أعمر رجلا عمرى له ولعقبه، قال: قد أعطيتكما وعقبك مابقي منكم أحد، فإنها لمن أعطيها لاترجع إلى صاحبها من أجل أنه أعطاها عطاء وقعت فيه المواريث"[2]، واتە: (هەر کەسێک کەسێکی دیکەی کردە ئاوەدانکەرەوە، ئەوا ئاوەدانکرنەوەکە بۆ خۆی و بۆ ئەوانەشە کە لەدوای دێن، دەڵێ: بەخشیم بە تۆ و بەوانەش لەدوای تۆ دێن هەتا کەسێکتان مابێ، ئەوا بۆ ئەو کەسەیە کە پێی دراوە و ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە کە پێی دراوە کەوتوەتە ناو میراتییەکان).

---

پاش وێرانبوونی یان زیندوو کردنەوەی پاش مردنی، هەربۆیە ئاوەدانکاری و ئاوەدانکردنەوە لێرەدا بەرانبەر مردون وێرانبوونە.

[1] البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، كتاب الهبة، باب ماقيل في العمرى والرقبى، حديث رقم ٢٤٨٢، ص٦٣٦.

[2] الامام مسلم، صحيح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، كتاب الهبات، باب العمرى ، حديث رقم ١٦٢٥، ص٦٦٤.

## سێهەم: ئاوەدانكاری خەلدونی (العمران الخلدوني):

ئیبن خەلدوون ئەم زاراوە قورئانییەی هێناوە: (العمران)، بەڕادەیەكی زۆر لە فیقهی ئاوەدانكاری (فقه العمران) تێگەیشتووەو لەزۆر واتای ئاگادار بووە كە ئەوانەی پێش ئەم لێی بێئاگابوون، لەوانەیە زۆر لەوانەشی كەپاش ئەمیش هاتوون زۆر لێی بەهرەمەند نەبوون. ئیبن خەلدوون (ساڵی ٨٠٨ كۆچی كۆچی دوایی كردووە) كتێبی مێژووی ناسراو بە: "كتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر في أخبار العرب والعجم والبربر ومن عاصرهم من ذوي السلطان الأكبر"، پێشەكییەكیشی بۆ ئەم مێژووە نووسی، كەكتێبەكە بەناوی (مقدمة) ناسراوە تا "كتاب العبر"، لەكاتێكدا كە ئەوە پێشەكی بوو بۆ كتێبێكی مێژوو كەئەوەش زانستێكی ناسراو بووە لەسەردەمی ئەو و پێش ئەویشدا، چەند بەشێكی جۆراو جۆری لەخۆ گرتووە، ئەمەش وای لەتوێژەرانی ئێستا كردووە كەبە بابەتەكانی زانستە كۆمەڵایەتی ومرۆییەكانی دابنێن، كەبەشێوەی زانستی سەربەخۆ زۆر پاش ئیبن خەلدوون دانران.

ڕێبازی جۆراو جۆر هەیە لەتوێژینەوە خەلدوونیەكاندا بۆ هەڵسەنگاندنی ئەوەی ئیبن خەلدوون لە (مقدمة)دا نووسیوویەتی، توێژەران بەدامەزرێنەری زانستی كۆمەڵناسی و زانستی سیاسەت و زانستی پەروەردەو زانستی ئابووری و زۆر زانستی دیكەیان داناوە[1]. لەگەڵ ئەوەشدا مێژوونووسی بەریتانی ئارنۆڵد توینبی لەوانەیە زیاتر وردتر بووبێت كاتێك كتێبی (مقدمة)ی ئیبن خەلدونی بەفەلسەفەی مێژوو داناوە و بەكارێكی داهێنەرانەی بێ وێنەی ئەژمار كردووە كەپێش ئەو نەبووە، لەمبارەیەوە نووسیویەتی: "لەڕاستیدا ئیبن خەلدوون تاكە خاڵی درەوشاوەی ئاسمانی سەردەمەكەیەتی، بەڵكو تاكە كەسی داهێنەرە لەمێژووی شارستانێتەكاندا... وادیارە لەهەڵبژاردنی بواری چالاكی فیكریدا لەژێر كاریگەری كەسی پێش خۆیدا نەبووە،... تێڕوانینی وابووەو لەدانانی كتێبەكەیدا (المقدمة) فەلسەفەیەكی بۆ مێژوو دامەزراندووە كەبێگومان مەزنترین كاری لەم شێوەیەیە كەهەر عەقڵێك بتوانێت لەهەر كات و لەهەر شوێنێك ئەنجامی بدات"[2].

---

[1] ملكاوي، فتحي حسن. "ملحوظات حول الدراسات الخلدونية"، گۆڤاری: إسلامية المعرفة، ژمارە: ٥٠، پاییزی: ٢٠٠٧ز، ل ٧-١٥.

[2] Tonybee, Arnold. A Study of History: The Growths of Civilizations. New York: Oxford University Press, 1962, Vol. 3, p. 321-328

ئیبن خەلدوون تێگەیشتنی قورئانی بۆ ئاوەدانکاری (عمران) وەرگرتووەو کردویەتی بەئاماژەیەک بۆ زانستێکی نویٚ کە لەژیانی خەڵک و ئەو گۆڕانکاری و شتانەی بەسەر ئەم ژیانەدا دێت و ئەو پەیوەندیی و دامەزراوانەی تێیدا دروست دەبێت دەکۆڵێتەوە و ناوی لێناوە زانستی ئاوەدانکاری مرۆیی (علم العمران البشري)، یاخود زانستی کۆمەڵناسی (علم الاجتماع)، یان حاڵەتی شارستانییەت (حالة الحضارة). لەڕاستیدا ئیبن خەلدوون لەدایکبوونی زانستی ئاوەدانکاری ڕاگەیاند و نەخشەی پرۆگرامەکەی دارشت و داوای لەوانە کرد کەلەپاش ئەم دێن توێژینەوە لەبابەت و باسەکانی تەواو بکەن و لەمبارەیەوە دەڵێت: "...بڕیارمانداوە لەسەر ئەوەی لەم کتێبی یەکەمەدا جڵەوی قسەکانمان بگرین، کەئەویش لەبارەی سروشتی ئاوەدانکاری و ئەوەی دەیگرێتەوەیە... بەڵکو ئەوەی پاش ئێمە دێت لەوانەی باوەڕیان بەبۆچوونێکی دروست و زانستێکی ڕوون هەیە لەبابەتەکانی زیاتر لەوەی ئێمە خستومانەتە ڕوو بکۆڵنەوە، چونکە ئەو کەسەی هونەرێک دابهێنێ لەسەری نییە سەرژمێری بابەتەکانی بکات کە ئەوەندەیە، بەڵکو لەسەریەتی بابەتی زانستەکە و جۆراو جۆری بەشەکانی و ئەوەی قسەی تێدا دەکات دیاری بکات و ئەوانەی پاشتری بابەتەکان شتێ پاش شتێ دەگەیەننە ئەوانەی پاش خۆیان تا بەوجۆرە تەوامەند دەبێت. خوای گەورە زانایە و ئێوە نازانن"[1].

لەپێشەکی کتێبی (المقدمة)دا ئیبن خەلدوون لەمێژووەوە -کەباسەکەیە- دەگوازێتەوە بۆ بابەتی مێژوو کەئەویش ئاوەدانکاری جیهان و حاڵەتەکانی ئەم جیهانەیە: "بزانە لەبەرئەوەی حەقیقەتی مێژوو هەواڵدان بوو لەبارەی کۆبوونەوەی مرۆیی کە ئەویش بریتییە لەئاوەدانکاری و ئەوەی سەبارەت بەسروشتی ئەو ئاوەدانکارییە و ڕەوشەکانی دەخرێتە ڕوو وەک: کێوییبوون و هۆگربوون و دەمارگیرییەکان و پێڕەکانی زاڵبوونی هەندێک لەمرۆڤەکان بەسەر هەندێکی تریاندا و ئەوەی بەهۆی ئەوانەوە دێتە ئاراوە لەدەسەڵات و دەوڵەت پلەبەندییان و ئەوەی مرۆڤەکان بەهۆی کارەکانیان وهەوڵدانیان بۆ بەدەستهێنان و بژێوی و زانست و پیشەکان دەیکەنە نەریت و باو و تەواوی

---

[1] ابن خلدون، عبدالرحمن. مقدمة ابن خلدون. تحقيق: علي عبدالواحد وافي، القاهرة: مكتبة النهضة مصر، ج٣، ص١٢١٣.

ئـەوەی لــەو ئاوەدانکارییــەدا بــەپێی سروشــتی ڕەوشــەکە دێتــە ئــارا، لــێ دەکەوێتەوە..." [١].

ئامــانج لــەم زانســتە گــۆڕینی مەبەســتی مێژوونووســە لەگێڕانــەوەی بەسەرهاتەکان و وەرگرتنی سەیرو سەمەرەکان بەرەو دانانی یاسایییەک: "بۆ جیاکردنەوەی حەق لەناحەق لەبەسەرهاتەکانداو ڕاستی لەناڕاست بەشێوەیەکی بەڵگەدار کەهیچ گومان هەڵنەگرێت". پاشان دامەزراندنی زانستێکی نوێ کە بەبابەتەکانیانیەوە لەمێژوو جیاواز دەبێت و بەهەمان شێوە لەزانستەکانی دیکەش جیا دەبێت. لەمبارەیەشەوە ئیبن خەلدوون دەڵێت: " ئەمە لەخۆیدا زانستێکی سەربەخۆیە، خاوەن بابەتێکە کەئەویش ئاوەدانکاری مرۆیی (العمران البشــري) و کۆمەڵناســی مرۆییــە و خــاون کۆمــەڵێک پرســە، ئــەویش ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێگری و حاڵەتە خودیانەی یەک لەدوای یەک تووشی دەبن، ئەمەش حاڵی هەموو زانستێکە، جا دانراو بێت یاخود عەقڵی" [٢].

لەوانەیە ئەو ڕەوشە پڕ گۆڕانکاری وناڕەحەتیانەی ئیبن خەلدوون لەژیانیدا بینیویەتی کاریگەری زۆریان هەبووبێت لەسەر ئارەزوومەندی خەڵوەتنشینی "لەقەڵای ئیبن سەلامە" تابتوانێت ڕابمینێت وبیر بکاتەوە بەوردی و ئەزموون و پسپۆڕی خۆی سەبارەت بە حاڵی ئومەت لەو سەردەمەدا بنووسێتەوە و لێیانەوە هەندێک یاسای ئاوەدانکاری مرۆیی لەبابەتە سیاسی و کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکــان دەربهێنێــت، کــەدەرووونی مرۆیــی و مێــژووی نەتــەوەو شارستانییەتەکان و ژینگەی جوگرافی و کاروباری پادشاو سیاسەت و بابەتە ئابوورییــەکان وســەرمایەو بنــەماکانی کۆمەڵناســی مرۆیــی و پرۆگرامــەکانی پەروەردە و جگە لەوانەشی گرتەوە.

ســوننەتی خــوای گــەورە لــەژیانی کۆمــەڵگاکانی مرۆڤایەتیدا وادەخوازێت کەئاوەدانکاری مرۆیی لەگەڵیدا ڕۆشتن بەرەو خۆشگوزەرانی ونغرۆبوون لەخۆشیدا ڕوویدات، ئەمەش دەبێتە هۆی ناتەواوی لەهۆکارەکانی هێز و خــۆڕاگری، پاشــان لــەلاوازی ئومــەتی خۆشــگوزەران و داڕووخــانی شارستانییەتەکەی، تا لەپاش ئەوە ئومەتێکی تر جێگایان بگرێتەوە، کە لەمان

[١] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٣٢٩.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٣٣٢.

زیاتر مەردو خۆڕاگرو بەهێز بن و ئەمانیش بۆ ماوەیەک کار دەگرنە دەست، دواتر دەورانی ئەمانیش کۆتایی دێت: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ {ال عمران: ١٤٠}، واتە: (ئەو چەرخ و ڕۆژگارە لەناوخەڵکیدا دەگێڕین)، لەبەر ئەوە ئەو واتایەی کەئیبن خەلدوون بەشارستانییەت و ئاوەدانکاری مرۆیی داوە بەستراوەتەوە بەگەیشتن بەقۆناغی لاوازی وسەرەتای داڕووخان، زیاتر لەوەی کەدەیبەستێتەوە بەواتا باوەکەیەوە، کەمانای پێشکەوتن و گەشەکردن بەشارستانییەت و ئاوەدانکاری دەدات.

ئیبن خەلدوون لەتێگەیشتنیدا بۆ مێژوو و کۆمەڵناسی مرۆیی و پەیوەندییان بەگەردوونی سروشتی و سونەتەکانی بوونەوە جیاوازی زۆر باش و ڕوونی هەیە، بە بەراورد بەجگە لەخۆی لەوانەی کە چارەسەری ئەم بابەتەیان کردووە. چونکە کۆمەڵگای مرۆیی جێگای ڕامان وسەرنجی بیرمەندانی دیکەی پێش ئیبن خەلدوون بووە، وەک ئەفلاتۆن و ئەرستۆ و فارابی و ئوگستین، بەلام تیڕوانینی تیۆری فەلسەفی کەزاڵبووە بەسەر هەوڵەکانیاندا وایکردووە لەواقیع و سروشتی کۆمەلایەتی ژیانی مرۆڤ نزیک نەبنەوە، چونکە نیازەکەیان نیازێکی مەبەستداری پێوانەیی بووە، ئەوەی پێویست بووە کۆمەڵگا لەسەری بێت دیاریکردووە. لەبەرانبەردا ئیبن خەلدوون پشتی بەلێکۆڵینەوەی کۆمەڵگا بەگوێرەی ئەوەی بەکرداریی لەکۆمەڵگادا ڕوودەدات بەستووە، بەهۆی ئەزموونی کرداریشیەوە لەکۆمەڵگادا، لەگەڵ ئەوەی بێئاگا نەبوو لەوەی کەپێویستە کۆمەڵگا لەوێنە پێوانەکاریەکەیدا لەسەری بێت، بەلام تەنها لەچوارچێوەی تێڕوانینێکی فەلسەفی موجەڕەددا نا، بەڵکو لەچوارچێوەی ڕێنوێنی خوادا، هەروەک ئەوەی لەقورئانی پیرۆز لێی تێگەیشتووە. لەبەر ئەوە ڕاپۆرتی وەسفی و دیاریکردنی پێوەری پێکەوە کۆکردووەتەوە و قسەی سەبارەت بەجیهانی بوون (عالم الشهادة) کردووە، بەبێ ئەوەی جیهانی پەنهان و غەیب فەرامۆش بکات، پشتی بەعەقڵ بەستووە، بەبێ ئەوەی نەقڵ فەرامۆش بکات.

بەلام کاری هەرەگرنگی ئیبن خەلدوون لەتێگەیشتنیەتی ئاوەدانکاری مرۆیی، جەخت کردنەوەیەتی کەهیچ ڕێگایەکی تر نییە بۆ تێگەیشتنی سروشتی ئاوەدانکاری بەبێ تێگەیشتن لەیاساکانی کۆمەڵناسی مرۆیی و سروشتەکانی

ئــەو کۆمەڵناســییە، چونکــە ئــەوەی لەڕاســتیدا ڕوودەدات بــەگوێرەی ئــەو سـونەنانەیە کەلـە سـونەنەکانی دیکـەی گـەردوون دەچـن، کەلـەجیهانی مـادی شــتەکاندا ڕوودەدات، لەبــەر ئــەوە پێویســتە لێکۆڵینــەوە لــە ڕووداو و بــارە کۆمەڵایەتییەکان بەپێی مەنهەجێکی ڕێکخراو بکرێت، کەڕووداو وسروشتەکان تێنەپەڕێنێت: "چونکـە یاسـای جیاکردنـەوەی حـەق لەناحـەق لەبەسـەرهاتەکاندا بـەپێی گونجـان و مەحاڵبوونـە، دەبـێ سـەرنجی کۆمەڵناسـیی مرۆییـی بـدەین کەئەویش بریتییە لەئاوەدانکاری و جیاکاری بکەین لەنێوان ئەوەی بەهۆی ئەو بارەی خودییەی کە کەسەکەی تێیدایە و ئەوەی سروشتەکەی دەیخوازێت..." [١]، لەبەر ئەوە ئیبن خەلدوون کاتێ بابەتی زانستی ئاوەدانکاری و پرسەکانی دیاریکرد، ئەم دیاریکردنەی بەمە کۆتایی پێهێنا: " ئەمـە بـاری هـەموو زانستێکە لەزانستەکان، ئیدی زانستی دانراو بێت یاخود عەقڵی "[٢].

لەوانەیــە ئــەم بانگەشــەیەی ڕوو لەبانگەشــەکارانی چاکســازی و گــۆڕان لەکۆمــەڵگا موســڵمانەکانی ئــەمڕۆ بێــت، کەپێویســتە لێکۆڵینــەوە لەیاســاکانی گۆڕانکـاری لەعەقڵـەکان و دەروونـەکان و واقیعـی کۆمەڵایـەتی بکـەن، پاشـان نەخشــە بــۆ توانــای چاکســازی دابنرێــت و پرۆگــرام وچالاکییــەکانیان لەســەر بنـەمای زانسـت و تێگەیشـتنی ئـەو یاسـایانە بێت. چونکـە گـۆڕانی واقیـع بـەبێ ئــەزموونی ســنووورداری کەســی، یــاخود بەئەزموونــەکانی کەســانێکی ســادە کەرەوشــێک هێناونیەتــە ڕیــزی پێشــەوە، یــان بەرزکردنــەوەی بەدروشــم بــێ بەرنامــەی زانســتی و کرداریــی نایەتــە دی، ئیــدی ئــەو دروشــمانە هــەرچەنــدە لەخودو مانایاندا ڕاست و دروست بن.

بەهەمان شێوە گۆڕینی واقیع بەئاواتخواستنی دڵسۆزان لەدڵیاندا نایەتە دی، ئیــدی ئــەو دڵانــە هەرچەنــد پــەرۆش بــن، بەپاڕانــەوەکانی بــاوەڕدارانیش لەنوێژەکانیاندا نایەتەدی، ئیدی لەدوعاکانیاندا هەرچەند دەنگ بەرز بکەنەوە!

پاشــان ئیــبن خەلــدوون لــەکاتی دانــانی زانســتی ئاوەدانکاریــدا، بــەگوێرەی ئەوانـەی پـێش خـۆی لەکەسـانی زانـا یـاخود بەشـوێن پـێ هـەڵگرتنیان ئـەنجام نـادات، ئیدی ئەوانـە لـەزانایانی موسـڵمان یـاخود زانایـانی نەتـەوەکانی تـر بـن،

---

[١] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٣٣٢.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٣٣٢.

بـەڵکوو لەتێگەیشـتنیەوە بـۆ ئـەوەی زانایـانی پـێش خـۆی لەهەوڵەکانیانـدا بـۆ تێگەیشتن لەئاوەدانکاری مرۆیی پێی گەیشتوون، ئەوەی ئـەوان ئـەنجامیان داوە بـەس نـەبووە بـۆ دارشـتنی ئـەو یاسـایانەی کەبـەگوێرەی ئـەوان لـەرێکارەکانی گۆڕان و پەرەپێدان و گەشـە لـەژیانی مرۆڤدا تێدەگـەین، ئـەم کـارەش پێویسـتی دەکرد لەسـەری کەهەوڵی زیاتر بدات و "لەقەلای ئیبن سـەلامە" خـۆی بـۆ یـەکلا بکاتـەوە، کـە بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵی تەمـەنی لـەوێ بەبیرکردنـەوەو رامـان و خوێندنــەوەو نووســین بەســەر بــرد، هــەتا کتێبــی "کتــاب العبــر"و "المقدمــة"ی نووسی، کەزانستی ئاوەدانکاری لـەخۆ گرتبـوو ئـەم بەرهەمەشـی داهێنـان بـوو: "داهێنــانێکی تــازە، حــەزێکی ســەیر، ســوودێکی فــراوان، بەگــەڕان دۆزییــەوە.. بەرۆچوون پێی گەیشت... وەک ئـەوەی زانسـتێک بێ تـازە هـەڵێنجرابێ، سـوێند بێ هاوشـێوەی ئـەو قسـانەم لـە ئاراسـتەکەیدا لای هـیچ بـەدیهێنراوێک نـەبینیوە. ئێمـەش خـوای گـەورە بـە ئیلهـامی ئـەو زانسـتەی پیشـانداین، وایلێکـردین بـە ئاسانی هەواڵێکی تەواومان دەستکەوێت[1].

بابەتەکـە تـەنها لەئاسـتی لێکۆڵینـەوە لـەوەی بەیاسـاکانی گـۆڕان ناسـراوە ڕاناوەسـتێت، بـەڵکو ئـەوە تێدەپـەڕێنێت بـەرەو بەگەرخسـتنی عـەقڵ لەتاقیکردنەوەی چاک تییانداو ئەزموونکردن و زانینی پەیوەندی بەبابەتـەکانی گـەڕان و چوارچێوەی لـەکات و شـوێندا. ئـەم هەوڵـەش پێویسـتی بەبلیمـەتێکی وەک ئیبن خەلـدوون لـەو سـەردەمەدا هـەبووە، لەوانەیە پێویسـتی بەهاریکاری زۆرێـک لەلێکۆڵـەرەوان هـەبێ، کەبەتـەنها و پێکـەوە لـەگرووپی توێژینـەوەدا کاردەکەن و هەوڵەکانیان بەیەک دەگات و ئەزموونەکانیان یەکتر تەواو دەکات، لەوانەیە خـوای گـەورە ئیلهامێکیـان پێ ببەخشـێت کـەبۆ خـەڵکی بەسـوود بێت، لەڕاستکردنەوەی هەڵوێستەکانیان و چارەسەری کێشەکانیان.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٣٣٣- ٣٣٥.




لەشیکردنەوەکانی ئیبن خەلدووندا پەیوەندی نێوان ئاوەدانکاری و ژیانیش ون نییە، ژیانی تاکەکان و ژیانی کۆمەڵگاکان و ژیانی وڵاتان، چونکە ئەو باسی سێ پایەکەی ئاوەدانکاری مرۆیی لەسەر ئەم زەویەدا دەکات: پایەی یەکەم بریتییە لەتەقوای خوای گەورە، ئەویش ژیانی دڵە بەتەزکییەی دەروونی لەهەواو ئارەزووەکان، پایەی دووەمیش بریتییە لەهەوڵدان بۆ رزق و رۆزی، لەمەشدا ژیانی کۆمەڵگا بەهاریکاری و دەستبار بۆیەک گرتن و یەکترتەواوکردنی تێدایە، چونکە مرۆڤ وەک تاک ناتوانێت کەپێویستییەکانی ژیان وئاسایش کۆبکاتەوە. پایەی سێهەمیش بریتییە لەدادپەروەری لەفەرمانڕەواییدا، ئەویش ژیانی دەوڵەتانی بەهێز و کۆکردنەوەی داواکارییەکانی دەسەڵاتی تێدایە.

**چوارەم: ئاوەدانکاری وشارستانیەت:**

مانابەخشـینەکانی ئاوەدانکـاری لەقورئانـدا بەشـێوەیەکە کەنیشـتەجێبوونی مـرۆڤ لەشـوێنێکداو بەسـەربردنی ژیـان و نۆژەنکردنـەوەی و چـاککردن و سەقامگیریی تێیدا و خستنەگەڕی وزەو تواناکانی و بەجێگەیاندنی حەقی خوای گـەورە لەبـەرپاکردنی ژیـانی مرۆیـی بـەگوێرەی مەبەسـتەکانی شـەریعەت و ڕێنمونی پێغەمبەرانی بێت، بەهەمان شێوە بەواتای ئاوەدانکردنەوەی جەستەی مرۆڤیش بەژیان و تێپەڕبوونی کاتیش لەتەمەنی هاتووە.

ئیبن خەلدوون ئـەم زاراوەیـەی قورئـانی هێنـاوە کردوویـەتی بەشـێوازێکی گشـتی بـۆ ژیـانی مـرۆڤ، کەتێیـدا -بـەبێ بوونـەوەرەکانی تـر- ئـەرکی خـۆی لـەئاوەدانکاری زەوی بـەجێ دەگەیـەنێت، تاکـەکانی هاریکـاری یەکـدی دەکـەن لەسەر بژێوی مرۆیی و دابینکردنی پێویستییەکانی ژیانی کۆمەڵایـەتی، کەبـەبێ ئەو کۆبوونەوەیە پێکـەوە نایەتـەدی، ئەمـەش بەدەمـەوەچوونی فـەرمانی خـوای گەورەیە کەدەفەرموویێت: ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ ﴿٦١﴾﴾ { هـود: ٦١}، واتـە: (ئـەو دروسـتی کردوون لەزەویـداو کردوونـی بەئاوەدانکـەرەوە تێیـدا، کەواتـە داوای لێخۆشـبوونی لـێ بکـەن، پاشـان بگەڕێنـەوە بـۆ لای بەڕاسـتی پـەروەردگارم زۆر نزیکـی دوعـا وەرگرە)، ﴿وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿١٠﴾﴾ { الاعراف: ١٠}، واتە: (خوا بەمەبەستی ئاوەدانکردنەوە، لەزەمین دروستی کردن، دەمادەم داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن و بۆ لای ئەو بگەڕێنـەوە، خـودای من زوو بەزوو نزا وەردەگرێ).

بەڵام شارستانیەت بەمانای زاراوەیی هاوچەرخ، کـە لەسـەر کۆمـەڵێک بنـەما دامــەزراوە کــە ڕەفتــاری خــەڵک لەکۆمــەڵگاو دەســتکەوتە رۆشــنبیری و ومادیەکانیان بەپێی حوکمی ئەوە، ئەمەیان لەقورئانی پیرۆزدا نـەهاتووە، بـەڵکو داتاشراوەکانی سێ پیتی کرداری (حضـر) لەچەند شـوێنێکدا هـاتووە، ئـەویش بـەواتای ئامـادەبوون و شـاهێدییە، کەپێچەوانـەی غایـب بوونـە. بـەڵام چـەمکی زاراوەیــی هاوچــەرخ بەشــێوەیەکی ڕاســتەوخۆ لــەنێو مانابەخشــینەکانی

ئاوەدانکاریدا بوونی هەیە، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش لەنێو مانابەخشینەکانی ئومەت و شاهێدیدان و جێنشینایەتیدا.

گرنگە لێرەدا جەخت لەوە بکەینەوە، کە مانابەخشینەکانی شارستانییەت یاخود ئاوەدانکاری شارستانی لەتێڕوانینی جیهانی ئیسلامیدا کەبەتەواوەمەندی و پێکەوە گونجان ناسراوە، پێویستە ڕەهەندی مەعنەوی کەمەبەست لێی بنەما فیکرییەکان و سیستەمەکانی کارگێڕی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بەها ڕەوشتییەکان لەلایەک، لەگەڵ ڕەهەندی مادی کەمەبەست لێی پێشکەوتنی زانستی و گەشەسەندنی تەکنەلۆژی و ئاوەدانکاری شارستانییە لەلایەکی دیکەوە پێکەوە کۆ بکاتەوە. پێوەری شارستانییەتیش لەتێڕوانینی ئیسلامیدا تەنها لایەنی ڕەهەندی یەکەم بەبێ ڕەهەندی دووەم نییە.

لەوانەیە لەم پاڕانەوەی ئیبراهیم پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێ بێ) کەپاش ئەوەی هاوسەرەکەی و کوڕەکەی لەشوێنی کەعبەدا لەمەککە نیشتەجێ کرد ئاماژە بەپێکهێنەرەکانی ئاوەدانکاری مرۆیی بکات کەبریتییە لە: مرۆڤ کە بەکاری ئاوەدانکاری هەڵدەستێت، شوێن کەئاوەدانکارییەکەی لەسەر ئەنجام دەدرێت، بنەما کەئاوەدانکاریەکە دەپارێزێت. چونکە ئەم مرۆڤە منداڵەیە کەبەشدار دەبێت لەبونیاتنانی بناغەی ئاوەدانکاریداو لەنەوەکانیشی ئومەتی پەیامی شارستانی دێت، سەبارەت بەشوێنیش ئەویش دۆڵێکی نا ئاوەدانە، کەسی تێدا نیشتەجێ نییە، پێویستی بەڕۆزی مادی هەیە لەبەروبومەکان و پێویستی بەئاسایشە کەئەویش بەهاتنی خەڵکی و ڕووکردنی دڵیان بۆ ئەم جێگایە و هۆگری و خۆشەویستی و هاوسۆزی وهاریکاری یەکدی تێیدا، بنەمای سێهەمیش کەئەو نەوەیەی تێیدا نیشتەجێ بووە دەیهێنێتەدی و بەنوێژکردن و سوپاسگوزاری خوای گەورەو خواپەرستی ئاوەدانی دەکاتەوە: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧﴾ {ابراهيم: ٣٧}، واتە: (ئەی پەروەردگارم من هەندێ لەرۆڵەکانم نیشتەجێی شوێنێکی بێ کشتوکاڵ کردووە لای ماڵە پیرۆزو ڕێز لێگیراوەکەت، پەروەردگارا هەتا بەچاکی نوێژ بەجێ بێنن و ئەنجامی بدەن، بەڵکو دڵی خەڵکانێک وا لێبکەیت

سۆزو مەیلیان بۆ لایان بێت و لەهەموو بەرو میوەیەکیش رۆزیان بدە، بەڵکو شوکرانەبژێر بن).

لەڕاستیدا خوای گەورە چاکە (احسان)ی لەهەموو شتێکدا نووسیوە، مرۆڤی باوەڕداریش بەپلەکانی نزیکبوونەوە لەخوای گەورە بەجۆرەها پەرستش بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە پلەی ئیحسان، ئەمەش حاڵەتێکی بەرز و بڵندی ڕەوشتی و دەستکەوتێکی کردارییە، چونکە باشترین مرۆڤ و خۆشەویسترینیان لای خوای گەورە سوودمەندترینیانە بۆ خەڵکی. ئەو کەسە باشترین قسەی هەیە لەنێو خەڵکیدا کە بانگەواز بۆ لای خوا دەکات و کاری چاک ئەنجام دەدات. ئیدی بۆ پێوەری ئیسلامی بۆ شارستانیبوون بریتی نەبێت لە کۆکردنەوەی نێوان ئیمان و کردەوەی چاکە؟! ئایا ئەمە کردەوەی چاک نییە کەجیهانی باوەڕدار دەستکەوتە زانستییە سوودبەخشەکان بۆ خەڵکی و دەستکەوتە سوودبەخشەکان لەبوارەکانی پزیشکی و ئەندازیاری و کارگێڕی و پیشەسازی و کشتوکاڵ و جگە لەمانە دابهێنێت؟!

خۆ ئەگەر سوودبەخشترین کەس و خۆشەویسترینیان لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ)و نزیکترینیان لەکۆڕیدا لێیەوە لەرۆژی قیامەتدا ئەو کەسە بێت کەڕەوشتی پەسەندو جوانە، ئیدی بۆ باوەڕدار خاوەنی ڕەوشتی شارستانی چاک نەبێت، بەپابەندبوونی بەئەرکەکانی کار و ڕەوشتەکانی پیشەکەوەو بەئەمەکداری بەپەیمانەکانی و بەجێبەجێکردنی گرێبەستەکان و بەجێگەیاندنی بەڵێنەکانی و بەرچاوڕوونی لەکاروبارەکانیداو داهێنان لەچارەسەری کێشەکان و گەشەپێدانی ئەنجامدان و تێگەیشتنی سروشت و ڕووداوەکان؟!

ئەگەر شارستانییەت بەپێی تێڕوانینی مادی دەرئەنجامی یاساکان بێت لەکێبڕکێ و ڕکابەری زانستی و پیشەسازی و بازرگانییدا، کەئەو ڕکابەرییە لەسەر دەستکەوتەکانی عەقڵی مرۆڤ و پرۆگرامی زانستی ئەزموونی وەستاوە، ئەوا تێڕوانینی ئیمانی لەسەر سەرنجدانی قەدەرەکانی خوای گەورە و سونەنە فیترەتیەکانی لەبەدیهێنان و ڕێساکانی خوای گەورە لەبەڕێوەبردنی جیهان و باوەڕبوون بەپێغەمبەر و نێردراوان کەبناغە دانەری ڕاستەقینەی شارستانییەت بوون ڕاوەستاوە، بلیمەتی ئیبن خەلدوون فێری ئەوەی کردووین

کەهەردوو تیڕوانینەکە پێکەوە کۆ بکەینەوەو تێڕوانینی یەکەم لەچوارچێوەی تێڕوانینــی دووەمدایــە و بــەرپابوونی شارســتانییەت و ئاوەدانکــاری مرۆیــی، پێویســتی بەشــارەزایی لــە ڕێســاو یاســاکان هەیــە، کەسروشــتی مرۆڤــەکان بــەگوێرەیان بــەڕێوە دەچێــت و فەرمانبــەرداری ڕووداوە کرداریــەکانن. ئایــا بۆمــان ڕوون نەبوویــەوە تــا چەنــد پێویســتە یــەکتر تــەواوکردن و هاوســەنگی لــەنێوان پێویســتییە مادییــەکان و پێویســتییە ڕۆحییــەکانی مرۆڤــدا هــەبێت، بــەجۆرێک کــەبتوانێت شارســتانیەتی مرۆیــی هاوچــەرخ لــەو ئاریشــەیەی تێــی کــەوتووەو لــەو چارەنووســەی بــەرەو ڕووی دەچێــت بــەهۆی نــەبوونی ئــەو هاوسەنگییەوە دەرباز بکات؟!

لەکاتێکدا کــەتێڕوانینی گــەردوونی و پاڵنــەرە ئیمانیــەکان هانــدەری ئومــەتی ئیســلامیبوون بــۆ دەســتکەوتی شارســتانی لــەرۆح و مــادەدا، ئــەوا ئومــەت شارستانییەتێکی هاوسـەنگی بونیات نـابوو کەپێویستییە مـادی و ڕۆحییـەکانی کۆکردوبووەوە. ئومەتیش لەگۆڕەپانی جیهاندا ئامـادەیی بـوو لەپەیوەندییـەکانی گـەل و نەتـەوەکانی ئـەو کاتـەدا ژمـارە قورسـەکە بـوو سـەرچاوەی پێشـەنگێتی بـوو لـەئاوەدانکاری مـادی و مەعنەویدا. بـەڵام کـەلێنێک کەوتـە نێو تێڕوانین و عەقیدەیـەوە و شارســتانیەتەکەی ســنووردار بــوو پاڵنــەری ویســتی بــۆ کــاری شارستانی سست بوو لەبری حاڵەتی ئامادەبوون "یاخود ئامـادەیی شارسـتانی" لەگۆڕەپانەکەدا نەما، ئیدی ئامادەیی نەبوو وەک جێ سـەرنجی ئەوانـەی بـەرەو شارســتانیەت دەچــوون نــەما، هــەتا ئێســتاش ئــەم کەلێنــە بووەتــە بەربەســت لەدەستپێکردنی هەستانەوەیەکی شارستانی نوێی ئەم ئومەتە[1].

ئیــبن خەلــدوون ئاوەدانکــاری لەشــێوازێکی مــادی دیــاریکراودا قــەتیس نەکردووە، چونکە کۆچەرەکانیش خاوەن ئاوەدانکارین کەخەسڵەتی مادی هەیە و گونجاوە لەگەڵ ژینگەی شوێنی و پێویستیەکانی ژیان تێیدا، شارسـتانییەتیش بەهـەمان شـێوە ئاوەدانکارییەکـە کـەخەسـڵەتی مـادی دیکـەی هەیـە. لەهـەردوو حاڵەتەکەشــدا چەنــدان پێکهێنــەری مەعنــەوی بــەهاداری تــر هــەن، ئــەوانیش بیرۆکـەکان و بنـەماکانن کەفەرمانبـەرداری شـێوە ژیـانی مـرۆیین. لەبـەر ئـەوە

---

[1] النجـار، عبدالمجيـد. "دور الاصــلاح العقـدي فـي النهضــة الاســلامية"، إســلامية المعرفـة، ع١، ١١٩٥م، ص٥٧-٩٤.

ئیــبن خەلــدوون شارســـتانیەت و ئاوەدانكــاری یەكســـان نابینێــت، بــەڵكو ئاوەدانكاری دەكاتـە ئـەو شـێوە ژیانـەی كەكۆمـەڵگای مرۆیـی لـەكات وشـوێندا تێیدا دەژی[1]. ئەمـەش نزیكترە لـەمانا ڕاسـتەوخۆكانی ئایەتـەكانی جێنشـینی و توانـا (التمكین) لـەقورئانی پیـرۆزدا كەوادەكـەن ئاوەدانكاری ببێتـە مەبەسـتێكی گشـتی لەمەبەسـتەكانی خـوای گـەورە لەبـەدیهێنان، ئـەم مەبەسـتەش لەگـەڵ كۆمـــەڵگای مرۆییـــدا دەوران دەكـــات و بەشـــێوەیەكی ســـەربەخۆ لەئاســـتی شارستانی دێتـەدی، هەربۆیـە پێویسـت نییـە كـەواتای ئاوەدانكـاری پەیوەست بكرێـت بەپێشـكەوتنی مـادی و گەشـەكردنی تەكنەلۆژییـەوە، كـەئـەم دووانـە كۆمەڵگا لەگەڵ بەرزبوونەوەی بەپلەكانی شارستانییەتدا گەشە پێدەكەن.

ئەمــەش واتــای كەمكردنــەوەی بــەهای شارســتانییەت ناگەیــەنێت، چونكــە شارسـتانییەت لەتێگەیشـتنی ئیـبن خەلدوونـدا بریتییـە لـەئامانجی ئاوەدانكـاری، واتـــە ئاراســـتەی گەشەســـەندن لەئاوەدانكاریـــدا بریتییـــە لەگواســـتنەوە لەكۆچەرییــەوە بــەرەو شارســتانییەت[2]، چونكــە شارســتانیبوون دیاردەیــەكی

[1] ئیبن خەلدون بەزاراوەیەكی تایبەت بـەخۆی گوزارشـت لەشێوازی ژیـان دەكات كە ئـەویش "ڕێبازی بژێویی پەیداكردن"ەو، بەدرێژی نموونە لەسەر جۆرەكانی: ڕێبازەكانی بژێوی پەیداكردن لای كۆچــەرەكان دێنێتــەوەو، دەڵێــت: " كۆبوونــەوەیان بــۆ هاریكارییــە لەســەر بەدەســتهێنان و دەســتپێكردنی ئــەوەی زەروورییــە و ئاســانە لهــو پێداویســتیانە، بــەر لەوانــەی پێویســتیی و تـەواوكاریین، هەیانـە جوتیـارە لـە كێڵان وچاندنـدا، هەیانـە كـاری بـەخێوكردنی ئـاژەڵ دەكـات لـە مەڕومالات و مانگاو بزن و هەنگ و، بۆ بەرهەمەكانی و دەرهێنانی پاشماوەكانی... ئا لـەو كاتـەدا كۆبوونــەوە و هاریكارییــان لەپێویســتی و بژێــوی و ئاوەدانكردنــەوە و شــوێنی حەوانــەوە و گەرمبونـەوە، بـەو ئەندازەیەیـە كـە ژیانیـان پـارێزراو بێـت و گوزەرانیـان لەئاسـتێكدا بێـت بـەبێ زێدەڕۆییكردن، چونكە لەوە زیاتر لەتوانادا نییە". پاشـان دەڵێت" لەبەشـی پێشوودا باسـی ئـەوەمان كرد كەخـەڵكی كۆچـەر خۆیـان گونجاندووە لەگەڵ ژیانی سروشـتیدا، لـە جوتیـاریی و مـەڕومالات بەخێوكردن و، رزق و ڕۆزیە زەرورییەكان بە تەنێ و پۆشاك و شوێنی نیشتەجێبوون و تـەواوی بارو دەستهاتەكانیان هەر ئەوەندەیە، لەوە زیاتر هیچ شـتێكی پێداویسـتیی یان تـەواوكاریی دەست ناخەن: بڕوانە:

- ابن خلدون، مقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ص٤٦٧-٤٧٠.

[2] ئیــبن خەلــدون دەڵێــت: "ئــەوەی گــەواهی دەرە بۆمــان ئەوەیــە كــە كۆچــەری بنــەڕەتی شارنشینیە و لەپێشترە، ئێمە ئەگەر خەڵكی شارێك لـە شـارەكان بپشكنین، دەبینین كە زۆرینـەیان سەرەتاكەیان خەڵكی كۆچەری بوون، چ لە دەوروبەری ئەو شارە، یان لەگوندەكانی، هەر ئـەوانیش دەوڵەمەند بوون (واتە بوونە خـاوەن سـەرمایەو دەوڵەمەند بوون) ئـەمجا لـە شـارەكەدا نیشـتەجێ

سروشتی تازە دەرکەوتووە، لەگەڵیدا گەشەسەندنی شێوەکانی ئاوەدانکاری و شــــتومەکە مادییـــــەکانی و کەرەســـــتە تەکنەلۆژیـــــەکانی و پەیوەندییـــــە کۆمەڵایەتییەکانی و سیستەمە کارگێڕی وسیاسییەکان دەهێنێت. لەوانەیە ئەو شێوەیەی کەئیبن خەلدوون بۆ شارستانییەت وێنای دەکات بەلاداچوو بێت بەرەو لایەنی نەرێنی کەهۆکارەکانی خۆشگوزەرانی و رەفاهیەتی لەگەڵ بهێنێت، خەڵکی شارنشین بەهۆی نالاندنی زۆرەوە بەدەست هونەرەکانی چێژوەرگرتن و داهاتەکانی خۆشگوزەرانی و کرانەوە بەڕووی دونیادا و یەکلابوونەوە بۆ هەواو ئارەزوویان تێیدا، دەروونیان بەزۆرێک لەخوو و خراپە پیس دەبێت و ڕێگاکانی خێرو چاکە بەڕادەی پیسبوونەکە لێیان دوور دەکەوێتەوە...دواتر ڕوون دەبێتەوە کەشارستانییەت بریتییە لەکۆتایی ئاوەدانکاری و دەرچوونی بەرەو خراپە"[1].

پاشان بەفراوانی پەیوەندی نێوان ئاوەدانکاری بەشارستانییەتەوە ڕوون دەکاتەوەو بەشێکی بۆ تەرخان دەکات بەناوی: "أن الحضارة غاية العمران ونهاية لعمره وأنها مؤذنة بفساده" واتە: شارستانییەت ئامانجی ئاوەدانکارییە و کۆتایی تەمەنیەتی و خراپبوونی ڕادەگەیەنێت) ، تێیدا ڕوونی دەکاتەوە کە: " شارستانییەت ئامانجی کۆچەرێتی بووەو ئاوەدانکاری هەمووی جا کۆچەری یان شارستانی یان پاشایەتی یان ژێردەستەکان کردبێتیان، هەموویان تەمەنێکی هەستپێکراویان هەیە، هەروەک چۆن بۆ تاکە کەسێک تەمەنێکی هەست پێکراو هەیە... جا با بزانین کەشارستانییەت لەئاوەدانکاریدا بەهەمان شێوەیە، چونکە ئامانجەو هیچی تر لەپشتییەوە نییە، لەبەر ئەوەی خۆشگوزەرانی و نیعمەت کە بوونە بەشی خەڵکی ئاوەدانی، ئەوا بەسروشتی خۆی بەرەو ڕێبازی شارستانییەت و خووگرتن بەدەستکەوتەکانییەوە دەیانبات. شارستانییەتیش وەک زانیمان هونەرنواندنە لەخۆشژیانی و

---

بوون و ڕوویان کردە ئارەزووەکان و خۆشگوزەرانی کە لەشاردا هەبوو. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە باری شارستانی کەلەحاڵی کۆچەرییانەوە دەستی پێکردووەو ئەوان بنەڕەتن بۆی، دەی کەواتە لێی حاڵی ببە"، بڕوانە:

- ابن خلدون، مقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص٤٧٣.

[1] ابن خلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٤٧٣.

تازەکردنـــەوەی بارەکـــانی و زیـــادەڕەویکردن لـــەو پیشەســـازییانەی تـــەواوی هونەرەکانی بەکارهێنراوە لەپیشەسازییە ئامادەکراوەکان بۆ چێشتخانە یاخود جل وبەرگ یان باڵەخانە یان ڕاخەر یاخود قاپ و قاچاخ و تەواوی شتەکانی نـــاو مـــاڵ دەڕازێنێتـــەوە... کـــە کـــار لـــەم ڕازاندنەوانـــەدا گەیشـــتە ئاســـتی زیادەڕەویکردن و دەستبلاویی لەم کاروبارانەی ناوماڵدا، بەشوێنیدا گوێڕایەڵی هەواو ئارەزوو دێت و دەروون بەجۆرەها ڕەنگ ئاڵ و واڵا دەکەن، کە ئیدی بـەوجۆرە حـاڵی لەگـەڵ ئایینەکـەی و دونیـادا هـەڵناکات و...ئەوەشـی ڕوون کردوەتەوە کە هونەرنواندن لەشارستانییەتدا خەرجییەکانی خاوەنەکەی زیاد دەکـات و شارسـتانییەتیش بـەپێی ئاسـتی ئاوەدانکـاری جیـاوازە، هـەرکاتێ ئاوەدانکاری زیاتر بوو ئەوا شارستانییەت تەواوتر دەبێت. وەک پێشتریش باسمان کرد ئەو شوێنەی زیاتر ئاوەدان بێت ئەوا بازاڕەکانی زیاتر گرانی تێدا دەبێت و نرخی پێویستییەکان گرانتر دەبێت و بەوەش باج زیاد دەبێت و گرانی لێ دەکەوێتەوە"[١].

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئاوەدانکـاری ئیـدی ئـاوەدانی بیابـان یـاخود ئـاوەدانی شارسـتانییەت بێـت بریتییـە لـەو ئاوەدانکاریـەی کەلەسـەر گوێڕایـەڵی خـوای گـەورە و دڵسـۆزی لەخواپەرسـتیدا و ئەنجامـدانی کـاری چـاک لەسـەر زەوی بەشـێوە و جـۆر و حاڵـەکانی، لـەئازادی ودادپـەروەری و یەکسـانی بونیـات نرابێـت، هـەر ئاوەدانکاریـەکیش کەلەسـەر سـتەم وخراپـەکاری و وێرانکـردن بونیات نرا بێت بەردەوام نابێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾﴾ {الاعراف: ٩٦}، واتـە: (ئەگـەر دانیشـتوانی شـارو گونـدەکان باوەڕیـان بهێنایـەو خۆیـان بپاراستایە، بەڕاستی دەرگای بەرەکەتەکانی ئاسمان و زەویمان بۆ دەکردنـەوە، بەڵام بڕوایان نەهێنا، ئەمجا ئێمەش ئەوانمان گرت و سزامان دان، بەهۆی ئەو خراپانەی کەدەیانکرد).﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُواْ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمۚ﴾ {المائدة: ٦٦}، واتـە: (بێگومـان ئەگـەر ئـەوان کاریـان بەتـەورات وئینجیـل بکردایـە، هـەروەها بـەو قورئانـەی کەهێنراوەتـە

[١] ابن خلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص٨١٧-٨١٨.

خــوارەوە بۆیــان لەلایــەن پەروەردگاریانــەوە، بێگومــان ڕۆزی یــان لــەلای سەرویانەوە (لەئاسمانەوە)و لەژێر پێیانەوە (لەزەوییەوە) دەخوارد).﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ۝٩٨﴾ {یونس: ٩٨}، واتە: (جا با (خەڵکی) شارێ (لەو شارانەی کەهەڕەشەیان لێ کرا)و باوەڕیان هێنا (کاتی بینین و دابەزینی سزای پەروەردگار) باوەڕەکەیان هیچ سوودی پێ نەگەیاندن، تەنها گەلی یونس نەبێت کاتێـک کەهــەموو باوەڕیــان هێنــاو تەوبــەیان کــرد، ســزای سەرشــۆڕی و ڕیســواییمان لــەژیانی دونیــادا لەســەر لابــردن و بۆماوەیــەک (تاکــاتی مــردن) بــەهرەو خۆشــیمان پێــدان). لەڕاســتیدا نەتــەوە جیاوازەکــان جۆرەهــا شــێوەی ئاوەدانکاریــان ئــەنجام داوە، ئــەوەتا گــەلی عــاد جێگــای وایــان بونیــات نــابوو کەلەوڵاتــدا وێنــەو هاوشــێوەی نــەبێت، گــەلی ســەمودیش بــەردی گــەورەیان لەدۆڵەوە هێنـابوو فیرعـەونیش تـەلاری بڵندی دروست کـرد، بـەڵام ئـەو گەلانـە ستەمیان کرد و خراپەکاریان لەوڵاتدا زۆر کرد، بەناڕەوا خۆیـان لەسـەر زەوی بەگــەورە گــرت، ئــەوە بــوو ئاوەدانییــە مادییەکــەیان ســوودی نــەبوو بۆیــان، وێرانکاری و ئەشکەنجە لەدونیادا پێش قیامەت بووە بەشیان.

هەوڵەکانی چاکسازیش لـەجیهانی ئـەمڕۆدا کەدەیانـەوێت ئـەم ئومەتـە تواناو پێگەی شارستانی خۆی بەدەست بێنێتەوە، پرسیارێکی بنـەڕەتی سـەبارەت بـەو ڕێگەیــــەی کەبەهۆیــــەوە دەتوانرێــــت ئــــەوە بهێنرێتــــە دی وروژانــــدووە، پرسیارەکەش بەم شێوەیەیە: ئایا پێویستیمان بەبونیاتنانی شارستانی ئیسلامی ویســــتراو هەیــــە کەکۆمــــەڵگاکانمان بــــەرەو پێشــــەوە ببــــەین تــــا بگــــەین بەشارســـتانییەتی هاوچـــەرخ، کەلەســـەر زانســـت و پیشەســـازی و ڕکاربـــەری لەدەسـتکەوتی مـادی و کەڵەکـەبوونی دەسـتکەوتە ئاوەدانییـەکان و تێرکردنـی خواستی مرۆڤی بەکاربەری هاوچەرخ لەخۆراک و پۆشاک و شوێنی نیشتەجێ بـوون و کەرەسـتەکانی خۆشـگوزەرانی و ئاسـانکاری و پەیوەندییـەکان و جگـە لەوانـە؟ یـاخود وێرانکردنـی ئـەو شارسـتانییەتە داواکـراوە، هـەتا لەسـەر دار و پەردووەکـەی شارسـتانیەتێکی نـوێ بونیـات بنێـین؟ تـا چ پلەیـەک دەتوانرێـت گەیشتن بەوەی یەکەمیان بێتەدی، یاخود ڕۆڵی وێرانکردنەکەی دووەم؟

زۆرێک لەوەڵامەکان بەسەر دوو ئەگەردا دابەشبوون. بەڵام ئەوەی لای نووسەری ئەم دێڕانەیە ئەوەیە کەئەرکی گەیشتنەوە بەوان کارێکی لەتوانادا نەبووە، ئەمە وێڕای ئەوەی کارێکی داواکراویش نییە. بەڵام بیرۆکەی وێرانکردن ئەمەیان ئەزموونێکی ناسراوە لەمێژووی رۆژئاوادا، هەوڵەکانی رۆشنگەری و نوێگەری لەسەر وێرانکردنی ئەو بنەمایانە هاتە ئارا کەکۆمەڵگای لەسەر بنەمای مەرجەعیەتی ئایینی مەسیحی و جیگرتنەوەیان بەبنەمای عەقڵی زانستی هەڵدەسوڕاند، بەڵام پاش ئەوە لەوێرانکردنی هەموو مەرجەعیەتێکی ئایینیدا بەهەڵە چوون. ئەوەتا بیرۆکەکانی پاش نوێگەریش هەوڵی ڕاستکردنەوەی گوتەکانی نوێگەری و چاککردنەوەی ئەوەی کەمتەرخ بوون تێیدا دەدات، بەڵام ئێستاش بەهەڵەداچوون لەوێرانکردنی دەستکەوتی ئەرێنی بۆ نوێگەرایی لەڕێی ئەو بیردۆزانەی کەهەوڵ دەدەن عەقڵ و زانست و مرۆڤ بەو جێگرەوە ئاژاوەییە نەبووانە لەکار بخەن.

پێدەچێت جێگرەوەی رۆڵی گەیشتن بەوان و رۆڵی وێرانکردن بریتی بێت لەهێنانە ئارای ئومەتێکی ئیسلامی کەرۆڵی ڕاستکردنەوەو ڕاستی پێکان و ڕێنوێنی و پێشکەشکردنی تێڕوانینێکی نوێی بۆ جیهان هەبێت، تێڕوانینێک کەشارستانییەتی مرۆیی هاوچەرخ لێی بێبەش بووە، تێڕوانینێک کەبەشدار بێت لەرزگارکردنی مرۆڤی هاوچەرخ لەو جۆرەها نەهامەتیانەی کەتێیدا دەژین و دەربازکردنی شارستانییەتی هاوچەرخ لەو چارەنووسەی کەلەوانەیە بەوە کۆتایی بێت، تێڕاوانینێک کەلەسەر یەکتر تەواوکردنی مەعریفی و ڕەوشتی و هاوسەنگی مادی و رۆحی بێت، تێڕاوانینێک بێت بۆجیهان ئەو رۆڵە وێرانکەرە ڕوون بکاتەوە کەدامەزراوە ئابووری و بازرگانی و داراییەکان و ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان و وڵاتانی زلهێزی فەرمانڕەوای چارەنووسی جیهانی ئەمڕۆ هێناویانەتە ئاراوە. ئەم بابەتە سەرلەنوێ لایەنی رۆشنبیری لەشارستانییەتی هاوچەرخدا بونیات دەنێتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا مرۆڤی هاوچەرخ بێبەش ناکات لەبەردەوامبوون لەچێژ وەرگرتن لەزۆرینەی دەستکەوتە مادی و شارستانییەکانی شارستانییەتی هاوچەرخ بەشێوەیەکی پێگەیشتوو و دانایانەو تێگەیشتووانە.

بابەتەکە لێرەدا ململانێی نێوان جیهانی شتەکان وجیهانی بیرۆکەکان نییە، چونکە تێڕوانینی جیهانی ئیسلامی هیچ لەپایەی جیهانی شتەکان کەم ناکاتەوە و دژایەتیشی ناکات، بەڵام ڕێگە نادات ستەم لەژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگا بکرێت و هیچ حسابێکیان نەکات بۆ جیهانی بەها و بیرۆکەکان کەبەشدارن لەبەدیهێنانی بڕی پێویستی هاوسەنگی، کەمرۆڤ تێیدا توانا و وزەکانی لەبەرهەمهێنان و بونیاتنان و بەدیهێنانی ژیانێکی ڕێزدارانە کەتێیدا بەهەمان شێوە خواستەکانی بەختەوەری دەروونی تاک و پەیوەندییەکانی یەکتر ناسین و هاریکاری و یەکتر تەواوکردن لەنێوان تاکەکان و کۆمەڵەکاندا.

ئەگەر زۆرینەی گەلان لەجیهانی هاوچەرخدا لەتاریکی وتەنگی دەروونی ومادیدا دەژین، لەڕێی ڕۆشنبیری ڕکابەر و پێشبڕکێکار و قۆستنەوەو قۆرغکارییەوە، ئەوا ڕۆڵی ئومەتی ئیسلامی بریتی دەبێت لەچەسپاندنی ڕۆشنبیری یەکترناسین و هاریکاری و یەکدی تەواوکردن و دەستبار بۆ یەکگرتن لەنێوان مرۆڤەکاندا.

ئومەتی ئیسلامی سووریش بێت لەسەر ئەوەی کەئەو چەقەی کۆمەڵگای مرۆیی لەدەوری بونیات دەنرێت لەدونیادا تاکەکانی بەختەوەر بکات، حسابی ڕۆژی قیامەتیشیان بۆ خوای گەورە لێ بگەڕێت.

ئومەتی ئیسلامیش لەتوانایدا نییە ئەم ڕۆڵە بەجێ بهێنێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی دوو کاری گرنگ: یەکەمیان لەکۆمەڵگاکانماندا نموونەی پێکهێنەری شارستانی تەواوەمەندو هاوسەنگی ویستراو بونیات بنێت، تا خەڵکی حەقیقەتی ئەوەی بانگەوازی بۆ دەکەن ببینێت. دووەمیشیان کەرۆڵی وتوێژو پەیوەندی و هاریکاری لەبەرژەوەندییە هاوبەشەکان بگرێتە ئەستۆی و وەربگرێت و ببەخشێت، فێربکات وفێر ببێت، پشتی پێ ببەستن و پشتیان پێ ببەستێت. لەوانەیە بەوە بتوانێت تێگەیشتنێکی نوێ بۆ شارستانیەت و ئاوەدانکاری بونیات بنێت.

**پێنجەم: ئاوەدانکاری و سیاسەت و دەوڵەت:**

لەخاڵی پێشوودا پەیوەندی نێوان ئاوەدانکاری و شارستانییەتمان خستە ڕوو لەمبارەیەشەوە بیروبۆچوونەکانی ئیبن خەلدوونمان سەبارەت بەپەیوەندی نێوان هەردوو چەمکەکە نیشاندا. پاشان ئاماژەمان بۆ واتای هاوچەرخی زاراوەکە بەهەردوو ڕەهەندی مادی ومەعنەوەییەوە کرد. لەم خاڵەشدا ئەوە ڕوون دەکەینەوە کەچۆن ئاوەدانکاری بەهایەکی مەرجەعییە لەدیاریکردنی سروشتی دەوڵەت و سیاسەتە ئابووری و کۆمەڵایەتی و یاساییەکانیدا. چونکە ئاوەدانکاری بەبێ کۆمەڵگایەکی مرۆیی ڕێکخراو لەشێوەی دەوڵەتێکی خاوەن پایەو پێکهێنەرەکانیدا نەبێت نایەتە دی، دەوڵەتیش بەبێ سیاسەتێک کەکاروبارەکانی ڕێک بخات دروست نابێت. هەوڵ دەدەین لەبەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانی ئیبن خەلدوون و ئیبن ئەزرەقدا پەیوەندی ئاوەدانکاری بەدەوڵەتەوە روون بکەینەوە، چونکە بۆچوونەکانیان پەیوەندییەکی بەتینی هەیە بەتایبەت بەو ڕەوشەی کەجیهانی ئیسلامی هاوچەرخی تێدا دەژی.

ئیبن ئەزرەق وای دەبینێت کە: "ئاوەدانکاری مرۆیی هەر دەبێت سیاسەتێک هەبێت کاروبارەکانی خۆی پێ ڕێک بخات"[1].

واتای سیاسەت –لەزاراوەی ئیبن ئەزرەق و پێش ئەویش لای ئیبن خەلدوون– کاری ڕێکخستن و کارگێڕی ونەخشەدانان تێدەپەڕێنێت و دەبێتە زاراوەیەک کە گوزارشت لەسیستەمی حوکمڕانی دەوڵەت دەکات، لەبەر ئەوە دەبینین ئیبن خەلدوون و ئیبن ئەزرەق بەچەمکی سیاسی هاوچەرخ باس لەدەوڵەت و پادشا وەک سەری دەوڵەت و لەسیاسەت وەک چەمکی سیستەمی پەیڕەوکراو لەبەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا دەکەن و ئیبن خەلدوون ناونیشانەکانی چەندین بەشی کتێبی (المقدمة)ی تەرخان کردووە بۆ دەوڵەت و پادشا. وەک: "أن للدولة أعمار طبيعية كما للأشخاص" واتە: (دەوڵەتیش وەک مرۆڤەکان تەمەنێکی سروشتییان هەیە"، بەشێکی تر بەناوی: "انتقال الدولة إلى الحضارة" واتە: (گوێزرانەوەی دەوڵەت لەبیابان نشینییەوە بۆ شارستانییەت "،

[1] ابن الأزرق، أبو عبدالله محمد الأندلسي. بدائع السلك في طبائع الملك، دراسة وتحقيق: محمد بن عبدالكريم، تونس: الدار العربية للكتاب، (د.ت)، ج١، ص١١٦.

بەشێکی دیکەش بەناوی:"أطوار الدولة واختلاف أحوالها وخلق أهلها باختلاف الأطوار" واتە: (دەورانی دەوڵەت وجیاوازی ڕەوشەکانی و ئاکاری خەڵکەکەی بەپێی جیاوازی دەورەکان)، بەشێکیش بەناوی: "أن الملك والدولة العامة إنما يحصلان بالقبيل والعصبية" واتە: (دەسەڵات و دەوڵەتی گشتی بە هۆز و دەمارگیریی بەدی دێن)، بەشێکیش بەناوی: "حقيقة الملك وأصنافه" واتە: (حەقیقەتی پاشایەتی و جۆرەکانی)، بەشکێش بەناوی: "أن من طبيعة الملك الانفراد بالمجد" واتە: (لە سروشتی دەسەڵات ئەوەیە کەسەروەرییەکان تەنها بۆ یەک کەسن" و... هتد.

لەڕاستیدا دەوڵەت گوزارشتە لەسیستەمی گشتی بەتوخم و پێکهاتەکانیەوە، کەخۆی لەسەری دەسەڵات واتە فەرمانڕەوادا دەبینێتەوە: خەلیفە بێت یان پادشا یا سەرۆک یاخود سوڵتان و لەسروشتی سیستەمی ئابووری و کۆکردنەوەی سامان و دابەشکردنی و لەڕێکخستنی جووڵەی بەرهەمهێنان و بازرگانی و سیستەمی یاسایی بەرپرسیار لەپاراستنی مافەکانی خەڵک و نەهێشتنی ناکۆکییەکان و سیستەمەکانی دیکەی کۆمەڵگا جگە لەوانەدا دەبینێتەوە، ئەمە وێڕای سنووری ئەو زەوییەی کەهاونیشتمانیانی ئەو دەوڵەتە تێیدا نیشتەجێن، هاونیشتمانەکان خۆشیان.

ئیبن خەلدوون هەڵسەنگاندن بۆ هاوشانی نێوان ئاوەدانکاری و دەوڵەت دەکات و دەڵێت: " لەبەر ئەوە دەوڵەت و دەسەڵات وێنەی خەلیفە و شارستانییەتن، هەموو هاوولاتییان و شوێن و ناوچە و تەواوی کاروبارەکانیان، کەرەسەی دەوڵەتەکەن "[1]، ئیبن ئەزرەقیش ئەم چەمکی هاوشانییەی ئیبن خەلدوونی هێناوەو دەڵێت: "بەڵام دواتر، بەناوبانگترینی ئەوەی بە عەقڵ و بیستن زانراوە، تێیدا مەرجەکانی ڕازیبوون کۆکراوەتەوە وەک بەڵگە بۆ ڕەزامەندی گشتی لەسەری، ئەوەیە کە موڵک شێوەی وێنەی ئاوەدانی و سەقامگیرییەتی، کە سوود و نهێنی پێویستبوونیشی دەگرێتەوە"[2].

پاشان دەڵێت: "دەوڵەت و موڵک بۆ ئاوەدانکاری وەک وێنە بۆ مادە وایە، ئەو شێوەیەیە کە بوون و جۆرەکەی دەپارێزێت، ترازانی یەکێکیان لەویتریان

---

[1] ابن اخلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص٨١٧.

[2] ابن الأزرق، بدائع السلك، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٥٨.

بەپێی ئەوەی لەدانانییدا لەسەری وتراوە مەحاڵە. چونکە دەوڵەت بەبێ ئاوەدانی چاوەڕوان نەکراوە، ئاوەدانیش بەبێ دەوڵەت نابێت، هەروەک پێشتر باسمان کرد. لەو کاتەشدا ناتەواوی یەکێکیان ناتەوای ئەویتریان پێویست دەکات، هەروەک چۆن نەبوونی یەکێکیان کاریگەری هەیە لەسەر نەبوونی ئەویتریان"[1].

ئیبن خەلدوون گرنگییەکی زۆر بەسیستەمی دارایی لەئاوەدانی دەوڵەتدا دەدات و دەڵێت: " داهاتەکانی باج هەر بۆ دەسەڵات خۆی دەگەڕێتەوە، پارەکانیان بەزۆری لە بازاڕ و دوکانەکانەوەن، ئەگەر فەرمانڕەوا بەخشش و سامانەکەی بەسەریاندا باراند، ئەوا بەناویاندا بڵاو دەبێتەوە و دواتر هەر بۆ خۆی دەگەڕێتەوە ، بە باج و خەراج لەوان وەردەگیرێت و بە بەخشین بۆیان دەگێڕێتەوە. هەربۆیە بەگوێرەی حاڵی وڵاتەکە ئاستی خۆشگوزەرانی هاونیشتمانیانی دەبێت، بەگوێرەی خۆشگوزەرانی خەڵکەکە و زۆریشیان سامانی دەوڵەتەکەش زۆر دەبێت، بنەڕەتی هەمووشی ئاوەدانی و زۆرییەکەیەتی. لەمە تێبگە و لەوڵاتان ڕابمێنە دەیبینیت، خوای گەورە حوکم دەکات و کەس لەسەرووی ئەوەوە حوکم ناکات"[2].

ئیبن ئەزرەق پشتیوانی گرنگی سامان لەچارەنووسی ئاوەدانیدا دەکات و ڕوونی دەکاتەوە کەچۆن سامان زیادو کەم دەکات و پەیوەندی ئەوەش بەسروشتی سیستەمی حوکم و سیاسەتەوە چییە. لەبارەی هۆکاری زۆربوونی سامان و بەرزبوونەوەی ئاوەدانییەوە دەڵێت: "هۆکاری زۆربوونی سامان: هەندێ کاروبار هەیە، کەیەکێکیان بنەڕەتی گشتییانە: زۆربوونی ئاوەدانی پارێزراو بە فەرمانڕەواییەکەی دادپەروەرانەیە، وتوویانە: سامان بەخەراجەو خەراجیش بەئاوەدانی و ئاوەدانیش بەدادپەروەری"[3]. پاشان هۆکاری کەمکردنی سامان لەپاش زۆربوونی و داڕووخانی ئاوەدانی ڕوون دەکاتەوەو دەڵێت: "هۆکاری کەمبوونەوەی لەپاش زۆربوونی، بەگشتی دوورکەوتنەوەیە لەدادپەروەری... و ئافاتی سروشتی، یەکێکە لەمانە بەسە بۆ ئەو کەمبوونەوەیە،

[1] ابن الأزرق، بدائع السلک، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٢٢٣.
[2] ابن خلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص٨١٧.
[3] ابن الأزرق، بدائع السلک، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٢١١.

خراپتر ئەوەیە بەیەکەوە کۆببنەوە، ئافاتی یەکەم: زۆربوونی وەزیفە،...، ئافاتی دووەمیش: سەپاندنی سەرانە،...، ئافاتی سێهەمیش: سوڵتان بازرگانی بکات... شاراوە نییە لەکاتی سەلماندنی ئەم کاروبارانەدا کاتێ سوڵتان بازرگانی دەکات دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بەهاووڵاتیانی و خراپببوونی باج و کۆتاییەکەشی بەوێرانبوونی ئاوەدانیی تەواو دەبێت و دەوڵەتیش نامێنێت. پاشان بەڕاشکاوی نەیارێتی لەئەنجامدانی ئەم کارە هاتووە، لەعومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە (خوا لێی ڕازی بێ) بۆ هەندێک لەفەرمانڕەواکانی نووسیووە: بازرگانیکردنی والیەکان کارێکی خراپە و دەبێتە هۆی تیاچوونی هاووڵاتیانیان، لەبەر ئەوە ڕێگە بەخۆت و کاربەدەستانت مەدە ئەو کارە بکەن"[1].

ئیبن خەلدوون بەشێکی تایبەت کردووە بەناونیشانی: "أن التجارة من السلطان مضرة بالرعايا مفسدة للجباية" واتە: (بازرگانیکردنی سوڵتان زیانگەیەنەرە بەهاووڵاتیان و خراپکردنی باجە"، تێیدا دەڵێت: "بزانە کەسوڵتان ماڵ و سامانەکەی گەشە دەکات و دەسمایەکەی دەسوڕێتەوە... جگە لەوە هەر بازرگانی یاخود چاندنێک ئەوا زیانگەیەنەرێکی خێرا دەبێت بەهاووڵاتیانی و خراپەکاری باج و کەمکەرەوەی ئاوەدانی دەبێت "[2].

ئیبن خەلدوون بەڕۆڵی دوروبەری خراپ دەکات کەلەدوروبەری فەرمانڕەکان کۆبوونەتەوە، کەبازرگانییان بۆ دەڕازێننەوە و دەڵێت: حاڵەتەکە بەوە کۆتایی دێت ئەو دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوایانەی لەبازرگانی و جوتیاری لەوڵاتان تێوەگلاون دەچن شتومەک لەو کەسانە دەکڕن کەشتو مەک دێننە وڵاتەوە، بەئارەزووی خۆیان نرخ دەسەپێنن، هەر ئەو کاتە بەکەسانی ژێر دەستی خۆیان بەو نرخەی کەمەبەستیانە دەفرۆشنەوە، ئەمەشیان لەیەکەمیان خراپترە و لەگەندەڵی خەڵکی وخراپکردنی ڕەوشیان خراپترە، فەرمانڕەوا لەمە بەرپرسە، پشکی خۆی لەوە بەر دەکەوێت، تا بەخێرایی پارەو سامان کۆ بکاتەوە، بەتایبەت بەهۆی بازرگانیکردنی دوور لەماندووبوون و باجدان.

ئیبن خەلدوون هەروەها ڕوونی دەکاتەوە کەبازرگان و جوتیارەکان ئەگەر هەستیان کرد ستەمیان لێ دەکرێت و بێ توانان لەئاست رکابەرێتی حکومەت

---

[1] ابن الأزرق، بدائع السلک، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٢١٢-٢١٥.

[2] ابن خلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص٦٩٣.

و دەسـەڵاتداران لـەگۆڕەپانی بازرگـانی و کـاردا، واز لەخسـتنەگەڕی مـاڵ وسـامانیان لەکشـتوکاڵ وبازرگانیـدا دەهێـنن و بـەوەش بـاج کـەم دەکـات و دەوڵـەتیش تووشـی خراپبـوونی ئاوەدانکـاری دەبێت. لەوانەیـە ئەمـە بەسـەر بازرگانی کەرتی گشتییدا جێبەجێ ببێت لـەژیانی هاوچەرخدا، هـەروەها بەسـەر بازرگـانی فـەرمانڕەوا و کاربەدەسـتانی دەسترۆشـتوو لەدەوڵەتدا. لەمبارەیـەوە (على عبدالواحد)ی (محقق)ی کتێبی (المقدمة)ی ئیبن خەلـدوون دەڵێت: " ئـەوەی ئیبن خەلدوون لەمبارەیەوە دەیڵێت لەگەڵ زیانە کەڵەکەبووەکان بەهۆی هاتنە ناوەوەی حکومەت بۆ بازاڕ و وئەنجامدانی کاری بازرگانی یاخود قۆرغکاری بـۆ هەنـدێک لـەپیڕەکان یەکدەگرێتـەوە و ئـەوەش وەک بـاجێکی ناڕاسـتەوخۆیە لەسەر بەکارهێنەران...

ئەمـەش لەگـەڵ ئـەوەی کەهەنـدێک لـەزانایانی ئـابووری سیاسـی دەیڵـێن یەکدەگرێتـەوە. ئیـبن خەلـدوونیش بەهـەمان شـێوەی ئـەوەی کەلـەنوێترین کتێبەکانی ئابووری سیاسیدا دەیبینین لێکیداوەتەوە "[1].

ئیبن ئەزرەق لەئەبی مەنصوری سەعالیبیەوە هێناویەتی: "پادشـا ئەگـەر مـاڵ وسـامانی زۆر بـوو بـەوەی کەلـەهاوڵاتیانی خـۆی وەردەگرێت، ئـەوە وەک ئـەو کەسـە وایـە کـە بەکەرەسـتەی بناغـەی خانووەکـەی خـۆی سـەربانی ماڵەکـەی نۆژەن بکاتەوە"(!)[2].

هـەروەک چـۆن مـاڵ وسـامان و ڕێگـای دەستاودەسـتکردنی لـەئاوەدانی دەوڵەتدا گرنگـە، دادپـەروەریش بەهـەمان شـێوەیە گرنگـە. چونکـە دادپـەروەری بنچینـەی دەسـەڵاتە (العدل اسـاس الملـک) هـەروەک چـۆن لـەو پەنـدە بـاوەدا هاتووە. لەگەڵ ئەمەشدا بـەزۆری نـەبوونی دادپـەروەری لەدەوڵەتدا پەیوەنـدارە بـەماڵ و سـامان و ئـەو کەلوپەلانـەی کەبەدەسـتی خەڵکیەوەیـەو سـتەمکاران

---

[1] ابن خلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، پەراوێزی لێکۆڵەری کتێبەکە، ژمارە ٩١٣. ئەوەش ڕوون دەکاتەوە لەیەکێک لەکتێبەکانیدا، بڕوانە:

- وافي، علي عبدالواحد. الاقتصاد السياسي. القاهرە: المطبعة السلفية، ط٣، ١٩٣٩م، فصل " المنافسة الحرة" ص١٧٦-١٨٢.

[2] ابن الأزرق، بدائع السلک، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٢٢٦.

هەڵدەستن بەدەستبەسەردا گرتنیان. بەمەش ناتـەواوی دەکەوێتـە ئاوەدانییـەوەو دەوڵـەت بـەرەو وێرانکاریی دەچێت. ئیبن خەلـدوون ئـەڵێت: "مەبەسـت ئەوەیـە کەروودانی ناتەواوی لەئاوەدانکاریدا بەهۆی ستەم و دەستدرێژییەوە کارێکەو هەر ڕوودەدات، وەک پێشتر باسمان کرد، ئۆباڵەکەشی لەئەستۆی دەوڵەتدایە. ستەمیش تـەنها بـەوجۆرە نییـە کـەماڵ وسـامان لەدەسـتی خاوەنەکـەی بـەبێ بەرانبەر یاخود بەبێ هۆکار وەربگیرێت، وەک ئەوەی لەناو خەڵکدا باوە، بەڵکو ستەم لەوە گشتگیر ترە، هەرکەس موڵکی کەسێکی تری برد، یاخود لەکارەکەی دووری خسـتەوە، یـا بـەناڕەوا داوای لێکـرد، یـان مـافێکی بەسـەردا سـەپاند کەشـەرع نەیدەسـەپاند، ئـەوا سـتەمی لێکـردووە، چونکـە وەرگرتنـی سـامان بـەناڕەوا سـتەمە، ئەوانـەی ئـەو کـارە ئـەنجام دەدەن سـتەمکارن، ئەوانەشـی ئاگادارینی ستەمکارن، ئەوانەشـی ڕێگری لـەمافی خـەڵکی دەکـەن ستەمکارن و ئەوانەی دەست بەسەر ماڵ وموڵکدا دەگرن ستەمکارن و ئۆباڵی هـەموو ئەوانـە بـەخراپبوونی ئـاوەدانی بەسـەر دەوڵەتـدا دەشـکێتەوە کـەخۆی هۆکاریـەتی، چونکـە لەخەڵکەکـەی لـەهیوا و ئـاوات دوور خسـتووەتەوە. بزانـە کەئەمـەش حیکمـەتی حـەرامکردنی سـتەمە، کـەخوای گـەورە مەبەسـتیەتی، بـەهۆی ئەمـەوە خراپبوونی ئاوەدانی و وێرانبوون دروست دەبێت"[1].

ئیـبن خەلـدوون لەمەسـعودییەوە بەسـەرهاتێکی فارسـەکان دەگێڕێتـەوە کـە مویزانی خاوەن ئایین لای ئەوان، ستایشی (بەهرام)ی پادشـایان دەکـات: " ئـەی پادشا: دەستەڵات بەبێ شـەریعەت و ملکەچبوون و گوێڕایەڵی بۆی و کـارکردن بەگوێرەی فـەرمان ڕێگرییـەکانی سـەروەر نابێت، شـەریعەتیش بـەبێ دەسـەڵات نابێت ، دەسەڵاتیش بەبی پیاوانێک سەروەر نابێت. پیاوانیش بەبێ ماڵ وسـامان هێزیـان نابێـت ، تاگـە ڕێگـاش بـۆ سـامان ومـاڵ ئاوەدانکارییـە، تاکـە ڕێگـای ئاوەدانکـاریش دادپەروەرییـە". ئیـبن خەلـدوون ئـەوەش ڕوون دەکاتـەوە کـە مەبەسـت لـە حیکمـەتی بـەرپاکردنی دادپـەروەری لای خـوای گـەورە و

[1] ابن خلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص٦٩٩.

حەرامکردنی ستەمکاریی ئەو تێکچوون و وێرانکارییەی ئاوەدانییە کەدەیهێنێتە ئارا، هۆشداریش دەدات کە: بەڵگەی ئەمەش لەقورئان وفەرموودەدا زۆرە، زیاترە لەوەی کەیاسای ڕێککاریی و چوارچێوە بۆ دانان (قانون الضبط والحصر) بیگرێتە خۆی"[1].

ئیبن ئەزرەق ئەم وتەیەی ئەرستۆ دەهێنێتەوە: "جیهان باخێکە، پەرژینەکەی دەوڵەتە، دەوڵەتیش دەسەڵاتێکە بەهۆیەوە یاسا دەژی، یاساش سیاسەتە، پادشا بەڕێوەی دەبات. پادشا سیستەمە، سەربازەکان دەیپارێزن، سەربازەکانیش پشتیوانن، ماڵ وسامان دەیانهێڵێتەوە. ماڵ وسامانیش هاونیشتمانیان کۆی دەکەنەوە، هاونیشتمانیانیش بەندەن دادپەروەری لەخۆیان دەگرێت. دادپەروەریش ناسراوە و بەهۆیەوە جیهان باش بەڕێوە دەچێت"[2].

---

[1] ابن خلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص٦٩٨-٧٠٠.

[2] ابن الأزرق، بدائع السلک، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٢٣٢.

## کۆتایی بەش:

ئاوەدانکاری (العمران) زاراوەیەکی قورئانییە و بریتییە لەئاوەدانکردنەوەی زەوی بەژیانی مرۆڤ و ئاوەدانکردنەوەی ژیانی مرۆڤیش بەچاکەو کاری باش و بەرزکردنەوەی هۆکارەکانی ژیان و پێکهێنەرەکانی بەدەستکەوتنی مادی و مەعنەوی ئاوەدانکاری. واتای ئاوەدانکاری (العمران) بەناسینی ئەو واتایەی کەبەرانبەریەتی زیاتر ڕوون دەبێت، کەوەک ژیانە لەبەرانبەر مردندا، چاکسازیی وبونیاتنانە لەبەرانبەر تێکدان و وێرانکاری و خوێنڕێژی و تیاچوون، هەروەها واتای ئاوەدانکاری بەناسینی ئەو بنچینەیەی کەلێی دەبێتەوە زیاتر ڕوون دەبێت، چونکە ئیمان –بەعەقڵ و دڵ و بەڕێوەچوونی ژیان لەسەر بناغەی ڕێنوێنی بەکرداو جێبەجێکردن- بنەڕەتە و ئاوەدانکاریش ئەنجامەکەی نیعمەتی دونیایی و قیامەتییە: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُواْ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمۚ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾﴾ {المائدة: ٦٥-٦٦}، واتە: (خۆ ئەگەر بەڕاستی خاوەن پەیامە ئاسمانییەکان (ئەهلی کتاب لەگاور و جوولەکەکان) باوەڕیان بهێنیایە و خۆیان بپاراستایە و پارێزکار و لەخواترس بوونایە، بێگومان گوناهـ و خراپەکانیانمان دەسڕیەوە لێیان و دەمانخستنە ناو بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت، بێگومان ئەگەر ئەوانە تەوارت و ئینجیلیان کار پێ بکردایە، هەروەها ئەو (قورئان)ەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، بێگومان ڕۆزییان لەلای سەر (لەئاسمانەوە)و لەژێر پێیانەوە (لەزەویەوە) دەرخوارد دەدرا، هەیانە دەستەو کۆمەڵێکی ڕیکوپێکە، بەڵام زۆرێک لەوان ئەوەی دەیکەن زۆر بەدو خراپە)، ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾﴾ {الاعراف: ٩٦}، واتە: (ئەگەر دانیشتوانی شارو گوندەکان باوەریان بهێنایەو خۆیان بپاراستایە، بەڕاستی دەرگای بەرەکاتی ئاسمان و زەویمان بۆ دەکردنەوە، بەڵام بڕوایان

نـەهێنا، ئـەمجا ئێمـە ئـەوانمان گـرت و بـەهۆی ئـەو خراپانـەوەی دەیـان کـرد سزاماندان).

بۆمـــان ڕوون بوویـــەوە کـــەئاوەدانکاری حاڵـــەتێکی دەســـتکەوتی مـــادی ومەعنەوییـەوە هاوشـانی ئاسـتی ژیانـە لەکۆمـەڵگا مرۆییەکانـدا بەچاوپۆشـی لەئاســتی شارنشــینیان، یــاخود دەســتکەوتی شارســتانیان. ئــەو حاڵەتــەی دواکەوتوویش کە ئومـەتی ئیسلامی لەئـەمڕۆدا بەدەستیەوە دەناڵێنێ لەسـەری پێویسـت دەکـات کەئـەو تێڕوانینـە پێشکەشـی شارستانییەتی مرۆڤایـەتی بکـات کەپێویستییەتی و دەستکەوتی ئاوەدانی و شارستانی مادی ڕێنوێنی دەکات و لەبەدیهێنانی مەبەستەکانی جینشینێتی مـرۆڤ لەسـەر زەویـدا بـەکاری دێنیت و لـــەئیبن خەلـــدوون و ئیـــبن ئەزراقیشـــەوە چەنـــد بۆچـــوونێکی پەیوەنـــدار بەپەیوەنـدی ئاوەدانکـاری و سیاسـەت و دەوڵـەتمان هێنایـەوە، کە وام لێدەکات لەشێوەکانی ستەم کەدەبنە هۆی داڕوخانی سیستەمەکانی حوکمڕانی تێبگەین، وەک ئەوەی لەسەرەتای ساڵی (٢٠١١ز)ەوە بەچاوی خۆمان دەیبینین.

جەختکردنەوەی قورئانی پیرۆزیش لـەوەی کە ئاوەدانکـاری – وەک ئـەنجام و سـوودێکی مـادیی- لەوانەیـە دەروازەیـەک بێـت بـۆ هەنـدێک لـەو کەسـانەی کەخوازیاری ئەو ئەنجامەن. خۆ ئەگەر ڕوانینی عەقڵی و شیکردنەوەی لۆژیکی دوو دەروازەی باوەڕهێنـــان بـــن لای هەنـــدێک لـــەباوەڕداران، ئـــەوا بـــەڵێنی بەرەکەتـەکانی ئاسـمان و زەوی بـەزۆربوونی سـەرچاوەکـانی ڕزق و ڕۆزی و ئاسـانکردنیان، لەوانەیـە سـەرنجڕاکێش بن بۆ هەندێکی تـر هـەتا بێنـە بازنـەی ئیمانەوە، ئەگـەر هـات دڵئارام و تـەواو دڵنیـابوون ئـەنجامێکی دیکـەی شـیرینی ئیمـان دەبێـت لـەدڵ و دەروونـدا. ئێمـە ئـەوەش دەبینـین کـەقورئانی پیـرۆز گوتارەکانی بۆ خـەڵکی جۆراو جۆر دەکات، وەک سۆزو بـەزیی و هـۆگریی پێیـان و بـەو ئومێدەی کـە هـەمووان سـوود مەنـد بـن، چونکـە لـەنێو خەڵکیـدا دەسـتەو گرووپـی وا هەیـە ئـەم جـۆرە بانگەشـەیە لەگوتارەکانیـدا دەکـات [1]، بەمـەش هەنـدێکیان سـوود لـەگوتاری عـەقڵی موجـەڕەد وەردەگرێت، هەنـدێکی

[1] النجار، عبدالمجيد دور الاصلاح العقدي في النهضة الاسلامية، أسلامية المعرفة، ، ع١٩٩٥،١م، ص٥٧-٩٤.

دیکـەش سـوود لـەگوتاری ویژدانـی و سـۆز وەردەگرێـت ، هەنـدێکی تـریش لەگوتاری هەستە مادی و سوودە کردارییەکان وەردەگرێت.

ئاوەدانکـاری مرۆیـی لەگـەڵ یەکخواناسـی و تەزکییـەی ژیـانی مـرۆڤ وپاکژکردنـەوەو بەرزکردنـەوەی لەسـەر ئاسـتی تـاک و کۆمـەڵ و نەتـەوەکان، ئەمانە پێکەوە ڕشتەبەندێکی بەهایی پێکدەهێنن کەئومەتەکەمان پێویست پێیەتی وەک سـەرچاوەیەک بـۆ تـەواوی بـەها سـەرەکی و لاوەکیـەکان پشـتی پـێ ببەستێ، ڕامان لەم ڕشتەبەندی بەهاییە پێویستی بەتوێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە کەتێگەیشتنمان بۆی قوڵتر بکات و لەدەرهێنانی ڕەشتەبەندی بەها لاوەکیەکاندا بیخەینە گەڕ و گواستنەوەیان لەبواری بانگەشەو ئامۆژگاریی و زانستە شەرعیەکانەوە بۆ بواری دامەزراندنی زانستە مرۆیی و کۆمەلایەتی و گەردوونییـەکان و جێبـەجێکردنی ئـەو زانسـتانە لەگەشـەپێدانی کۆمـەڵگا موسڵمانەکاندا، تا ئەم کۆمەڵگایانە ببنە رۆشنایی ڕێنماییکار بۆ کۆمەڵگاکانی دیکەی جیهان.

لێرەدا هێندە بەسە کەئاماژە بۆ ئەوە بکەین ئاوەدانکاری وەک بەهایەکی بالا بەشـدار دەبێـت لـەدیاریکردنی چوارچێـوەی سـەرەکی مەنهەجیـەتی ئیسـلام لەبیرکردنـەوە و لێکۆڵینـەوەو ڕەفتـاردا، لەسـەر ئـەم بنچینەیـەش دەرهێنـانی کۆمـەڵێک بنـەمای تیـۆری و کرداریـی ئاسـان دەبێـت کەدەبنـە ڕێنمایکـاری هەوڵـەکانی عـەقڵی سـاغ و دروسـت لەجێبـەجێکردنی ئـەم مەنهەجیەتـەدا، لـەو بنەمایانەش وەک نمونە: بنەمای تـەواوکاری داخوازییـەکانی ژیـانی کۆمەلایـەتی: زانستەکانی وەحی و زانستە مرۆییـەکان و زانستە سروشـتییەکان و زانستە تەکنەلۆژییەکان و بنەمای تەواوکاریی سوودوەرگرتن و گوێگرتن.

# کۆتایی

بەمجۆرە دەبینین کەیەکخواناسی بەهایەکی پێوانەکاری باڵایە، لەبنەڕەتەوە تایبەتە بەتێڕاوانینی ئیسلامی بۆ خودای بەدیهێنەرو کارڕێکخەر و بیروباوەڕە مرۆییەکانی و دەرئەنجامی ئەو بیروباوەڕانە و لێکەوتەکانیشی لەفیکری مرۆڤ و ژیانیدا پێ تەواو دەبێت، تەزکییەش بەهایەکی پێوانەکاری باڵایەو تایبەتە بەتێڕوانینی ئیسلام بۆ مرۆڤی دروستکراوی جێنشین و بەهۆیەوە ڕەفتاری مرۆڤ و هەوڵەکانی بەرزبوونەوەی لەپلەکانی تەزکییەی جەستەو عەقڵ و دڵی لەڕەفتارو هەڵسوکەوت و ماڵ و موڵکی و لەڕشتەبەند و پەیوەندییەکانی ژیانی تاک و کۆمەڵگای پێ هەڵدەسەنگێنرێت و ئاوەدانکاریش بەهایەکی پێوانەکاری باڵایەو تایبەتە بەتێڕوانینی ئیسلامی بۆ ئەرکی مرۆڤ لەو گەردوونەی جێنشینە تێیدا و بەهۆیەوە "بەهای" ژیانی تاکی مرۆڤ یاخود تەمەنی کۆمەڵ یاخود ئومەت و تەواوی هەوڵ و دەستکەوتە شارستانییە (ئاوەدانکارییە)کانی تاک یاخود کۆمەڵ یان ئومەت دەپێورێت.

تاڕادەیەکیش قسەکردن سەبارەت بەیەکخواناسی و تەزکییە و ئاوەدانکاری بەرفراوانتر کراوە، ئەمەش بۆ جەختکردنەوە لەسەر چارەسەری بەهایی لەقسەکردن لەسەر ئەم سێ بەها قورئانییە مەرکەزییە هێنامان. لەگەڵ ئەوەشدا تەنها چەند ئاماژەیەکی سنووردارمان بۆ چارەسەری بیروباوەڕی "کەلامی" لەحاڵەتی یەکخواناسی، یاخود عیرفانی "سۆفی" لەحاڵەتی تەزکییەدا، یاخود شارستانی "شارستانیەت" لەحاڵەتی ئاوەدانکاریدا هێنا. مەبەستمان لەم ئاماژە سنووردارانە کەمکردنەوە نییە لەبەهای ئەم چارەسەرانە و لەپێگەی گونجاوی هەریەکەیان، بەڵکو ئێمە چەندینجار جەختمان کردووەتەوە کەئەو سێ بەهایە بەهای باڵان، لەهەریەکەیان چەندین بەهای ناسەرەکی دەبێتەوە، کەدرەوشانەوەی خۆیان هەیە لەبوارەکانی فێرکردن و مەعریفەو لایەنەکانی ڕەفتار و جێبەجێکردن و گۆڕەپانەکانی بونیاتنانی ژیان و ڕێگەکانی پەرەپێدانیدا.




جارێکی دیکەش جەخت دەکەینەوە کەئەم سێ بەهایە پەیوەندییەکی بەتینیان بەیەکەوە هەیە، چونکە یەکخواناسی حەقیقەتە هەر مەزنەکەی ئەم بوونەیە، ئەم حەقیقەتەش بەهاکەی لەخۆیەوە وەردەگرێت و حەقیقەتەکانی تریش لەم دەکەونەوە. گەردوونیش هەمووی بەفیترەت ملکەچە بۆ پێویستیەکانی یەکخوداناسی، ئەگەر مرۆڤ ویستی کەلەگەڵ فیترەتی گەردووندا بگونجێت، ئەوا پێویستی بەوەیە خۆی پاکژ بکاتەوە، دەروونی بسازێنێت، ڕوو بکاتە خوای باڵادەست و بیپەرستێ، چونکە هەر ئەو خودای خەڵکە "الە الناس" (یەکخوداپەرستی- توحید العبودیة)، هەروەک چۆن پەروەردگاری خەڵکە "رب الناس" (توحید الربوبیة) و پادشایی خەڵکە "ملک الناس" (توحید الحاکمیة)، چونکە تەزکییە بابەتەکەی مرۆڤی جێنشینکراوە، هەر ئەویش بابەتی چاکسازییە لەواقعی مرۆییدا، بەگوێرەی ئەو ڕێنماییەی کەخودای بەدیهێنەر لەچاودێری دروستکراوەکانی و بەڕێوەبردنی کاروباریاندا

ڕێنمایی کردووە. لەبەر ئەوە تەزکییە ئامانجی ئاوەدانکاری و هۆکاریشیەتی و لەجەرگەی بونیاتی کۆمەڵایەتی و ئاوەدانکاری مرۆییدایە.

ئەم سێ بەها باڵایەش پێکەوە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی حەق لەبەدیهێنان و ڕشتەبەندی پێوەرکاریی ئەو بەهایانەی کەتەواوی بەها سەرەکی و لاوەکیەکانی لەئاینی خوادا لێدەکەوێتەوە مەرجەعیەتێکی مەقاصیدی پێکدەهێنن، بەڵام ئەم ڕشتەبەندە بەهاییە لەهەمان کاتدا گوزارشتکارە لەحەقیقەتی کاروبارو ڕووداوەکان، نەک شتێک بێت لەدەرەوەیان یاخود سەپێنرابێت بەسەریاندا.

لەجێگایەکی دیکەدا ئەوەمان ڕوون کردووەتەوە[١] کەچۆن یەکخواناسی و تەزکییە و ئاوەدانکاری بریتین لەبەهای مەنهەجی باڵا و کاری مەنهەجی لەم سێ بوارەدا ڕێنوێنی دەکەن: بیرکرنەوەو گەڕان و ڕەفتار.

گوتوومانە ئەوەی کەپەیوەندی نێوان بەها باڵا (زاڵ)ەکان وکاری مەنهەجی ڕێکدەخات بریتییە لە:

یەکەم: کارپێکردنی ڕشتەبەندی ئەم بەهایانە وەک بنەمایەکی گشتی لەبنەماکانی مەنهەجی ئیسلامی وایە.

دووەم: ئەم بەهایانە پێوەرو ڕێکخەری زاڵن بۆ هەموو بنەما مەنهەجیەکانی تر، ئیدی لەئاستە فیکرییە تیۆریی و بیروباوەڕییە گشتییەکانیاندا بێت، یاخود لەئاستە زانستییە ئیجرائیەکانی بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەو ڕەفتاردا.

سێهەم: ئەم پەیوەندییە سوودی هەیە لەفراوانکردنی بازنەی کارکردن لەوەی بەئەخلاقیاتی مەنهەجی زانستی لێکۆڵینەوە ناسراوە، پەیوەستکردنیشی بەئامانجەکانی مەنهجیەتی ئیسلامی گشتی و هۆکارەکانییەوە.

لەوانەیە لەڕووەکانی توێژینەوە سەبارەت بەبەها، ڕامان بێت لەبەهای کۆتایی کەنووسەر یاخود تویژەر لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا دەینووسێت، چونکە ئەوە لەگرنگترین توخمەکانی دەرئەنجامی کۆتاییە کەبەهای زیاتر لەوانی دیکەی پێدەدات، کەتوێژەر کردوونیەتە پێشەکی بۆ توێژینەوەو نووسینەکانی تری، ئاماژە دەریش دەبێت بۆ ئەو پرسانەی کەنەیتوانیووە

---

[١] ملكاوي، فتحي حسن. منهجية التكامل المعرفي، هيرندن: المعهد العالمي للفكر الاسلامي ، ٢٠١١م، ص٢٥٠.

حەقی خۆیان پێ بدات، ئیدی چۆن مرۆڤ بتوانێت کۆتای بەقسەو لێکۆڵینەوەی بهێنێت لەهەر کاروبارێک لەکاروبارەکاندا؟! لەبەر ئەوە پێویست بەدرێژە پێدان لەو جۆرە توێژینەوەیە دەکات، ئەویش بەروونکردنەوەی چۆنیەتی هێنانی ئەو بەهایانەی کەلەڕشتەبەندی ئەم سێ بەها بالآیە دەکەوێتەوەو چۆنیەتی درێژە پێدان و پەیوەستی نێوان هەر بەهایەکیان و ئەو بەها لاوەکیانەی لێی دەکەوێتەوە. لەوبابەتانەشی کەدەکرێت بخرێنە بەر باس، ئەزموونکردنی تاچەند بەها بالآکان لەبەدەمەوەچوونی داخوازییەکانی پێکهێنەری بەهایی هەوڵەکانی هەستانەوەی شارستانیی ئیسلامیدا بەسن ، هەروەها خستنەرووی بەسبوونیان لەبونیاتنانی پێکهێنەری بەهایی پێویست بۆ ڕێنمونی شارستانی مرۆیی هاوچەرخ و رزگارکردنی لەو چارەنووسەی کەهەڕەشەیە بۆسەریان ئەگەرهاتوو ئەم پێکهێنەرە بەهاییە لەبونیاتی مادی ومەعنەویدا بوونی نەبوو.

ماوەتەوە ئەوەی جەخت لەوە بکەینەوە کەلەپێشەکی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێدا کەدەروازەی توێژینەوە لەڕشتەبەندی بەها بالآکان بۆ زیاتر خستنەڕوو روونکردنەوەو پێداچوونەوە وتێگەیشتن بەکراوەیی دەمێنێتەوە.

لەوانە وەک پێویستی ئەم جۆرە چارەسازییانە بەدارِشتنەوەی هەڵوێستە کردارییەکان و پێویستی پێشکەشکردنی نموونەی کرداری، کەئەرکی پەروەردەیی بەجێ بگەیەنێت و خزمەت بەمەبەستی فێرکاری بکات.

بەڵکو خوای گەورە توێژەرانێک برەخسێنێت کەهەوڵبدەن شتێک لەم ڕوونکردنەوە تەواو بکەن.

مەبەستی ئەم ڕێگایە بۆ خودایەو درود سڵاو لەسەر پێغەمبەرمان (درودی خوای لەسەر بێ) و لەهاوەڵانی هەموویان و سوپاس و ستایش بۆ خودای جیهانیان.

# سەرچاوەکان


١- ابن الأزرق، أبو عبدالله محمد الأندلسي. بدائع السلك في طبائع الملك. دراسة وتحقيق: محمد بن عبد الكريم، تونس: الدار العربية للكتاب، (د.ت.).

٢- ابن حنبل، أحمد. مسند الإمام أحمد بن حنبل. تحقيق: شعيب الأرنؤوط،١٩٩٩ م، وعادل مرشد وسعيد اللحام، بيروت: مؤسسة الرسالة، ط ١.

٣- ابن خلدون، عبد الرحمن. مقدمة ابن خلدون. تحقيق: علي عبد الواحدوافي، لقاهرة: مكتبة نهضة مصر، (د. ت.).

٤- ابن عاشور، محمد الطاهر. التحرير والتنوير. تونس: دار سحنون للنشر والتوزيع، ١٩٩٧م.

٥- ابن عاشور، محمد الطاهر. تفسير التحرير والتنوير. تونس: الدار التونسية للنشر، ١٩٨٤ م.

٦- ابن قيم الجوزية، محمد بن أبي بكر. مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد، وإياك نستعين. بيروت: دار الكتاب اللبناني،١٩٧٣ م.

٧- الأصفهاني، الراغب. معجم ألفاظ القرآن الكريم. تحقيق: إبراهيم شمس الدين، بيروت: دار الكتب العلمية، ١٩٩٧م.

٨- الأصفهاني، الراغب. مفردات ألفاظ القرآن الكريم. تحقيق: صفوان داوودي، دمشق: دار القلم، بيروت: الدار الشامية، ٢٠٠٩م.

٩- الإيجي، عضد الدين عبد الرحمن بن أحمد. المواقف في علم الكلام. القاهرة: مكتبة المتنبي، (د. ت.).

١٠- باشا، أحمد فؤاد وآخرون. المنهجية الإسلامية. القاهرة: المعهد العالمي للفكر الإسلامي ودار السلام، ٢٠١٠م.

١١- البخاري، الإمام محمد بن إسماعيل. صحيح البخاري. دمشق: دار ابن كثير، ط ١، ٢٠٠١ م .

١٢- البخاري، محمد بن اسماعيل. الجامع الصحيح. بيروت: دار طوق النجاة، ١٤٢٢ هـ ، ط ١.

١٣- بن أنس، مالك. موطأ الإمام مالك. تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، القاهرة: مصطفى البابي الحلبي، ١٩٨٥م.

١٤- بن حنبل، الإمام أحمد. مسند أحمد بن حنبل، الرياض: دار الأفكار،١٩٩٤م.

١٥- بن حنبل، الإمام أحمد. مسند الإمام أحمد بن حنبل. تحقيق: شعيب الأرنؤوط وآخرون، بيروت: مؤسسة الرسالة، ٢٠٠١م.
١٦- بن عبد الوهاب، محمد. كتاب التوحيد الذي هو حق الله على العبيد. صححه وقابله على النسخة الخطية٤٦٥/ ٨٦ بالمكتبة السعودية: كل من عبد العزيز السعيد، وأحمد كحيل، ولبيب السعيد، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، (د.ت.).
١٧- بن نبي، مالك. شروط النهضة. ترجمة: عبد الصبور شاهين وعمر كامل مسقاوي، دمشق: دار الفكر، ١٩٧٩م.
١٨- البنا، حسن. رسالة العقائد. عناية: ماجد الدرويش، طرابلس، لبنان: دار مكتبة الإيمان، ٢٠٠١م.
١٩- الدارمي، عبد الله بن عبد الرحمن. مسند الدارمي، المعروف بسنن الدارمي. تحقيق: حسين سليم الداراني، الرياض: دار المغني، ١٤٢٠هـ
٢٠- الرازي، فخر الدين. التفسير الكبير. بيروت: دار إحياء التراث العربي، ط٤، ٢٠٠١م.
٢١- الرازي، فخر الدين: "المطالب العالية من العلم الإلهي وهو المسمى في لسان اليونانيين « باثولوجيا » وفي لسان المسلمين « علم الكلام » أو«الإسلامية الفلسفة»، تحقيق: أحمد حجازي السقا، بيروت: دار الكتاب العربي، ط١، ١٩٨٧ م.
٢٢- الطبراني، أبو القاسم سليمان بن أحمد بن أيوب. معجم الطبراني الأوسط. تحقيق: طارق بن عوض الله وعبد المحسن الحسيني، القاهرة: دارالحرمين، ١٤١٥ هـ
٢٣- عبده، محمد. رسالة التوحيد. تحقيق: محمد عماره، القاهرة: دار الشروق،١٩٩٤م.
٢٤- العسقلاني، أحمد بن علي بن حجر. فتح الباري شرح صحيح البخاري. القاهرة: دار الريان للتراث، ١٩٨٦ م.
٢٥- العقاد، عباس محمود. الله: كتاب في نشأة العقيدة الإلهية. القاهرة: دارالمعارف، ط ٧، (د. ت.).
٢٦- الغزالي، أبو حامد. الأربعين في أصول الدين. صححه وخرج أحاديثه: عبد الله عبد الحميد عرواني، دمشق: دار القلم، ٢٠٠٣ م.
٢٧- قطب، سيد. في ظلال القرآن. القاهرة: دار الشروق، ١٩٧٩ م. مجلد ٢، ج ٦.
٢٨- الماتريدي، أبو منصور محمد بن محمد بن محمود. كتاب التوحيد. تحقيق: بكر طوبال أوغلي، ومحمد أروشي، بيروت: دار صادر، واستانبول: مكتبة الإرشاد، ط ١،٢٠٠٧ م.

٢٩- المحاسبي، أبو عبد الله الحارث بن أسد. الرعاية لحقوق الله. تحقيق: عبدالقادر أحمد عطا، القاهرة: دار الكتب الحديثة، ١٩٧٠ م.
٣٠- ملكاوي، فتحي حسن. "التزكية في منظومة القيم الحاكمة"، إسلامية المعرفة، ع ٥٧ ، صيف ٢٠٠٩ م، ص ٥-١٢.
٣١- ملكاوي، فتحي حسن. "العمران في منظومة القيم الحاكمة"، إسلامية المعرفة، ع ٥٩ ، خريف ٢٠١٠ م، ص ٥- ٢٤.
٣٢- ملكاوي، فتحي حسن. " ملحوظات حول الدراسات الخلدونية"، إسلامية المعرفة، ع ٥٠ ، خريف ٢٠٠٧م، ص ٧ -١٥.
٣٣- ملكاوي، فتحي حسن. منهجية التكامل المعرفي، هيرندن: المعهد العالمي للفكر الاسلامي، ٢٠١١م.
٣٤- النجار، عبد المجيد. " الإيمان والعمران"، أسلامية المعرفة، ع٨، أبريل ١٩٩٧م. ص٣٩-٨٤.
٣٥- النجار، عبد المجيد. " دور الاصلاح العقدي في النهضة الاسلامية"، أسلامية المعرفه، ع١٩٩٥،١م، ص٥٧-٩٤.
٣٦- النجار، عبد المجيد. " الإيمانبالله وأثره في الحياة"، بيروت: دار الغرب الاسلامي، ط١، ١٩٩٧م.
٣٧- النسابوري، الإمام مسلم بن الحجاج. **صحيح مسلم**، الرياض: بيت الأفكار الدولية، ١٩٩٨ م.
٣٨- النووي، أبو زكريا يحي بن شرف. **شرح النووي على مسلم**. دمشق: دارالخير، ١٩٩٦ م.
٣٩- النووي، يحيى بن شرف الدين. **رياض الصالحين**. القاهرة: دار الريان للتراث، ١٩٨٧ م.
٤٠- النيسابوري، مسلم بن الحجاج القشيري. **صحيح مسلم**، الرياض: بيت الأفكار الدولية، ١٩٩٨ م.
٤١- النيسابوري، مسلم بن الحجاج. **صحيح مسلم**. بيروت: دارابن حزم، ط١، ١٩٩٥ م.
وافي، علي عبد الواحد. **الاقتصاد السياسي**. القاهرة: المطبعة السلفية، ط ٣، ١٩٣٩ م.

## سەرچاوە بیانییەکان:

1- Moreland, J. P., and William Lane Craig. *Philosophical Foundations for a Christian Worldview*. Downers Grove, Ill.: InterVarsity Press,2003.
2- Schwarz, John. The Complete Guide to the Christian Faith. Minneapolis. MN: Bethany House Publishers, 2001.
3- al-Faruqi, Ismail R. Al-Tawhid: Its implications for Thought and *Life*. Herndon, VA. IIIT. Fifth printing, 2000.
4- Tonybee, Arnold. A Study of History: The Growths of Civilizations. New York: Oxford University Press, 1962.